# جیهاد و راماری



# له ئیسلامدا



نووسینی: پێشەوا ئیبن تەیمیە
وەرگێڕانی: م. هەورامان گەچێنەیی

پێشەکی و پێداچوونەی: م. عەلی باپیر



وەرگێران و پوختکردنەوەی بەرگی ( ٢٨ )ی
( مجموعه الفتاوى ) ی شێخی ئیسلام ( إبن تیمیه )یە

چاپی دووەم
١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

# جیهادو ڕامیاری لە ئیسلامدا

نوسینی

پێشەوا ئیبن تەیمیە

وەرگێڕانی

هەورامان گەچێنەیی

پێشەکی و پێداچونەوەی

مامۆستا عەلی باپیر

وەرگێڕان و پوختکردنەوەی بەرگی (۲۸)ی (مجموعة الفتاوی)ی

شێخی ئیسلام —ئیبن تەیمیە-یە.

چاپی دووەم

۱٤۳۱-۲۰۱۰

بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب: جیهادو ڕامیاری له ئیسلامدا.
- بابەت: سیاسەتی شەرعی.
- ناوی نوسەر: شێخی ئیسلام –ئیبن تەیمیە-.
- وەرگێڕی کوردی: مامۆستا هەورامان گەچێنەیی.
- پێشەکیو پێداچونەوە: مامۆستا عەلی باپیر.
- تایپ: شادی جەمال
- نۆرەی چاپ: دووەم.
- تیراژ: ١٥٠٠ دانە.
- چاپخانە: چاپەمەنی سیما – سلێمانی.
- ژمارەی سپاردن: ژمارە (٣٢٧)ی ساڵی ٢٠٠٣ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

(الحمدلله الكبير المتعال والصلاة والسلام على محمد والآل)

## خوێنەرە بەڕێزەکان:

ئەم نوسراوەی بەردەستتان کە بریتییە لە وەرگێڕان و پوختکردنەوەی بەرگی (٢٨) لە (مجموع الفتوى)ی شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەلایەن برای خۆشەویستم کاك مەلا هەورامان گەچێنەییەوە، خوا پاداشتی بداتەوە و زیاتر هیدایەتی بدات، بەرهەمێکی بەرجەستەی نێو کتێبخانە دەبێت و هیوادارم کەلێنێکی چاکی تێدا بگرێ لە بواری شارەزایی شەرعی لە مەڕ جەنگ و جیهاد و سیاسەتی شەرعیەوە.

شایانی باسیشە کە کتێب و بەرهەمەکانی پێشەوا (ئیبن تەیمیە) وەك دەریای قوڵ و شەپۆلاوی وان کە چاك خوێندنەوە و لێتێگەیشتن و هەزم کردنیشیان لە قەرەی هەموو کەسێکدا نیە چ جای وەرگێڕانیان.

بەڵام ئەوە کاك مەلا هەورامان ناوی خوای لێهێناوە و ملی لەو دەریایە ناوە، پێشم وایە هەرچەندە جارێ کاك مەلا هەورامانمان گەنجە بەڵام خوا هیدایەتی داوە و گەوهەری باش باشی لەو دەریا قوڵە دەرهێناون.

دیارە بەندەش چاوم بەم بەرهەمەیدا خشاندوە و لەهەر جێیەك دەستکاری وشە و ڕستەیەکم بەپێویست زانیبێت ئاوم لێ نەخواردوەتەوە، هەرچەندە هەندێك وردە سەرنج و تێبینی دیکەشم هەر ماون بەتایبەت لەسەر تەفسیر و تەرجەمەی ئایەت و فەرمودەکان، بەڵام تەنها دەستکاری ئەو شوێنانەم کردووە کە بە پێویستم زانیوە دەستکاری بکرێن، خوا بە لوتفی خۆی تەوفیق و هیدایەتی برای شیرینم مامۆستا هەورامان بدات بۆ پێشکەشکردنی بەرهەمی چاکتر و بەهێز و پێزتریش و لەسەر زەحمەتێك کە بەم بەرهەمەشیەوە کێشاویەتی چاکترین پاداشتی بداتەوە.

والسلام عليكم

عەلی باپیر

١٥ی ذي الحجة ١٤٢٢

٢٠٠٢/٢/٢٧ ئەحمەد ئاوا

**پێشکەش بێت:**

بەو موسڵمانە مەردو ڕەندانەی: کە لە سۆنگەی بیرکردنەوەو ڕامانەوە لەنازو نیعمەتە بەرفراوانەکانی پەروەردگارەوە فەزڵو سۆزی خوای میهرەبانیان بۆ دەردەکەوێو دەرئەنجام لەبەرامبەر ئەوەدا دەبنە (عابیدێك)ی (صالْح)و، لەبەرامبەر ئەو (عابید) بوونو (صالْح) بوونەشیاندا پەروەردگار خۆشی دەوێنو ئەوانیش بەپەرێزی خۆیان جوامێرانە دەری دەخەن کە خوایان پتر لە هەر شتێکی تر خۆش دەوێو، هەتا بڵێی لە ئاقار موسڵماناندا –لە سنوری شەرعدا– زەلیلو خۆ بەکەم گرنو، لەبەرامبەر دوژمنانی دینیشدا چنگ بە خوێنو فیداکارو دڵ ڕەقو بەدەمارو خاوەن عیززەتن،و جیهاد بەلوتکەی هەرە بەرزی ئیسلام دەزاننو، لەو کاروانەشدا بوێرانە چەکی شەرەفو مەردایەتی لەشان دەنێنو، لە مەیدانی جیهادیشدا موو بە موو شوێن پێی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) هەڵدەگرنو لە ئاقار ڕووداوە جۆربەجۆرو پرکەندو کۆسپو دژوارەکانی جەنگدا موسڵمانانە هەڵوێستی شەرعی دەنوێننو، تینو فشاری هیچ کەسێ – چ دەرەکیو چ ناوەکی – نایان لەخشێنێو لە لۆمەی لۆمەکاران سڵ ناکەنو، دەرئەنجام پلەی (صالْح) بوون بەدەست دەخەنو زەوی خوا بە میرات دەگرن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِي الصَّالِحُونَ (الأنبياء:١٠٥).

# پێشەکی چاپی یەکەم

ئەگەر فەزڵو میهرەبانی خوا نەبێت... خۆم زۆر لەوە بەکەمتر دەزانم کە دەست بدەمە کتێبێکی شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە)و بیخوێنمەوە، چ جای ئەوەی جورئەت بکەمو بوێرم کتێبەکەشی وەربگێڕم!!.

سوپاس بۆ خوای گەورەو لێی بەزیاد بێت، دانانو وەرگێڕانی کتێبە ئیسلامییەکان لەپەرەسەندندایەو ڕۆژ بە ڕۆژ کتێبخانەکان بەرەو پڕبوون دەچن، بەڵام بە داخەوە، سەبارەت بە (جیهادو سیاسەتی شەرعی) بەدەگمەن هەست پێدەکەم بەکوردی دانرێو وەربگێڕدرێت!!

بۆیە پێم وایە لە کتێبخانەی کوردی ئیسلامیماندا ئەوە بۆشایی یەکەو پێویستە بەرەنجی دڵسۆزانی ئیسلام پڕبکرێتەوەو چیتر هەستی پێنەکرێت.

جا منیش بۆ ئەو مەبەستە چاوم بە کتێبە پڕ پیتو بەرەکەتەکەی (مجموعة الفتاوى)ی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەدا گێڕاو لەو دەریا نایابو بەفەڕەدا گەوهەرێکم دەرهێناو عەزمم لەسەر جەزم کرد کە وەریبگێڕمو بیخەمە بەردەم دیدی موسڵمانانو موجاهیدانی ئیسلام، هیوادارم خوا موەفەقی کردبمو توانیبێتم مافی خۆیم پێدابێتو، بشبێتە هۆی زیاتر ڕازاندنەوەی گوڵزاری کتێبخانەی کوردی ئیسلامیمانو، پەروەردگار (شێخی ئیسلامی) بە فیردەوسی نەبڕاوە شادکردبێو ئەم ڕەنجە بچکۆلەیەشی لە منی بەندەی هەژار وەرگرتبێت .... ئامین .....

پێم خۆشە لە کۆتایی ئەم پێشەکیەدا دوو تێبینی بنوسم:

یەکەم: خوێنەری خۆشەویست، من ئەم کتێبە بەنرخەم بۆیە وەرگێڕا، چونکە لە پاش خوێندنەوەو تێڕامانی بۆم دەرکەوت کە سودو پەرێزەکەی بۆ ئەم چەرخەی خۆشمان پێکەڵپێکە، بەڵام لەو سۆنگەیەوە کە هەندێك وردە بابەتی تێدایە بۆ ئێستای بارودۆخی خۆمان بەدیدی من ناگونجێت، بۆیە وەرم

نەگێڕاوەو هەروا بەسەریدا تێپەڕیوم. هەر بۆیەش نوسیومە: (وەرگێڕانو پوختکردنەوە)

دووەم: بەرگی (٢٨)ی (مجموعه الفتاوى) بەڵگە نەویستە کە حەجمو قەبارەیەکی گەورەی هەیە، جا ئەگەر بشکرێ بە کوردی ئەوە بێگومان گەورەتر دەبێ، هەر لەبەر ئەوەی کە مەودای ئەوەمان نەبوو هەر هەموو پێکەوە چاك بکەین، بۆیە کردم بە دوو بەشەوە. ئەمەی بەردەستتان (بەشی یەکەم)ەو خوا یار بێت (بەشی دووەم)یش دەکەوێتە بەردەستتان.

ئیتر بەخوای گەورەتان دەسپێرم.

هەورامان گەچێنەیی.

١٠/ربیع الأول/١٤٢١ك

٢٠٠٠/٦/١٢ز

هەڵەبجە – کانیە قوڵکە.

# پێشەکی چاپی دووەم

پاش ناوی خوا هێنانو سڵاووڕێز ناردن بۆ سەر ڕوحی پیرۆزی پێغەمبەرﷺو هاوەڵانی‌و شوێنکەوتووان.

خوێنەری بەڕێزو سەنگین:

ئەم کتێبەی بەردەستت کە بەڕاستی ماندووبوون‌و شەونخونی زۆری پێوە کێشراوە، پاش ئەوەی بۆ یەکەمجار لە چاپدرا، ئەو دەمە حاڵەتێکی زۆر تاڵ‌و ناساز لەسەر بەشێك لە ڕێبوارانی ڕابوونی ئیسلامیی کوردستاندا تێدەپەڕی، بۆیە بە دوودڵی‌و ڕاڕاییەوە، بە چاپ گەیەنرا، بە جۆرێك دەمانگوت: لەوانەیە –لەبەر حاڵەتی ئەمنی– خەڵکی نەتوانن لە کتێبخانەکاندا بە دویدا بگەڕێن!

بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە، فەڕو بەرەکەتێکی باشی بە خۆیەوە دیت‌و پەیتا پەیتا برایان‌و دۆستان‌و پێیان دەگوتم: بەڵکو بۆ جارێکیتر بە شێوەو چاپێکی قەشەنگ چاپ بکرێتەوە، ئەمنیش زۆرم پێخۆش بوو، بەڵام قەدەری خوا هەر کارەکە نەدەڕەخسا، تا دواجار پەروەردگار ئاسانی کردو بەم چەشنە هاتەوە بەردەستتان.

لە ڕاستیدا ئەم کتێبەی شێخی ئیسلام (إبن تیمیە) خوا لێی خۆش بێت– کاتێك لە وەرگێڕانی بوومەوە، بڕیارمدا هەتاوەکو بەڕێز جەنابی مامۆستا (علی باپیر) پێدانەچێتەوەو لێی ڕازی نەبێت بە چاپی نەگەیەنم، بۆیە دەمودەست بردمە خزمەتی‌و، جەنابیشی هەرچەندە سەرقاڵیی زۆری هەبوو، بەڵام لوتفی فەرموو ئەو ئەرکەی خستە ئەستۆی خۆی،و پاش پێداچونەوەو تێڕامانی فەرمووی: زۆرم پێ چاکەو إن شاء الله فەڕو بەرەکەتێکی باشی دەبێت، ئەوە منی زۆر خۆشحاڵ کردو زۆر سوپاسی خودام کرد، بۆیە دوبارە

ئەوپەڕی ڕێزو مەمنونیەتی خۆم دووپات دەکەمەوە بۆ جەنابی (مامۆستا علی باپیر)و خودای گەورە دەست بە تەمەنییەوە بگرێت:

دیارە کاری ئیسلامیی ئەگەر ڕێبوارەکانی کۆمەڵێك خاڵی ورد هەن ڕەچاوی نەکەن و تێکەڵی نەکەن لەگەڵ سیاسەتێکی شەرعی حەکیمانە ئەوە بێگومان نە لە دونیادا بەرهەمێکی وای دەبێت و نە لە قیامەتیشدا مایەی ڕووسوری دەبێت لە خزمەت پەروەردگاردا.

ئەم کتێبەش توێشویەکی نایابی سەنگینە بۆ ڕێبوارانی ڕێگەی بوژاندنەوەی دینی خودا -بە قیادەو قواعید-ەوە هیوادارام زۆر بە وردیو تێڕامانەوە بخوێنرێتەوەو داواکاریشم لە خوێنەرانی ئازیز کە لە دوعای خێر بەندە بێبەش نەکەن و ئاڕاستە وردو بەکەڵکەکانی شێخی ئیسلام -ابن تیمیە-ی حەڕڕانیش پشتگوێ نەخەن.

ئیتر بەو خودایەتان دەسپێرم کە سپاردە بە زایە نادات.

براتان: هەورامان گەچێنەیی

هەڵەبجەی شەهید / کانی قوڵکە

# ڕێ خۆشکردن

**خوێنەرانی خۆشەویست: ئەم کتێبەی بەردەستتان ئەم بابەتانەی لەخۆ گرتووە:**

## بەشی یەکەم ( جیهاد )

ئەم بەشەیان لە (٢٧) سەرباس پێکهاتووە، بەڵام بەر لە ڕیزکردن و تاووتوێ کردنیان، ڕوونکردنەوەیەك بەگرنگ دەزانم، ئەویش ئەوەیە کە: (شێخی ئیسلام) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لەم بەشی جیهادەدا نەهاتووە باسی فیقهی جیهادو ئەحکامەکانی بکات، بەڵکو تێکڕای بابەتەکانی بریتین لەو مەسەلانەی کە پەیوەستن بە جیهادکردنەوە لەڕێی خوادا، واتە: ئەوانەی کە موجاهیدی ڕێگەی خوا – بەقیادەو قاعیدەوە– لەکاروانی جیهادەکەیدا ڕووبەڕوویان دەبێتەوەو ئەگەر بێت و وریا نەبێ و چاك لێیان حاڵی نەبێ ئەوە جیهادەکەی قرپۆك دەردەچێ و ئەو ئامانج و مەبەستانەی کە لە ئیسلامدا جیهادیان بۆ فەرزکراوە نایان هێنێتە دی و دەرئەنجام هیچ بە هیچ ناکات و کورد گوتەنی دەبێتە سەپانی پووش!! ئەمەش باسەکان:

١– (فەزڵی ئێشکەگرتن لەنێو جیهاددا): تێیدا ڕوونی دەکاتەوە کە جیهادکردن بۆ خوا پاداشتی ئەوەندە زۆرە تەنانەت ئەوەی کە لە (المسجد الحرام) و (مزگەوتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و (بيت المقدس)یشدا ئەگەر بەنیازی بەندایەتی کردن بۆ خوا بمێنێتەوە هەر ناگاتە پلەی (موجاهیدی فی سبيل الله)!.

٢– (چەند پرسیارێك کە ئاڕاستەی شێخی ئیسلام کراوە): پرسیارەکانیش بە گوشراوی ئەمانەن:

* سەبارەت بە پاداشتی ڕەمی کردن و مەشقی سەربازییەوە.

* ئەو کەسەی لەپاش مەشقی سەربازی دەستی لێ هەڵ دەگرێت و لەبیری دەچێتەوە.

* نەقڵ بوونی موجاهید لە سەربازگەیەکەوە بۆ سەربازگەیەکی تر چۆنەو بە چ جۆرێك شەرعییەو چۆنیش ناشەرعییە؟

* پەیمان وەرگرتن لەلایەن سەرکردەوە بۆ سەرباز چۆن چۆنی شەرعییە؟
* مامۆستا ئەگەر لە سەربازگەدا قوتابییەکانی هەڵەو پەڵە بکەن بەڵام ئەو گوێیان نەداتیٚ و چاو پۆشییان لیٚ بکات، ئایا عەدالەتی دەپۆشێنیٚ؟
٣- (مەرجەکانی سەربازی ئیسلامی): تەنها ئاماژەی بە دوو سیفەتی سەرەکی موسڵمانی موجاهید کردووە، ئەویش (دینداری)و (ئازایەتی)یە.
٤- (پۆشینی -ئاوریشم-و -زێڕ-و -زیو- لە جیهاددا): ئەم خاڵە وردەشی بەجوانی لەبەر ڕۆشنایی (قورئان)و (سوننەت)دا توێژیوەتەوەو حاڵەتی شەرعیو ناشەرعییانی لێك هەڵداوێردۆتەوە.
٥- ئایا (دەگونجیٚ چەند -کات- یان -شوێن-ێکی دیاریکراو شومییان پێوە بێت؟): ئەم بابەتەشی جوان جوانیٚ تەتەڵە کردووەو بڕیاری شەرعی بیٚ سیٚو دوو تێدا ڕوونکردۆتەوە، بەو هیوایەی کەس خراپ حاڵی نەبێت.
٦- (نامەیەکی ئیبن تەیمیە لەو دەمەدا کە لە حەپسخانەی (ئەسکەندەریە)دا دەبێت: لەم نامەیەشیدا ئاماژەی بۆ چەند ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر کردووە، وەك: (تامو چێژوەرگرتنیو ئۆخژنبوونی لەنێو گرتوخانەدا، کردنەوەی دەرگای خێر لێی، تامو چێژی حەقیقی تەنها لە (ناسینی خوا)و (ئیمان)و (تەوحید)دایەو...هتد).
٧- (نوسراوێکی شێخی ئیسلام بۆ دایکی بەڕێزی لەنێو -حەپسخانە-دا): ئەم نوسراوەشی زۆر بەتامو چێژێکی ئیمانییەو ئاستی خۆشەویستیو سۆزی ئەو کەڵە پیاوە دەردەخات لە ئاقار دایکی بەڕێزیداو چەند ڕاستییەکی تریش.
٨- (پاداشتو سزا هاوچەشنی کردارن): ئەمەش بنچینە -قاعیدە-یەکی بەپێزی بەرنامەی خوایەو ڕوحی عەدالەتیش هەر لەوەدایە، بەم پێیەش بە وردی لەچەند ئایەتو فەرموودەیەکدا -ئەگەر ڕامێنین- حەقیقەتی ئەمەشمان وەك گزنگی بەیان بۆ دەردەکەوێت.

٩- (فەرمان بەچاکەو پێشگیریی لە خراپە): ئەم باسە گرنگەیشی زۆر بە چڕو پڕی نوختەی بۆ لەسەر پیت داناوەو چەندین بنچینەی ووردو بەسودی باسکردووەو ئاماژەی بەم چەند ڕاستیە کردووە:

١. فەرمان بەچاکەو پێشگیریی لە خراپە بەشێکە لە ئیسلامو سیفەتێکی زۆر گرنگو بەرچاوی ئوممەتی پێغەمبەرە (ﷺ).

٢. فەرمان بەچاکەو پێشگیریی لە خراپە فەرزی کیفایەیە.

٣. دوو دەستە لە فەرمان بەچاکەو پێشگیریی لە خراپەدا بەهەڵەدا چوون، واتە: دەستەیەکیان (إفراط-تێپەڕبوون) دەکەنو دەستەیەکیشیان (تفریط- بەزایەدان) کە هەردوکیان هەڵەن.

٤. سەرهەڵدانی گیروگرفتەکان سوچی تاوانەکانە.

٥. خەڵکی لەئاست فەرمان بەچاکەو پێشگیریی لە خراپە سێ بەشن: ئەو سێ جۆرە خەڵکانەشی زۆر بەجوانی ڕوون کردۆتەوە.

٦. سەرزەنشتکردنی ترسنۆکیو پیسکەیی لە (قورئان)و (سوننەت)دا.

٧. وازهێنان لە فەرمان بەچاکەو پێشگیریی لە خراپە بەیەك جارەکی لە ترسی دروستبوونی فیتنە بۆچونێکی هەڵەیە.

١٧- (مەرجەکانی کردەوەی صالح): لێرەشدا ئاماژەی بەوە کردوە کە هەر کردەوەیەکی (چاك) هەردووك مەرجی (بۆخوا بوون)و (بەپێی شەرعی خوا بەڕێوەچوون)ی تێدا نەبێت، خاوەنەکەی لەجێی پاداشت سزا دەدرێو لەسەری قەرزدار دەبێتەوە.

١٨- (دۆستایەتیو دوژمنایەتی لەبەرخوا): ئەم باسە گرنگەشی جوان تەتەڵە کردووەو ڕوونی کردۆتەوە کە بڕبڕەی پشتی (ئیمان)و (ئیسلامەتی)یەو ئیمانو ئیسلامەتی بەبێ ئەو وەك گوێزی پوچ وایەو لە دونیاو دواڕۆژیشدا هیچ پەرێزێکی باشی نابێت!! وە هەمیشەو هەردەم دۆستایەتی کردنی بێبڕوایان - بەدرێژایی مێژوو- سیفەتێکی بنەڕەتی دوڕوو دەغەڵەکان بووە، لەو بارەشەوە

گەلێك ئایەتو فەرمودەی هێناوەتەوە، پاشان هەر لەمیانەی ئەو باسەشدا ئاماژەی بەم چەند ڕاستیە کردووەو جوان توێژینەوەی لەسەر کردوون:
* لە دۆستایەتی بێبڕواکان حوکم بۆ لابردنیانە.
* ڕق لێبوونو دەنگ لێ هەڵگرتنو مەرجەکانیان.
* دەنگ لێ هەڵگرتن بە شێوەی -تعزیر-.
٢٢- (ئارەق خۆرو چەند ئاگادارکردنەوەیەك): لێرەشدا سڵاوکردن لە عارەق خۆرو وەڵامدانەوەی سڵاوی ئەوی ڕوونکردۆتەوە، چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ تەرمەکەیدا توێژیوەتەوەو...هتد.
٢٣- (غەیبەت کردنی فاسقو حوکمی ئامادەبوون لەو جێگایانەی کە سەرپێچی خوایان تێدا دەکرێت): لێرەشدا تیشکێکی وردی خستۆتە سەر ئەم بابەتەو ئەو وتەیەی کە لەنێو خەڵکیدا باوەو بەفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) لەقەڵەمدراوە کە دەڵێت: (لاغيبة لفاسقٍ) ڕونی کردۆتەوە کە ئەوە گوتاری پێغەمبەر (ﷺ) نییە، بەڵام غەیبەت لەچەند حاڵەتێکدا دروستەو هیچ زیانی نیە، وە بەڕاشکاویش ڕایگەیاندووە کە: بۆ هیچ موسڵمانێك جائیز نیە بەبێ زەرورەت ئامادەی ئەو جێگایانە بێت کە مونکەریان تێدا دەکرێت.
٢٤- (غەیبەت کردن): لەمەڕ (غەیبەت)یشەوە سەرەتا پێناسەیەکی کورتی (غەیبەت)ی کردووەو جیاوازی نێوان (غەیبەت)و (بوهتان)ی ڕۆشن کردۆتەوە. وە دووبارە ڕوونتر تیشکی خستۆتە سەر ئەو حاڵەتانەی کە (غەیبەت)کردنی کەسێکی دیاریکراویان تێدا دروستە، پاشان باسی ئەوەش کراوە، کە: کۆمەڵێك هەن -بەحیساب فێڵ لەخوا دەکەن- (غەیبەت) کردنەکە دەئاخننە چەند قاڵبێکی جیاجیاوە، ئەوانەشی خاڵ خاڵ باس کردووەو تەتەڵە کردووە!!.
٢٥- ئایا ئامادەبوونی ئەو شوێنانەی سەرپێچی خوایان تێدا دەکرێت، عەدالەتی پیاوی موسڵمان دەڕوشێنێت؟): لێرەشدا ڕوونترو ڕاشکاوانەتر ڕایگەیاندووە کە: هەرکەس -بەبێ داخوازیەکی شەرعی- ئامادەی ئەو شوێنانە

بێت كه سه‌رپێچییان تێدا ده‌كرێت، ئه‌وه‌ نه‌ك (عه‌داله‌ت) به‌ڵكو پیاوه‌تیشی ده‌ڕوشێنێت!.

٢٦- (دار الإسلام‌و كۆچكردن): هه‌ریه‌كه‌ له‌ پێناسه‌ی (دار الإسلام)و (دار الكفر) به‌كورتی كراوه‌و، كۆچ (هیجره‌)تیش توێژراوه‌ته‌وه‌و باسكراوه‌ كه‌ له‌چه‌ند حاڵێكدا واجب ده‌بێت.

٢٧- (نامه‌یه‌كی ئیبن ته‌یمیه‌ - ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێت - بۆ به‌رپرسی موسڵمانان): ئه‌مه‌ ئاخر باسی ئه‌م به‌شی یه‌كه‌مه‌یه‌و تێیدا هانی ئه‌و به‌رپرسه‌ ده‌دات بۆ: (نوێژ به‌رپاكردن)و (زه‌كاتدان)و (فه‌رمان به‌چاكه‌و پێشگیریی له‌ خراپه‌).

## به‌شی دووه‌م - سیاسه‌تی شه‌رعی

ئه‌م به‌شی سیاسه‌تی شه‌رعییه‌ش ده‌بێت به‌ دوو به‌شه‌وه‌و هه‌ر به‌شه‌یان چه‌ند به‌ندو فه‌صڵێكی له‌خۆگرتووه‌، كه‌ كۆی فه‌صڵه‌كان ده‌بنه‌ (٢٧) فه‌صڵ.

# بەشی یەکەم

## ( جۆرەکانی ئەمانەت )

## ئەمەش دوو بەندی لەخۆ گرتووە:

## بەندی یەکەم: ( الولايات – لێپرسراوێتی ).

## بەندی دووەم: ( الأموال – دارایی ).

## بەندی یەکەم: (الولایات – لێپرسراوێتی)

جا بەندی یەکەم چوار فەصڵەو بەم شێوەیە:

فەصڵی یەکەم/ هەڵبژاردنی چاکترین‌و گونجاوترین کەس بۆ هەر لێپرسراوێتیەك.

فەصڵی دووەم/ هەڵبژاردنی چاکترین تا چاکتر.

فەصڵی سێیەم/ کەمی هەردووك سیفەتی (بەهێزی‌و دەستپاکی) لەنێو خەڵکدا.

فەصڵی چوارەم/ هونەری ناسین‌و دەست نیشانکردنی خەڵکی شایستە.

بەڵێ: ئەم چوار فەصڵە، چوار بنچینەو بنەمای گرنگی کاری ئیسلامین‌و زیاتر ئەرکی سەرشانی برا گەورەکانن، کە دەبێ لە برا گەورەیەتیەکەیاندا زۆر بەجوانی ڕەچاوی بکەن‌و بە موو لێی لانەدەن، جا لە ڕاستیدا سەرباسەکان خۆیان بۆ خۆیان ناوو ناونیشانێکی باشی نێوەڕۆکەکەیانن‌و لێرەدا بەپێویستی نازانم هیچ توێژینەوەیەکی لەسەر بنوسم.

بەندی دووەم: (الأموال – دارایی): ئەم بەندەشیان شەش فەصڵی لەخۆگرتووە:

فەصڵی یەکەم/ ئەو شتانەی کە دەچنە نێو بازنەی داراییەوە، لەم فەصڵەدا ئەم چەند بابەتە توێژراوەتەوە:

* قەرزە تایبەتی‌و گشتییەکان.

* گێڕانەوەو وەفابوون بە قەرز + شتی داگیرکراو + خوازراو + سپاردەو...هتد.

* بەرپرس ئەگەر پارەیەکی کەوتە دەست دەبێت چۆن سەرف بکات؟

فەصڵی دووەم/ (غەنیمەت – تالانی): بەجوانی باسی غەنیمەت کراوەو شی کراوەتەوەو شەرعیەتی لێکدراوەتەوەو بەدرێژی باسی چۆنێتی دابەشکردنی

**کراوەو حوکمی شاردنەوەو دزیکردن (الغلول) لەماڵی غەنیمەتدا ڕۆشن کراوەتەوەو دواتر لە پێنج خاڵدا چەند سەرنج و ئاگادارکردنەوەیەکی دیکە خراوەتە ڕوو.**

**فەصڵی سێیەم/ (الصدقات – زەکات): باسی ئەوانە کراوە کە زەکاتیان پێدەشێ کە (هەژارو گەدایان، و کرێکارانی سەر زەکات، و نوێ موسڵمانان یان دڵ ڕاگیراوان، و کۆیلە ئازادکردن، و قەرزداران، و موجاهیدان، و ڕێبواران)ن.**

**فەصڵی چوارەم/ (الفيء– دەستکەوت): باسی حەڵاڵبوونی دەستکەوت کراوەو پێناسەی کراوەو ئەو وردەشتانەش کە هەر دەچنە نێو دەستکەوتەوە کەم و زۆر باسکراون و توێژینەوەیەکی نایاب کراوە.**

**فەصڵی پێنجەم/ (ستەم کردن هەم لە بەرپرسان و هەم لە چینی خوارەوەش دەپشکوێتەوە): ئەمەش خاڵێکی وردو گرنگەو سوپاس بۆ خوا تا ڕادەیەکی زۆر جوان باسی لێوە کراوەو بە ئایەت و فەرموودە پاڵ پشت کراوە.**

**فەصڵی شەشەم/ (دابەشکردنی ماڵی – فيء – دەستکەوت): بەدرێژی باسی چۆنێتی دابەشکردنی ماڵی دەستکەوت کراوەو گەلێك ئایەت و فەرمودەو گوتەو ڕەفتاری یارانی پێغەمبەر (ﷺ) تێدا خراوەتە ڕوو.**

## بەشی دووەم

## ( حەددە شەرعییەکان و مافەکان )

ئەمەش دوو بەندە:

بەندی یەکەم/ (حدود الله وحقوقه – سنورەکانی خواو مافەکانی):

جا ئەم بەندی یەکەمە بریتیە لە نۆ فەصڵ:–

فەصڵی یەکەم/ چەند نمونەیەك لەو مافو حەددانەو ئەرکی بەرپرسان لە ئاستیان.

فەصڵی دووەم/ تۆڵەو سزای ڕێگرو چەتەکان.

فەصڵی سێیەم/ ئەرکی موسڵمانان لەو دەمەدا کە ڕێگرەکان خۆیان نەئەدا بەدەستەوە.

فەصڵی چوارەم/ حەددی دزیکردن (السرقة).

فەصڵی پێنجەم/ حەددی داوێن پیسی (الزاني والزانية) + نێربازی (اللواطة).

فەصڵی شەشەم/ حەددی ئارەق خۆر (شارب الخمر) + حوکمی حەشیشە.

فەصڵی حەوتەم/ حەددی بوهتان کردن (القذف).

فەصڵی هەشتەم/ ئەو تاوانانەی کە سزاو حەددێکی دیاریکراویان بۆ دیاری نەکراوە.

فەصڵی نۆیەم/ جیهادی بێبڕوایان.

بەڵێ: هەریەك لەم نۆ فەصڵە کە نۆ بابەتی سەربەخۆی لەخۆ گرتووە، کەمو زۆر بە گوێرەی گرنگترو گرنگبوونی نێوەڕۆکی بابەتەکە تیشکی خراوەتە سەرو بەسێنایی بەرچاوی خوێنەران ڕۆشن دەکاتەوەو تێیاندا تەواوی (حەددە) شەرعییەکان توێژراونەتەوەو ئاماژە بە فەزڵی جیهادو تێکۆشان بۆ خوا بە درێژی کراوەو تیشك خراوەتە سەر –نوێژ چوێن– نوێژ نەکەرو... هتد.

## بەندی دووەم

## (ئەو مافو حەددانەی کە سودەکەیان تایبەتە بە کەسێکی دیاریکراوەوە)

ئەم بەندەش هەشت فەصڵە:

فەصڵی یەکەم/ (النفوس گیانو ڕۆح) لێرەدا بە جوانی باسی (قەتڵ) کراوەو هەرسێك جۆری خراوەتە ڕوو، وە ئایەتەکانی (١٥١-١٥٣)ی سورەتی (الأنعام) تەفسیر کراوەو تیشکێکی ووردیش خراوەتە سەر (قصاص - تۆڵە سەندنەوە) لە ئیسلامدا.

فەصڵی دووەم/ (قصاص) تۆڵەسەندنەوە لەبریندارکردندا.

فەصڵی سێیەم/ (قصاص) تۆڵەسەندنەوە لە ناموسدا.

فەصڵی چوارەم/ حەددی بوهتان کردن (القذف).

فەصڵی پێنجەم/ مافەکانی ژنو مێرد لە ئاقار یەکتردا.

فەصڵی شەشەم/ (الأموال)ماڵو دارایی.

فەصڵی حەوتەم/ ڕاوێژکردن بۆ لێپرسراو زۆر پێویستە.

فەصڵی هەشتەم/ بوونی براگەورەو + بەڕێوەبردنی کاروباری بڕواداران، سەرمەشقو گەورەیی -واجبات- دینە.

یەك یەکی ئەم سەرباسانەش لەژێر تیشکی (قورئان)و (سوننەت)دا خراوەتە ڕوو خڵتەو خاڵیان پێوە نەماوەو خوا یاربێ بەرچاو ڕوونییەکی ناوازە دەبێ بۆ خوێنەرانی ئازیز.

# بسم الله الرحمن الرحيم

# بەشی جیهاد

## (ئێشکگرتن لەنێو جیهاددا‌و مانەوە لە شاری مەککەو مەدینەو (بیت المقدس) کامیان چاکترە، یان خێرترە؟)

پرسیار کرا لە شێخی ئیسلام (خوای لێ ڕازی بێت) سەبارەت بەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت: (حرس ليلة على ساحل البحر، أفضل من عمل رجل في أهله ألفُ سنةٍ) رواه إبن ماجه. واتە: (ئێشکگرتن‌و پاسەوانی شەوێك لە پێناوی خوادا لەسەر لێواری دەریا، چاکترە لە کردەوەی چاکی هەزار ساڵی پیاوێك لەنێو ماڵ‌و منداڵی خۆیدا).

وە پرسیاری لێکرا دەربارەی مانەوە لە شاری (مەککە)و (مەدینە)و (بيت المقدس) بە نیازی بەندایەتی‌و خۆ یەك لاکردنەوە بۆ خوا، وە مانەوە لە (دمياط) و (ئەسکەندەریە)و (طرابلس) بەنیازی سەنگەر نشینی، ئایا کامیان باشترو چاکترە؟

ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی:

پاش سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گەورە:

وەستان‌و مانەوە لەسەر سنوری موسڵماناندا بۆ بەرگری، لە دراوسێیەتی ئەو سێ مزگەوتە باشترە، وە ئەمەش کە دەیڵێم پێم وا نیە لەنێو گرۆی زانایاندا هیچ ڕا جیایی‌و مشتومڕێکی تێدا هەبێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە سەنگەر نشینی بەشێکە لە (جیهاد)، بەڵام دراوسێیەتی ئەو سێ مزگەوتەو تێدا مانەوەیان بەشێکە لە (حەج) کردن، دەی بێگومان جیهادیش لە (حەج) پیرۆزترە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:

(أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ) (التوبة: ١٩)

واتە: (ئایا ئێوە ئاودان بە حاجییەکانی ماڵی خواو ئاوەدانکردنەوەی (مسجد الحرام)تان داناوە وەکو ئەو کەسەی کە بڕوای بە خواو بەڕۆژی دوایی هێناوەو لەپێناو ڕێگەی خوادا جیهاد دەکات! بێگومان لەلای خوا وەك یەك نین)[1] وە لە (بوخاریو موسلیم)یشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری لێکرا: (ئایا چاکترینی کردەوەکان چییە؟ فەرمووی: بڕوا بە خوداو نێردراوەکەی –محمد (ﷺ)، وترا: پاشان چیتر؟ فەرمووی: پاشان جیهاد لەڕێی خوادا. وترا: جا چیتر؟ فەرمووی: ئینجا حەجێکی پاكو بێگەرد).

وە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: (غزوة في سبيل الله أفضلُ من سبعين حجة) رواه إبن شيبة. واتە: (بەشداریکردنی شەڕێك لە پێناوی خوادا، لە (حەفتا) حەج چاکترە).

وە ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە سەلمانی فارسیەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (سەنگەر نشینی شەوو ڕۆژێك لەپێناوی خوادا، لە بەڕۆژوو بونو شەونوێژی (مانگێك) باشترە، وە هەر موسڵمانێك بەسەنگەر نشینی بمرێت، ئەوە بە موجاهیدی مردووە، وە هەردەم ڕۆزیەکەی لە بەهەشتەوە بۆ دێت، وە لە فیتنەی نێو گۆڕ

---

[1] هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، پیرۆزە ئەوە بوو: (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری) دەفەرموێت: جارێکیان من لەلای میمبەرەکەی پێغەمبەردا بووم (ﷺ)، لەنێو هەندێ لە هاوەڵانیدا، پیاوێکیان وتی لەدوای موسڵمان بوونم گوێ نادەم کە هیچ کردەوەیەك نەکەم ئەگەر تەنها ئاو بدەم بە حاجییەکان، یەکێکی تریان وتی: بەڵکو ئاوەدانکردنەوەی (المسجد الحرام) باشترە، یەکێکیشیان وتی: بەڵکو جیهاد لەڕێی خوا باشترە لەوەی کە ئێوە گوتتان، لەو کاتەدا ئیمامی (عومەر) –خوای لێ ڕازی بێت– سەرزەنشتی کردنو فەرمووی: لەلای میمبەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەنگتان بەرز مەکەنەوە، بەڵکو من ئەگەر نوێژی هەینیم تەواوکرد، ئەوە دەچم بۆلای پێغەمبەرو (ﷺ) پرسیاری لێ دەکەم سەبارەت بەوەی کە ئێوە جیاوازن تێیدا، ئیمامی (عومەر) –خوای لێ ڕازی بێت– ڕۆشتو ئەم ئایەتە دابەزی: (أجعلتم سيقايه الحاج...) رواه مسلم، مختصر تفسير إبن كثير، ج٢ ص١٣١، وەرگێڕ.

قوتار دەبێت). وە ئیمامی (عوسمان) (خوای لێ ڕازی بێت) بەسەر دوانگەکەوە فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (سەنگەر نشینی تەنها ڕۆژێك لەپێناوی خوادا، لە هەزار ڕۆژی شوێنەکانی تر چاکترە) رواه الترمذي والنسائي والدارمي وأحمد.

وە ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (من ئەگەر بۆ خوا تەنها شەوێك لە سەنگەرنشینیدا بم، لام خۆشترە لەوەی کە لە شەوی (قەدر)دا لەلای بەردە ڕەشەکەدا بمێنمەوە)!!.

لەڕاستیدا ئەو بەڵگانەی کە باس لە گەورەیی سەنگەرنشینیو ئێشکەگرتن لەپێناوی خوادا دەکەن زۆر زۆرن ئەم وەرەقەیە نایانگرێت. والله أعلم[1]

---

[1] ئەم فەرمودانەی کە ئیبن تەیمیە باسی کردن، تێکڕا بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سەنگەرنشینیو شەڕکردن لەپێناو خوادا گەورەترن لەمانەوە لەو سێ مزگەوتەدا، لە کاتێکدا گەورەترینو خۆشەویسترین مزگەوتن، چونکە لە فەرمودەی صەحیحدا هاتووە: یەك نوێژ لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) باشترە لە هەزار نوێژی مزگەوتانی تر. وە یەك نوێژ لە (مسجد الحرام)دا باشترە لە سەد هەزار نوێژی جێگاکانی تر. وە یەك نوێژ لە (بيت المقدس) باشترە لە پێنج سەد نوێژ لە جێگاکانی تر. وەرگێڕ.

# چەند پرسیارێك كە ئاڕاستەی شێخی ئیسلام كراوە

شێخی ئیسلام -خوای لێ ڕازی بێت- سەبارەت بەم خاڵانە پرسیاریان لێكرد:

یەكەم: سەبارەت بە گەورەیی‌و پاداشتی ڕەمیكردن‌و فێربوونی... وەچی هاتووە دەربارەی كەسێك كە دوای ئەوەی مەشقی سەربازی فێر دەبێت وازی لێ بهێنێ؟ وە ئایا كام لەمانە باشترە، تیرو كەوان وەشاندن، یان ڕم هاویشتن، یان لێدان بەشمشێر؟ وە ئایا هەریەك لەم ئامێرانە زانیارییەك هەیە كە تایبەت بێت بەوەوە؟ وە شوێنێك شایستەی ئەو بێت‌و تێیدا بەكار بهێنرێت؟

دووەم: ئایا ئەگەر پیاوێك پیاوێكی فێری مەشقی سەربازی كرد، بەڵام قوتابییەكە لەپاشدا ئینكاری ئەوەی دەكرد كە ئەو فێری كردبێت، وە گواستیەوە بۆ لای مامۆستایەكی ترو پەیوەندی پێوەكرد، ئایا ئەم قوتابیە بەم هەڵوێستە تاوانبارە یان نا؟ وە ئایا بۆ مامۆستای دووەم حەڵاڵە كە ئەم قوتابیە گواستویەتییەوە وەریبگرێت‌و بەڵام سەرزەنشتی بكات لەسەر ئینكاری كردنی لە مامۆستای پێشوی؟

سێهەم: وە ئایا كەسێك لە سەرەتاوە بڕواتە ناو كۆمەڵێ قوتابی‌و مامۆستاو بڵێ: داواتان لێ دەكەم بەڵكو بە فلان كەس بڵێن بە هاوڕێ‌و قوتابی خۆی وەرمبگرێت، جا یەكێكیش لەو كۆمەڵە هەستێ‌و پەیمانی لێ وەربگرێت، وە هەرچی خۆی پێی خۆشە بەمەرج لەسەری دابنێ، ئایا ئەم جۆرە كردەوەیە ڕەوایە -جائیزە- یان نا؟ چونكە دەمارگیری لێوە دروست دەبێت بۆ مامۆستاكە، بەجۆرێك وای لێ دێ هەریەك لەو دوو مامۆستایە كۆمەڵێ براو قوتابی‌و هاوڕێ‌و كوتلەی بۆ دروست دەبێ‌و لەگەڵی دەبن، ئیتر ئەگەر (حەق) بەرقەرار بكات یان (باطل) گوێی نادەنێ، وە ئەو كوتلەیە وای لێ دێ دوژمنایەتی دوژمنانی مامۆستاكەیان دەكەن، وە خۆشەویستی خۆشەویستانی دەكەن؟!!.

چوارەم: ئایا ئەگەر قوتابییەکان ڕەفتارێکی نادروستیان کردو مامۆستاکە قسەی نەکردو چاوی لێ نوقاند، ئایا ئەوە عەدالەتی ئەو مامۆستایە دەڕوشێنێت؟ وە ئایا مامۆستا بۆی هەیە کرێ‌و بەخشیش لە قوتابییەکانی وەربگرێت؟ فەتوامان بۆ بدەن‌و چاوساغمان بکەن خوا پاداشتی بەخێرتان بداتەوە.

**شێخی ئیسلامیش بەم شێوەیە وەڵامیدایەوە:**

دوای سوپاس‌و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان:

یەکەم: ڕەمی کردن لەپێناوی ڕێگەی خودا، وەشاندن‌و هاویشتن‌و لێدان بۆ خوا، هەموو ئەمانە خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانیان پێ کردوون، وە پەروەردگار هەرسێك جۆرەکەی باسکردوون، واتە: (رمي، طعن، ضرب) بۆ نموونە: خوای بالآدەست دەفەرموێت: فَإِذا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا (محمد:٤)

وە دەفەرموێت: فَاضْرِبُوا فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ(الأنفال١٢)

وە دەفەرموێت: وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ (الأنفال:٦٠).

وە لەصەحیحی (موسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر دوانگە ئەم ئایەتەی خوێندووەو پاشان فەرمووی: (ئاگاداربن ئەم هێزە بریتیە لە ڕەمی، ئاگاداربن ئەم هێزە بریتیە لە ڕەمی، ئاگاداربن ئەم هێزە بریتیە لە ڕەمی)

## پۆشینی ئاوریشم و زێڕوزیو-الحرير والذهب والفضة-له جیهاددا

هەروەها پرسیاریان لێ کرد: ئایا دروستە بۆ سەربازی مسوڵمان لەکاتی شەڕدا ئاوریشم و زێڕو زیو بپۆشێت یان لەکاتێکدا کە نێردراوان‌و وەفدی دوژمن دێن بۆلای مسوڵمانان؟ لەوەڵامدا فەرمووی: لەبەرکردنی ئاوریشم لەکاتی شەڕدا لەبەرپێویستی بەبۆچون و ڕای هەموو زانایان –جائز–ە ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر هاتوو هیچ شتێکی دیکە بۆ خۆپاراستن شوێنی ئەمی نەگرتەوە.

بەڵام لەبەر کردن بۆ ترساندنی دوژمن ئەوە زانایان دوو بۆچوونیان لەم بارەیەوە هەیە بەهێزترینیان ئەوەیە کە –جائز–ە بەڵگەش ئەوەیە کە مسوڵمانان لە وڵاتی" شام" دا نامەیان بۆ ئیمامی (عمر)–خوای لێ ڕازی بێت– نووسی ووتیان:ئێمە کاتێك کە دەگەین بە دووژمن دەبینین شمشێرو چەکەکانیان بە ئاوریشم داپۆشیوە ئەم حاڵەتەش ترس دەخاتە دڵەکانمانەوە، ئیمامی (عمر)یش بۆی نوسین: (ئێوەش وەکو ئەوان چەکەکانتان بە ئاوریشم داپپۆشن).

وە بەهەمان شێوە پۆشانی ئاوریشم جۆرە شانازی‌و خۆهەڵنانێکی تێدایە خوای گەورەش شانازی‌و خۆهەڵنانی مسوڵمانانی لەکاتی شەڕو ڕوو بەرووبونەوەی بێبڕوایان خۆش دەوێت، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت: ((إن من الخيلاء مايحبهُ الله، ومن الخيلاء ما يبغضه الله فأما الخيلاء التي يحبها الله فاختيال الرجل عند الحرب، وعند الصدقة واما الخيلاء التي يبغضها فالخيلاء في البغي والفخر......))رواه ابوداود والنسائي واحمد.

واتە: (بەڕاستی هەندێ خۆڕانواندن خوا خۆشی دەوێت، وەهەندێ هۆهەڵنان خوا ڕقی لێ دەبێتەوە، جائەو خۆهەڵنانەی خوا خۆشی دەوێت، خۆهەڵنانی مسوڵمانانە لەوەختی جەنگ و ماڵ بەخشیندا، بەڵام ئەو خۆهەڵنانە کە خوا ڕقی لێ دەبێتەوە خۆهەڵنانە لەکاتەی دەست درێژی و فەخردا).

وەلەبەر ئەوەش کاتێك کە شەڕی ((ئوحود)) ڕویدا، (ئەبودەجانە)ی ئەنصاری- خوای لێ ڕازی بێ- لەنێو هەردووك ڕیزەکەدا خۆی دەنواند و هۆی هەڵدەنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە ڕەفتارێکە خوا ڕقی لێ دەبێتەوە تەنها لەم شوێنەدا نەبێت) رواه الهیثمی والطبرانی و البیهقی و إبن کثیر.

بەڵام بەئەندازەی پانتایی چوار پەنجە لەئاوریشم،ئەوە لەکاتی شەڕیشدا نەبێت هەر- جائز-ە. وەلەئاڵتونی کەم دا زانایان جیاوازن ، بەڵام لەڕاستی دا ئەمیش هەر جائزە چونکە لەپێغەمبەر (ﷺ) هاتووەکە: (پێشگیری لەئاڵتون کردووە، تەنها بەپارچەکراوی نەبێت).واتە: کەم. رواە داود واحمد.

## (ئایا چەند كات یان ڕۆژێكی دیاریكراو هەن شومییان پێوەبێت)

شێخی ئیسلام- إبن تیمە- پرسیاری لێكرا دەربارەی: هەندێ ڕۆژوشەو، بۆ نمونە دەڵێن: سەفەركردن لەڕۆژانی شەممەو چوارشەممەو پێنج شەممە دا باش نیە، یان یاری كردن لەگەڵ خێزان و جل دورین و سەرتاشین لەفلان و فلان ڕۆژدا شتێكی باش نی یە، یان دەڵێن: لەفلان شەودا كۆبونەوەی ژن و مێرد خراپە، چونكە مەترسی بۆ منداڵەكە هەیە؟ ئەویش لەوەلآمدا فەرمووی:ئەم قسەو قسەلۆكانە هەموویان پوچەڵن‌و هیچ بەڵگەو بورهانێكیان لەسەر نیە، بەڵكو پیاو ئەگەر (استخارة)ی كردوو ویستی كارێكی خێر ئەنجام بدات، باهەركاتێك بۆی گونجا ڕای پەڕێنێ و لێی نەوەستێت.

جا جل دورین و سەرتاشین و كۆبونەوەی ژن وپیاو، لەهیچ شەو و ڕۆژێكدا خراپ نیە. وە پێغەمبەر (ﷺ) بەرهەڵستی لە(طیرة) كردووە[1]، هەروەك لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە لە (معاویة)ی كوڕی -حكم-ەوە كە دەفەرموێت: (وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە هەندێكمان تێدایە دەچن بۆلای فاڵچیەكان، ئەویش فەرمووی: مەچن بۆلایان، وتم: وەهەندێكمان تێدان بەدقومی بەشتێكەوە دەكەن - طیرة- فەرمووی: ئەوەشتێكی دەروونیە با بۆ ئەنجامدانی ئیش ڕێگەتان لێ نەگرێت. رواه النسائي و احمد.

بەڵآم ئەوەندە هەیە سەفەركردن لەڕۆژانی شەممە و دووشەممە و پێنج شەممەدا سوننەتە، بەڵآم مەنعیشی لێ نەكراوە بۆ ڕۆژەكانی تر، تەنها ڕۆژی هەینی نەبێت ئەویش ئەگەرهاتوو سەفەركە بوویە هۆی فەوتانی جومعەكەی، ئەویش زانایان جیاوازیان تێدایە. وەكۆبونەوەی ژن‌و مێردو كڕین و فرۆشتن و دروستكردنی هەندێ پێویستی ئەمانەش لەهیچ ڕۆژێكدا خراپ نین، والله أعلم.

---

[1] طیرة: بریتیە لەوەی كە دەنگی باڵندەیەك یان جۆرە گیانلەبەرێك یان قسەی مرۆڤێك بە بەدقوم بزانیت‌و بتگێڕێتەوە لە ئیشێك كە دەتەوێ ئەنجامی بدەیت. فتح المجید شرح كتاب التوحید ص٢٩٥. وەرگێڕ.

## نامەیەك لە "إبن تیمیە"وە بۆ هاوڕێیانی لەو دەمەدا كە لەبەندیخانەی (ئەسكەندەریە)دا دەبێت.

(بسم الله الرحمن الرحیم)

وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ (١١)

ئەوەی كە دەمەوێت ئاگادارتان بكەمەوە ئەوەیەكە: سوێند بەوخوایەی كە هیچ پەرستراوێكی تر نیە ئەو نەبێت، من ئێستا "لەناوزینداندا" لەخۆشی و نیعمەتێكدام لەهەموو ژیانمدا چێژی وام نەدیتوە، وەخوای گەورە دەرگای نیعمەت و بەزەیی و سەخاوەتی خۆی ئەوەندە كردۆتەوە كە بەخەیاڵدا هەرنەدەهات!!.

چونكە بەڕاستی تێكڕای خۆشیو تامو خۆش بەختی یەك كەهەرباسی ناكرێت تەنهاو تەنها لە ناسینی خواو ئیمانو یەكتا پەرستی دایە هەروەك هەندێك لەخواناسان وتویانە: ئێمە بەهۆی ئیمانەوە جاری وایە لەحاڵێكداین، ئەگەر بێت و ئەهلی بەهەشتیش لەو حاڵەدابن ، ئەوە كە واتە لەژیانێكی خۆشدان!!

وەلەڕاستی دا لەم دوونیایەدا هیچ نازو نیعمەتێك نی یە كەلە نیعمەتەكانی دوا ڕۆژ بچێت، تەنها ناز و نیعمەتی ئیمان و ناسینی خوا نەبێت، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) هەمووجار دەیفەرموو: "أرحنا بالصلاة یا بلال" رواە ابوداود واحمد.

واتە: ئەی بیلال بەبانگكردن بۆ نوێژ بمانحەسێنەوە. نەیفەرموو بمانحەسێنەوە لێی!! بەڵكو دەیگوت بمان حەسێنەوە پێی!! هەروەك ئەوانەی نوێژیان لەسەر بارێكی گرانە وا دەڵێن !!! وەك پەروەدگار لەباسیاندا دەفەرمووێت: وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ(٤٥). واتە: (بەڕاستی نوێژ بارێكی گرانە تەنها بۆ گەردن كەچان نەبێت ئاسانە)، وە بەڵگە نویستە تەنها بە خۆشەویستی خواو نزیك بوونەوە لێی دڵان دەگەنە خۆشیو تامو چێژی تەواو، وە خۆشەویستی خواش دروست نابێت مەگەر پشت لەهەموو خۆشەویستیەكی تر بكەیت، هەرئەوەش مانای تەواوو پڕاوپڕی "لاإلەالاالله"یە. وە پێویستە بزانرێت كە تەاووی هەمووخێرو فەڕو چاكەیەك لەئەنجامی شوێن كەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) وەدەست دەخرێت، ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی كە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت: يَأْمُرُهُمْ

بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنْ الْمُنكَرِ (الأعراف ١٥٧) واته: فەرمانیان پێ دەکات بەهەموو چاکەیەك وە جڵەو گیریان دەکات لەهەموو خراپەیەك.

بەڵام زۆرینەی خەڵکی زۆرینەی هەرە زۆری ئەو ڕاستیانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی نایان ناسن، بەڵکو تەنها ئەندازەو چەمکێکی لێ دەزانن وەهی واش هەیە بەهۆی شوێن کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە شتی زیادەی فێردەکات، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْواهُمْ (محمد:١٧) واتە: (ئەوانەی کەداوای هیدایەت و ڕێگەی ڕاستیان کرد، خودای گەورە هیدایەتی بۆ زیادکردن و پارێزکاری پێ بەخشین)[1] وە دەفەرموێت: وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا (العنكبوت:٦٩) واتە: (ئەوانەی کە لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ئێمەش ڕێگاکانی خۆمانیان بۆ ڕۆشن دەکەینەوە). وە هەم دەفەرموێت: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) خوات بەسە، وەخوا بەسە بۆ ئەو بڕوا دارانەی کە شوێنت کەوتون) چونکە هەرکەسێك شوێن پێغەمبەر(ﷺ) بکەوێت ، ئەوە خوای گەورەی بەسە.

وە پێویستە بزانرێت: بەرنامەی ئازیزی ئیسلام لە دوخاڵدا کۆبۆتەوە (یەکتاپەرستیو داوای لێ خۆش بوون لەخوا-التوحيد والاستغفار-) وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ) (محمد: ١٩) واتە: (بزانە کە هیچ پەرستراوێك نی یە شاسیتەی پەرستن بێت -الله- نەبێت وەداوای لێ خۆشبوون بۆ گوناهی خۆت و پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار بکە).

وە دەفەرموێت: (فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ) (فصلت:٦) واتە: (بەپاکی بەندایەتی بۆ خوا بکەن و داوای لێ خۆشبوونی تاوانەکانتانی لێ بکەن)[2] چونکە ئەنجامدانی تێکڕای فەرمان پێکراوەکان وەنەکردنی دوا بەیەکی قەدەغەکراوەکان دەچێتە نێو بازنەی یەکتا پەرستییەوە کە ئەویش گوتنی وشەی (لاإله‌الاالله)یە، وەهەرکەسێك بەگوێی خوانەکات و واز لەسەر پێچی نەهێنێت ئەوە خوا کردەوە چاکەکانی لێ

---

[1] تفسیر إبن کثیر م٣ ص٣٣٣. وەرگێڕ.

[2] مختصر تفسیر إبن کثیر م٣ ص٢٥٦ وەرگێڕ.

وەرناگرێت، هەروەك دەفەرمووێت: (إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنْ الْمُتَّقِينَ (المائدة:٢٧) واتە: (خوا کردەوە چاکەکان تەنها لەپارێزکاران وەردەگرێت).
بەڕاستی بەندەی مسوڵمان ئەگەر خوای پەروەردگار بەیەکتاپەرستی ڕێزی لێ ناو پڕ بەدڵ وتی (لاإلەالاالله) ئەوە بەهۆی ئەو یەکتا پەرستیەوە خوای بەرز بەئاسودەیی و دڵ ئارامی دەیرازێنێتەوە وەدەیرازێنێتەوە بەبەزەیی بوون بەرامبەر بەدروستکراوەکانی خوا وەبەتێکۆشان لەپێناو خوادا.
وەهەرکاتێك یەکتا پەرستی لەنێو دڵی مسوڵماناندا بەهێز بوو وە فرا ژوو بوو، ئەوە بڕوایەکەی و ئارامی و پشت بەستن و یەقینیەکەی هەردەم بەهێزتر دەبێت چونکە ئەو ترس و دڵەڕاوکێی و بیمەی کە لەنێوان دڵی خەڵکدا دروست دەبێت ئەوە بەهۆی هاوەڵ بڕیاردانیانە بۆ خوا واتە: -نەبوونی یەکتاپەرستی یە- وەك پەروەردگار دەفەرمووێت: (سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ) (ال العمران:١٥١) واتە: (ئێمە ترس دەخەینە دڵی بێ بڕوایانەوە بەهۆی هاوەڵ دانانیانەوە بۆ خوا). وەهەروەها خوای گەورە لە چیرۆکی ئیبراهیم پێغەمبەردا علیه السلام دەفەرمویێت: (الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمْ الأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ) (الانعام:٨٠-٨١) واتە: (ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە بڕواکەیان ئاوێتەی -شرك- نەکردووە ئەوە ئارامی بۆ ئەوانەیەو بەڕاستی هەر ئەوانەش هیدایەت دراون) بۆیە (ئیمامی احمد) - خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرمووێت: ئەگەر باوەڕو یەکتا پەرستیەکەت تەواو بێت ئەوە لەهیچ کەسی ناترسیت، وەئاگاداربن خوای گەورە دەفەرمویێت: (أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُمْ مَثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ مَسَّتْهُمْ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللَّهِ أَلاَ إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ) (البقرة ٢١٤) واتە: (ئایا ئەی مسوڵمانان واتان داناوە کەبچنە بەهەشت؟بەڵام جارێ نمونەی ئەوەی کەبەسەر ئەوانەی پێش ئێوەدا هات بەسەرتاندا نەهاتووە؟!کە ئەوان توشی هەژاری و نەخۆشی بوون وەدوچاری ترس و ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن بوون، هەتاوای لێ هات پێغەمبەرەکەو

ئەو بڕوادارانەی لەگەڵیدا بوون دەیانوت:ئیتر کەی سەرکەوتنی خوایی دێت؟ ئاگاداربن بەڕاستی سەرکەوتنی خوایی نزیکە[1]).

وەدەفەرموێت: (أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ) (العنكبوت ١) واتە: (ئایا ئەو خەڵکە وایداناوە کەهەرئەمەندە بەزوبان وتیان: بڕوامان هێناوە ئیتر وازیان لێ دەهێنرێ‌و تاقی ناکرێنەوە؟!).

خوای مەزن لەم چەند ئایەتە پیرۆزەدا ڕوونی کردۆتەوە کەکاتێك پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە مرۆڤایەتی لەئاستیان بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان دەڵێن: ئیمانمان پێی هێناوەو گوێڕایەڵی بۆ دەکەین، وەبەشێکیشیان لەسەرپێچی وتاوان بەردوام بوون،جابەشی یەکەم پێویستە تاقی بکرێنەوە و بدرێن لەبێژنگ هەتاوەکو ڕاستی‌و درۆ دەردەکەوێت وە بەشی دووەمیش وانەزانێ لەژێردەستی خوای "موتەعال" دەردەچێ‌و دەربازی دەبێت، بەڵکو دەبێت ڕۆژێك بێ لەناکاو خوا بیگرێت.

مەبەست لەوەیە برایان ئاگاداربن! بەوەی کەنیعمەتەکانی خوای پەروەردگار زیاد لە پێشووە و ڕۆژ بەڕۆژ لەگەشە کردن و نەش و نمادایە، وەئەگەر نەشتوانم پێتان بگەم‌و خزمەتتان بکەم ئەوە بە پشتیوانی خوا بەشەوو بەڕۆژ لای خوای بەخشەر بۆتان دەپاڕێمەوە، وەفەرمان دەکەم بەیەکەیەکەتان کەبەردوام لەخوا بترسێن و لەتاوان خۆ قوتار بکەن، لە سەرئەنجامی کردەوەی چاك‌و پاك هەردەم بەردەوام بن، وە هیواو پشتیوانتان تەنهاوتەنها خوای باڵادەستبێت، وەلەپێناوی خوادا جیهاد بکەن، وەمەبەست بەو جیهادەش ئەوە بێت دین تەنها بۆ خوا بێت و وشەی خوا سەرکەوتوبێت.

والحمدالله ناصر السنةو خاذل أهل البدعة والغيرة، صلى الله على محمد وآله وصحبه وسلم تسليما كثيرا.

---

[1] تفسير إبن كثير م١ ص٢١٤. وەرگێڕ.

## نووسراوێکی شێخی ئیسلام-إبن تيمية-ی پایەبەرز بۆ دایکی بەڕێزی لە کاتێکدا لە بەندینخانەدا دەبێت:

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

لەئەحمەدی کوڕی تەیمیەوە بۆدایکی بەڕێزم..... داواکارم خوای گەورە بەنیعمەتەکانی خۆی چاوەکانی گەش کاتەوە، وەڕێزو حورمەتی بەسەردابباڕێنێ.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته:

سوپاس و ستایش بۆ ئەوخوایەی کەهەرخۆی شایستەی پەرستنە، ئەوخوایەی کەشایستەی سوپاسەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. وەسلاوسەلام لەپێغەمبەری کۆتایی بێت(ﷺ). ئێوە بۆخۆتان چاك دەزانن مانەوەی ئێمە لەم ولاتانە، تەنها لەبەر چەند کارێکی پێویستە، هەرکاتێك کەمتەرخەمیمان تیاداکرد ئەوە دین و دنیامان لێ تێك و پێك دەچێت. سوێند بەخوا ئێمە دوری ئێوەمان پێ خۆش نی یەو بەدەست خۆمان نی‌یە، وەئەگەر بهاتایە تەنانەت باڵندەش هەڵی گرتینایە ئەوە دەهاتین بۆلاتن، بەلام وەك وتراوە: (بزر بيانوى لەگەڵ خۆی دایە).وەدوعای خێرمان بۆبکەن و داواکارم لەخوای لێبوردە ئێمەو ئێوەو هەموو مسوڵمانانیش توشی خێربکات. جا باهیچ کەس وا گومان نەبات ئێمە کارە دونیایەکان دەخەینە پێش نزیك بوون لەئێوەوە، بەڵکو کارە دینیەکانیش ناخەینە پێش نزیك بوونتانەوە ئەگەر هاتوو نزیك بونتان چاکترو باشتر بوو.

بەلام ئەورۆ ئیسلام پێویستی گەورەی هەیە، ئێمەو مانا لەکەم تەرخەمی کردن تێیدا ترسی زیانی هەم گشتی‌و هەم تایبەتیمان هەیە، چونکە ئەوەی بابای ئامادە بوو دەیزانێ‌و دەیبیسێ دوور نایزانێ و نایبیسێ، ئەوەی کەمن داواتان لێ دەکەم ئەوەیە کە: زۆر دوعای خێرمان بۆبکەن چونکە ئەوەی خودا

دەیزانێ ئێمە نایزانین، وەخوای بەرزو مەزن بەتوانایەو ئێمەش بێتواناو لاوازین و پەروەردگار ئاگاداری تێکڕای شاراوەکانە.
بازرگان لەسەرفەردا ئەگەر مەترسی لەتیاچوونی سەروەتەکەی هەبوو، ئەوە چەند ڕۆژێك دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی وەدەستی بخاتەوە، بەلأم ئەوەی ئێمە ئێستە پێوەی سەرقاڵین زۆر لەباس کردن گەورەترە و مەزنترە.
لەکۆتاییدا سلأو لەهەموو ماڵەوە دەکەم.... بەگەورەو بچوکەوە... وەسلأو لەیەکە یەکەی هاوڕێیان و دراوسێکان دەکەم.

والحمد لله رب العالمين

وصلى الله على محمد وآله وصحبه تسليما كثيرا.

## پاداشت سزا - الثواب والعقاب- هاوچەشنی کردارن

لەدیدی بەرنامەی خودا (پاداشت و سزا) لەچۆری ئەو کردەوەیە یە کە دەکرێت، چونکە ئەم بنەمایە ڕوحی دادگەریەو – العدالة–ئاسمانەکان و زەویەکانیش لەسەر ئەم دادپەروەریە ڕاوەستاون و بەڕێوە دەچن، بۆ وێنە: خوای داد پەروەر دەفەرموێت: (إِنْ تُبْدُوا خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا عَنْ سُوءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا)(النساء:١٤٩) واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر چاکەکانتان ئاشکراکەن یاخود بیشارنەوە، یان ببورن لەوەی کە خراپەتان لەگەڵ دەکات، ئەوە بەڕاستی خوا لێبوردەی بەتوانایە[1]. وەدەفەرموێت: (وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (النور:٢٢) واتە: (ئەی مسوڵمانان: لێ ببورنو چاو پۆشی لەخەڵك بکەن، ئایا ئێوە حەزناکەن خوا لێتان خۆش بێت؟) وە پێغەمبەری سەردار (ﷺ) دەفەرموێت: ((من لايَرحَمْ لايُرحَم)) رواه البخاري والمسلم.. واتە: (هەرکەس بەزەیی بەخڵکدا نەیەتەوە خواش بەزەیی بەودا نایەتەوە). وەهەم دەفەرموێت: ((ان الله جميل يحب الجمال)) رواه مسلم، واتە: (بەڕاستی خوا جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت) وەهەم لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت: ((ان الله طيب لايقبل الا الطيب)) رواه مسلم: واتە: (بەڕاستی خوا پاکەو تەنها پاکیش وەردەگرێت)). لەکۆی ئەم فەرموودانەو چەندین فەرموودەی تردا ئەوە دەردەکەوێت کە پاداشتو سزا هاوچەشنی ڕەفتارن. جاهەر لەبەر ئەم بنەما گرنگەیە کە (دز) سزاکەی ئەوەیە کە دەستی دەبڕدرێت، وە(ڕێگر) دانراوە کە دەستوقاچی بقرتێنرێت، وەلەخوێن –کوشتن– و دارای و هەندێ شتی تردا تۆڵەدانراوە –القصاص–، جابۆیە تابگونجێت سزا بەپێی جۆری سەرپێچییەکە بێت ئەوە شتێکی –

---

[1] مختصر تفسير إبن كثير م١ ص٤٥٢. سەیر دەکەیت لێرەدا خوای گەورە لە پاداشتی لێبوردن لە خەڵکی لێبوردنی خۆیی داناوە، ئەمەش پاداشتە لە جۆری کردەوەکە. وەرگێڕ.

مشروع-ە، بۆ نموونە: دەڵێن (عومەری کوڕی خەتاب)- خوای لێ ڕازی بێت- سەبارەت بەوکەسەی کە شایەتی درۆ دەدات فەرمانی دەرکردوە کە بهێنرێتو بەهەڵەو گەڕاوەیی سواری وڵاخ بکرێت و ناوچەوانی ڕەش بکرێت، چونکە ئەو بابایە ماتوڵ ڕووداوەکەی هەڵگێڕاوەتەوە، ئەوە دەبێت ئەویش وەرگێڕدرێت وەلەبەرئەوەی خۆی بەهۆی درۆکردنەوە دەمووچاوی ڕەش کردووە، ئەوە دەبێت نێو چەوانی بۆ ڕەش کرێت. هەربۆیەش خوای بالآدەست دەفەرموێت: (وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الآخِرَةِ أَعْمَى) الإسراء:٧٢ واتە: (هەرکەس لەم دونیایە لە ئاستی بەرنامەی خوا کوێربێت، ئەوە لە قیامەتیشدا کوێرە، واتە: -بەکوێری حەشر دەکرێ- ، وە دەفەرموێت: (وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى(١٢٤)قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا(١٢٥)قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى(١٢٦))(سورة طه) واتە:: (هەرکەسێ پشت لەبەرنامەی من بکات ئەوە ژیانێکی تەنگی بۆ هەیەو لەڕۆژی قیامەتدا بەکوێری حەشری دەکەین، ئەویش دەڵێ: پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرم دەکەی خۆ من لەدونیادا بینەر بووم؟!!! خوایش دەفەرموێت: ئا بەو شێوە ئایەتەکانی ئێمەت بۆ دەهاتو بۆت دەخوێندرایەوە، تۆش لە بیرت دەکردن، هەر بەو چەشنەش ئەمڕۆ تۆ لەبیر دەکرێی!!و هەروەك پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) دەفەرموێت: ((يحشر الجبارون والمتكبرون على صور الذر[1]، يطؤهم الناس بأرجلهم))رواه احمد والترمذي.

واتە: (زۆردارو خۆبەگەورە زانەکانی دونیا، لەشێوەی مێرولەدا حەشر دەکرێن بەجۆرێ ژێر پێی خەڵکی دەکەون!!)). چونکە ئەوان لەبەرئەوەی لەدونیادا بەندەکانی خوایان زەلیل کردووە خواش ئەوان بۆ بەندەکانی خۆی

---

[1] الذر: بەمانای خۆڵەمێش و مێرولەی بچکۆلە هاتووە. وەرگێڕ.

زەلیل و سوك دەكات، هەروەك چۆن ئەگەر كەسێك خۆی بۆ نزم بكاتەوە، ئەوە خواش بەرزی دەكاتەوە وەبەندەكانی خۆیشی وا لێدەكات لەئاستی ئەودا خۆ بەكەم بگرن. خوای گەورە ئێمەش و هەموو برا بڕوادارەكانمان صالح كات وەیارمەتی دەرمان بێت بۆ هەموو گوفتار و ڕەفتارێك كەڕەزامەندی خۆی تێدایە. وصلی الله علی سیدنا محمد واله وصحبه اجمعین.

# فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە

فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە- کە خوای گەورە پێغەمبەران و (علیهم السلام) کتێبەکانی خۆی بۆناردووە- بەشێکە لەم ئیسلامە پیرۆزە.

چونکە ئەم بەرنامەی خوایە یان (هەواڵە-إخبار)یان (فەرمان-إنشاء)ە. هەواڵ وەك: هەواڵدان دەربارەی خۆیو دەربارەی دروستکراوەکانی کەئەمەش یەکتاپەرستیو چیرۆکە قورئانیەکان دەگرێتەوە- التوحيد والقصص- فەرمانەکەش: یان فەرمان بەکردن، یان فەرمان بە نەکردن، یان ئەوەیە کەمرۆڤ لەنێوان کردنو نەکردندا سەرپشکە- الأمر والنهي والإباحة- کەواتە: بەشێکی هەرەزۆری قورئانی پیرۆز یان "ئەمر"ە یان"نەهی"یەکە فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپەش لەو تەوەرەدا دەخولێتەوە.

خوای گەورە سەبارەت بە کاری سەرشانی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنْ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمْ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمْ الْخَبَائِثَ) (الاعراف١٥٧.)

واتە: (فەرمانیان پێ دەکات بەهەموو چاکەیەك وەجڵەوگیریشیان دەکات لەهەموو خراپەیەك وەهەموو شتە پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکاتو شتە پیسەکانیان لێ قەدەغە دەکات). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تێرو تەواوەو هیچ کەمو کورتییەکی تێدا نیە، چونکە خوای گەورە لەسەر زوبانی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) فەرمانی بەهەموو چاکەیەك کردووە و بەرگری لەهەموو خراپەیەك کردووە و هەموو چاك و پاکێکی بەحەڵاڵو زوڵاڵ و هەموو پیسی یەکی بە قەدەغە داناوە.هەربۆیەش سەروەرمان محمد (ﷺ) دەفەرموێ: (إنما بعثت لأتمم مكارم الاخلاق) رواه البيهقي. واتە: (من نێردراوم بۆ ئەوەی هەموو ئاکارو بەها جوانەکان تەواوکەم) وە دەفەرموێت: (مثلي ومثلُ الأنبياء كمثل رجلٍ بني داراً فأتمها

واكملها إلا موضع لبنةٍ، فكان الناس يطيفون بها ويعجبون من حسنها، ويقولون لولا موضع لبنةٍ!! فأنا تلك اللبنة) (رواه بخاری ومسلم.) واته: (نمونەی من‌و پێغەمبەران وەك پیاوێك وایە خانویەك دروست بكات‌و تەواوی كات، تەنها شوێنی خشتێك مابێت خەڵكی دێن‌و بەچواردەوری دا دەگەڕێن و سەریان لەجوانی ئەو ماڵە سوڕدەمێنێت، وە دەڵێن: بینایەكی تەواوە ئەگەر شوێنی ئەوخشتە نەبایە،' دەی من ئەوخشتەم)بەپێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرنامەی ئیسلام كامڵ بوو، ئەوبەرنامەیەی كەفەرمان كردن بەهەموو چاكایەك وە ڕێگرتن لە هەموو خراپەو، بەحەڵاڵو زوڵاڵ دانانی هەموو شتێكی پاك و قەدەغەكردنی هەموو شتێكی پیسی لەخۆ گرتووە. بەڵام پێغەمبەرانی پێش ئەو زۆرجار هەندێ شتی پاكیان لە ئوممەتەكەیان قەدەغە كردووە- بەفەرمانی خوا-هەروەك خوای دادگەر دەفەرموێت: (فَبِظُلْمٍ مِنْ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ) (النساء:١٦٠) واتە: (بەهۆی هەندێ تاوانی گاورەكانەوە چەند شتێكی پاك كە پێشتر حەڵاڵ بوو بۆیان لێمان قەدەغەكردن)[1]. وە زۆرجار هەندێ شتی پیسیان لەسەر قەدەغە نەكردوون وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێت: (كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاً لِبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ) (ال عمران:٩٣) واتە: (هەموو جۆرە خواردەمەنیەك لە بۆ(بەنی اسرائیل)ییەكان حەڵاڵ بووە، تەنها ئەوە نەبێت كە إسرائیل (یعقوب) لەسەر خۆی قەدەغەكرد، پێش ئەوەی (تەورات) دابەزێت[2].

فەرمانكردن بەهەموو چاكەیەك‌و پێشگیری لەهەموو خراپەیەك لەنێو پێغەمبەران (علیهم السلام) تەنها لەبۆ پێغەمبەر(ﷺ)ی خۆمان بووە، ئەو

---

[1] مختصر تفسیر إبن كثیر م١ ص٤٦٣. وەرگێڕ.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو. وەرگێڕ.

سەروەرەی کە خوای مەزن هەموو بەهاو ئاکارە جوانەکانی پێ تەواوکرد، وەك پەروەردگار دەفەرموویت: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمْ الإِسْلاَمَ دِينًا) (المائدة:٣) بەڕاستی خوای گەورە بەفەزڵی خۆی بەرنامەکەی خۆی لەبۆ کامڵ کردووین وە نیعمەتی خۆی لەسەر تەواو کردووین وە ڕازی بووە کە تەنها ئیسلام پرۆگرامامان بێت.

جا خوای گەورە هەروەك چۆن سیفەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی بەوە باسکردووە کە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە دەکات، بەهەمان شێوەش ئوممەتەکەی، وەك دەفەرموێت: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ) (ال عمران:١١٠) واتە: (ئێوە چاکترین کۆمەڵن کە نێردراون بۆ لای خەڵکی، بەجۆرێك فەرمان بەهەموو چاکە و جڵەو گیری لەهەموو خراپە دەکەن، وە بڕاوی ڕاستەقینە بەخوا دێنن). وە دەفەرموێت: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ) (التوبة٧١) واتە: (پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان خۆشەویستو پشتیوانی هەندێکی تریانن و فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەدەکەن).

هەربۆیەش (ئەبو هورەیرە-خوای لێ ڕازی بێت-)دەفەرموێت: (ئێوەچاکترین خەڵکین بۆ خەڵکی، چونکە لەدوو توێی کۆتو زنجیردا دەریان دێننو دەیان خەنە نێو بەهەشتەوە). خوای گەورە لەوچەند ئایەتەدا ڕوونی کردەوە کە ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) چاکترینی ئوممەتن و بەسودترینی ئوممەتن بۆ خەڵکی لەبەر ئەوە فەرمان بەهەموو چاکەیەك و ڕێگری لەهەموو خراپەیەك دەکەن، وەهەروەها لەو پێناوەشدا جیهاد دەکەن بەڵام بەپێچەوانەوە ئوممەتانی تر- وەك پێشتریش ئاماژەی بۆکرا- فەرمانیان بەهەموو چاکەیەك نەکردووەو، بەرهەڵستی هەموو خراپەیەکیان لەخەڵکی نەکردووە، ئەوەشیان کە جیهادی کردبێ وەك "بەنو اسرائیل".. ئەوە زۆربەی جیهادەکەیان بۆ

پاڵپێوەنانی دوژمن بووە لەوڵات نەك بۆ فەرمان بە چاکەو ڕێگیری لەخراپە و بانگ هێشتی خەڵکی[1]. وەك خوای گەورە لەسەر زوبانی(موسا)–علیه السلام– باس دەکات کاتێك بەگەلەکەی خۆی وت: (يَاقَوْمِ ادْخُلُوا الأَرْضَ الْمُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَلاَ تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ(٢١)قَالُوا يَامُوسَى إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَنْ نَدْخُلَهَا حَتَّى يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ) (المائدة:٢١) واتە: (موسا–علیه السلام–) وتی: ئەی گەلەکەم بچنە نێو زەوی بەپاك ڕاگیراوەوە. کەشوێنی باو باپیرانتانو دوژمن داگیری کردووە. وە خوا پەیمانی داوەو سەرتان دەخات، وە مەگەڕێنەوە دواوە ئەگەر وابکەن ئەوە زیانبارن، ئەوانیش وتیان: ئەی موسا ئەوشارە کۆمەڵێکی خاوەن هێزی زۆرداری تێدایە، ئێمە تاوەکو ئەوان تێدا دەرنەچن ئێمە ناتوانین و ناوێرین بچینە ناویەوە جا ئەگەر ئەوان لێی دەرچوون، ئەوە ئێمەش دەچینە ناویەوە)[2] یان دەیان وت : (فَاذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلاَ إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ(٢٤) (المائدة:٢٤) ئەی (موسا) خۆت و پەروەردگارت بچن بجەنگن، ئێمە لێرە دانیشتوین)!!

---

[1] لێرەدا مەبەست لەوە نیە کە ئەو ئوممەتانە پێغەمبەرەکانیشیان جیهادو فەرمان بە چاکەو ڕێگرییان لە خراپە نەکردووە، بەڵکو پێغەمبەرە خۆشەویستەکان –علیهم السلام– هەموو ژیانیان لەوەدا بردۆتە سەر. بەڵام مەبەست لەوەیە کە ئوممەتەکانیان کەمتەرخەم بوون لەوەداو وەڵام دانەوەیان زۆر کەمبووە. وەرگێڕ.

[2] مختصر تفسير إبن كثير م١ ص٤٦٣. وەرگێڕ.

# فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە فەرزی کیفایەیە

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ(١٠٤) (ال عمران) واتە: بالەنێوان ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن بانگ هێشتی خەڵکی بکەن بۆلای خێر، وەفەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە بکەن، بەڕاستی هەرئەوان سەرفرازن).

فەرمان بەچاکەو پێشگیری لەخراپە لەسەر یەکەیەکەی مسوڵمانان فەرزنی یە.واتە فەرزی عەین نی یە بەڵکو فەرزی کیفایەیە، قورئانی پیرۆزیش لەسەر ئەمە بەڵگەیە، بەڵام ئەگەر ئەوانەی کەهەڵدەستن بەو ئیشە نەیانتوانی ئەنجامی بدەن ئەوە هەموو مسوڵمانێکی خاوەن توانا بەگوێرەی تواناکەی خۆی تاوانبارە، چونکە هەموو مسوڵمانێك بەگوێرەی توانای خۆی دەبێ فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە بکات، وەك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت: (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فاءن لم يستطع فبلسانه، فاءن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الإيمان) (رواه مسلم) واتە: (هەرکەس لەئێوە ئەگەر خراپەیەکی بینیئەوە بابەدەست بیگۆڕێت جا ئەگەر نەیتوانی ئەوە بابەزووبان، ئەگەر نەیتوانی بابەدڵ پێی ناخۆش بێت ئەویش لاوازترینی بڕوایە).

تێبینییەکی گرنگ: لەبەرئەوەی فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە لەگەورەترینی -واجیبات و سوننەتە-، وەواجب و سوننەتەکانیش دەبێت سودیان زۆر بێت لە زیانیان، کەواتە: هەرکاتێك زەرەری ئەوڕێگیریە زۆرتر بوو لەبەرژەوەندی یەکەی ئەوە خوای گەورە فەرمان بەشتی واناکات، ئەم فەرمان و بەرگریەش جاری وا هەیە بەدڵە جاری واش هەیە بەزوبانە، هەندێ چاریش بەدەستە (هێز)، بەڵام پێناخۆش بوونی دڵ ئەوە دەبێت لەهەموو سات و کاتێکدا هەبێت چونکە هیچ شوێنەوارو زیانێکی نیە، وەهەرکەس بە

دڵ (مونکەر)ی پیێ ناخۆش نەبێت، ئەوە بڕاوادار نیە وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ دەکات: (وذلك ادنی) یان دەفەرمووێت: ((واضعف الایمان)) یان دەفەرموێت: (لیس وراء ذلك من الایمان حبة خردل) رواه مسلم. وەجارێکیان پرسیار لە "ابن مسعود" -خوای لێ ڕازی بێت- کرا: ئایا مردووی ناو زیندوان کێ یە؟ فەرمووی: ئەوەی کە چاکە ناناسێ و، بەرهەڵستی لەخراپە ناکات!!

# دوو دەستە لەفەرمان بەچاکەو ڕێگیری لەخراپەدا بەهەڵە چوون

دوودەستە هەن بەدرێژای مێژوو لەفەرمان کردن بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپەدا بەهەڵەداچوون:

دەستەی یەکەم: فەرمان بەچاکەو ڕێگیری لەخراپە بەتەواوەتی وازی لێدێنن، ئەویش بە- تەئویل-ی ئەم ئایەتە: (عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) (المائدة:١٠٥) واتە: (ئەی بڕواداران ئێوە وریای خۆتان بن ئیتر ئەوەی کە گومڕابووە زیان بەئێوە ناگەیەنێت) بەڵام لەڕاستیدا ئەم جۆرە تەئویلە هەڵەیە هەروەك ئەبوبکری صدیق خوای لێ ڕازی بێت لەوتارێکیدا فەرمووی: (إنكم تقرؤون هذه الآية: (عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) وإنكم تضعونها في غير موضعها، وإني سمعتُ النبيّ ﷺ يقول: إن الناس إذا رأوا المنكر فلم يُغيّروهُ اوشك أن يعمهم الله بعقاب منهُ) (رواه احمد وابن ماجه) واتە: (ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە (عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) بەڵام لە شوێنی خۆیدا دایینانێن، بەهەڵە لێی حاڵی دەبن، چونکە من بیستومە لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە دەفەرموێت: (بەڕاستی خەڵکی ئەگەرخراپەیەکیان بینی و نەیان گۆڕی ئەوە نزیکە خوای گەورە سزایەکیان بۆ بنێرێ هەموویان بگرێتەوە[1].

دەستەی دووەم: ئەوانەن کە دەیانەوێ لە هەموو کات و ساتێکدا یان بەدەست - هێز- یان بە زوبان -گفتوگۆ- فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لە خراپە بکەن ئیتر بەبێ ڕەچاوکردنی تێگەیشتن و لێزانین و نەرمونیانی و ئارامگرتن (الفقه، العلم، الصبر)، بەبێ سەرنجدانە ئەوەی کەئایا چی بەرژەوەندی تێدایەو چی تێدا نییە؟ وە چی لەو قۆناغەدا لەتوانادا هەیە بکرێ و چی جارێ لەتوانادا نی یە؟ چونکە

---

[1] واتە: چاك و خراپ بگرێتەوە، خراپەکە لەبەر ئەنجامدانی سەرپێچییەکەو چاکەکەش لەبەر بەرهەڵستی نەکردنی لەو خراپەیە. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (واتقوا فتنة لاتصيبن الذين ظلموا منكم خاصة) وەرگێڕ.

جاري واهەیە مسوڵمانێك فەرمان بەشتێك دەكات یان جڵەوگیری لەكارێك دەكات خۆی بۆ خۆی وادەزانێت لەوكارەیدا گوێرایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ)ی كردووە بەڵام لەهەمان كاتتدا سنوری خوای بەزاندووە وە زەرەرو زیانێك دەنێتەوە كە زۆر لەبەرژەوەندیەكە گەورەترە. هەر لەبەر ئەمەیشە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كردووە بەئارامگرتن لەسەر خراپەو تاوانی پێشەوایانی مسوڵمان –الائمة– وەبەرهەڵستی كردووە كەشەڕیان لەدژ بكرێت هەتاوەكو نوێژ گەربن. واتە: هەتاوەكو نوێژگەر, بن نابێت شەڕیان لەگەڵ بكرێتو دەفەرموێت: (أدوا إليهم حقوقهم، وسلوا الله حقوقكم) رواه الحمد والترمذي. واتە: (مافی خۆیان بدەنێ و داوای مافی خۆتان لەخوای تەعالا بكەن).

كۆكەرەوەی ئەم خاڵەش لەم بنچینەدایە: هەركاتێك هاتوو لەشتێكدا زەرەرو بەرژەوەندی بەرامبەر یەك وەستان.واتە: كارێك هەم زەرەرو هەم بەرژەوەندیشی تێدا بوو ئەوە دەبێت كامیان باشتر بوو ئەوەیان پێش بخرێت چونكە فەرمان و پێشگیری –الأمر والنهي– لەدیندا ئەگەرچی هەمیشە هێنانی بەرژەوەندیو لادانی زیانی لەخۆ گرتووە، بەڵام دەبێت سەیری سەرەنجام و بەرامبەرەكەی بكرێت: ئەگەر ئەو بەرژەوەندیانەی لەدەست دەچوون زۆرتر بوون یان ئەو زەرەروزیانانەی لێیەوە پەیدا بووە زۆرتر بوو، ئەوە نابێت بكرێت و فەرمان بەشتی وا نەكراوە بەڵكو ئەگەر هاتوو زیانەكەی لەبەرژەوەندیەكەی زۆرتر بوو ئەوە هەر بەیەكجاری شتی وا قەدەغەیە.

بەڵام هەر ئەوەندەیە: دەستنیشانكردنو دیاریكردنی (بەرژەوەندییەكانو زەرەرەكان) دەبێت بەتەرازووی بەرنامەی خوابێتا، وەهەركات و ساتێك ئینسان توانی شوێنی دەقەكانی (قورئانی پیرۆز) و (سوننەت) بكەوێت، ئەوە نابێت خۆی لێ دەرباز بكات.

كەواتە: ئەگەر هاتوو كۆمەڵێك هەم مەعروفو هەم مونكەریشیان تێدابوو بەجۆرێك هیچ جیاوازییەكیان نەدەخستە نێوانیانەوە بەڵكو یان هەردووكیان

دەكرد، یان هەردووكیان واز لێ دەهێنا، ئەوە هەر لەخۆوە نابێت فەرمانیان بەچاكە پێ بكرێت و ڕێگری خراپەیان لێ بكرێت بەڵكو بەوردی سەیر دەكرێت: ئەگەر هاتوو چاكەكانیان زۆر تربوو ئەوە دەبێت فەرمانی چاكەیان پێ بكرێت ئیتر ئەگەر چی ئەو فەرمانەش خراپەیەكی بچكۆلەی لێ پەیدا ببێت ئەوە قەیدی نی یە، چونكە نابێت بەرهەڵستی لەخراپەیەك بكرێت ئەگەر هاتوو فەوتانی چاكەیەكی مەزنتری بەدواوە بو بەڵكو ئەم ڕێگیریە لەوكاتەدا وەك ڕێگرتنی خەڵكی وایە لە ئیسلام، یان وەك ئەوە وایە كە تێكۆشی بۆ گوێڕایەڵی نەكردنی خواو پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام ئەگەر ئەو كۆمەڵە، مونكەریان لەنێودا زۆرتر بوو ئەوە دەبێت بەرهەڵستی ئەو مونكەرە بكرێت ئیتر ئەگەر چی ببێتە هۆی لەدەست چوونی مەعروفێكی بچكۆلەتر چونكە فەرمان كردن بەو چاكەیەی كە خراپەیەكی گەورەتری لێ پەیدا دەبێت ئەوە فەرمان كردنە بەخراپە نەك بەچاكە وە تێكۆشانە بۆ سەرپێچی كردنی خواو پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ئەگەر (معروف و منكر) وەك یەك وابوون، بەشێوەیەك فەرمانكردن بە مەعروفەكە مونكەرێكی وەك خۆی لێ پەیدا دەبوو یان بەرهەڵستی كردن لە مونكەرەكە مەعروفێكی وەك خۆی بەهۆوە لەدەست دەچوو ئەوە لەو كاتەدا فەرمانیان پێ ناكرێ‌و ڕێگریشیان لێ ناكرێت چونكە جاری واهەیە فەرمانكردنەكە باشە، جاری واش هەیە ڕێگری كردنەكە باشە وەكاتی واش دەبێت هیچ كامیان باش نیە، ئەویش لەوكاتەدایە ئەگەر فەرمان كردن بەیەكێكیان مایەی هێنانەدی ئەویتر بوو بەڵام لە ڕوانگەی جۆری (معروف)و (مونكەر)ەكەوە ئەوە دەبێت فەرمان بە هەموو چاكەیەك‌و جڵەوگیری لە هەموو خراپەیەك بكرێت، مرۆڤێك یان كۆمەڵێك فەرمانی باشەیانی پێدەكرێ، ڕێگیری خراپەیانی لێ دەكرێت، لەسەر چاكە سوپاسیان دەكرێ‌و لەسەر خراپەش سەرزەنشتیان دەكرێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە: نابێت فەرمان كردن بەچاكەیەكی گەورەتر لەخۆی لە دەست دات، یان خراپەیەكی گەورەتر بهێنێت، پێشگیریكردن لەخراپەیەك نابێت ببێتە بایسی هێنانی خراپەیەكی گەورەتر لەخۆی، یان فەوتانی چاكەیەكی باشتر لەو.

هەر لەبەر ئەم حیکمەتەش بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردەم ڕازی دەبوو بە مانەوەی سەرکردەی دووڕووەکان (عبداللە ی کوڕی ابی)و هاوچەشنەکانی، چونکە:

یەکەم: خەڵکانێك هەبوو بەکوێرانە پشتیوانیان لێ دەکرد.

دووەم: لابردنی خراپەی (عبداللەی کوڕی ابی) بەجۆرێك لەسزادانی، دەبووە هۆی لەدەست دانی چاکەیەکی گەورەتر، بەهۆی توڕەبوونی خزمەکانی و بزواندنی ڕەگەز پەرستی تیایاندا.

سێیەم: خەڵکێکی زۆری بێ ئاگاو تێنەگەیشتوو لەئیسلام ڕایان دەکرد، ئەگەر بیانبیستایە پێغەمبەر (ﷺ) هاوڕێکانی خۆی دەکوژێت-ئەمەش پەیدابوونی خراپەیەکی گەورەتر بوو-.

چاکترین بنچینەش بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە لەدووخاڵدا دەستە بەر دەبێت.

١. دەبێ حەزو خۆشەویستی بۆ (معروف)ێك یان ڕق لێبوونەوەی لە مونکەرێك بەپێی خۆشەویستی خوای کاربەجێ بێت واتە: خوای دادگەر چۆن حەز دەکاتو چۆن بەرژەوەندی دینەکەی ئەوی تێدا دەبێت مرۆڤی مسوڵمان دەبێت وابکات نەك بەئارەزووی خۆی.

٢. وە دەبێت فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە بەئەندازەی تواناو هێزی خۆی بێت، چونکە خوای گەورە زیاد لەتوانای مرۆڤ داواناکات: ئەوەتا دەفەرموێت: (فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ) (التغابن:١٦) چونکە زۆر سەیرە، هی وەها هەیە خۆشەویستیو ڕقلێبوونەوەیو، حەزکردنو حەزنەکردنی بۆ ئیشێك بەپێی ئارەزووی خۆشەویستیو ڕقی خۆیەتی، نەك بەپێی فەرمان و ڕق و خۆشەویستی خودای دادگەر، بەڕاستی ئەمەش جۆرێکە لەشوێن کەوتنی ئارەزوو، بۆیەئەگەر مرۆڤی مسوڵمان وابکات ئەوە شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە، دەی خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنْ اللَّهِ) (القصص:٥٠) واتە: (کێ گومڕاترە لەوەی کەبەردەوام شوێنی ئارەزووی خۆی بکەوێت بەبێ هیچ ڕۆشناییەکی خوایی؟!

خۆی لەبنچینەدا خۆشویستنی مرۆڤ بۆ ئارەزووی خۆی بەرهەڵستی لێ نەکراوە، چونکە ئەوە شتێکی سروشتی خوا کردەیەو سەرزەنشتی مرۆڤی لەسەر ناکرێت، بەڵکو لەسەر شوێن کەوتنی ئارەزووەکە سەرزەنشتی دەکرێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: (يَادَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَاسِ بِالْحَقِّ وَلاَ تَتَّبِعْ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) (ص:٢٦) واتە: (داود: ئێمە تۆمان لەنێو زەویدا بەجێ نشین داناوە کەواتە: بەبەرنامەی خودا حوکم لەنێو خەڵکی دا بکەو شوێنی ئارەزوو مەکەوە چونکە شوێن کەوتنی ئارەزوو لەرێگەی خوا گومرات دەکات) وە دەفەرموێت: (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنْ اللَّهِ) واتە: (کێ یە گومراتر لەوەی کە بەبێ رێنموونییەکی خوایی شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت؟) وە پێغەمبەری سەروەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ثلاث منجيات: خشية الله في السر والعلانية، والقصد في الفقر والغني، كلمة الحق في الغضب والرضا، وثلاث مهلكات: شح مطاع، وهوي متبع، وإعجاب المرءِ بنفسه) (رواه الطبراني) واتە: (سێ شت ڕزگار کەرن: ترسان لەخوا بەئاشکراو نهێنی، ئیستیقامە لە هەردووك کاتی هەژاری و دەوڵەمەندیدا، وەوتنی وشەی حەق لە توڕەبوون و ڕازی بووندا، وە سێ شت هەن فەوتێنەرن: گوێڕایەڵی بۆ ڕەزیلی و پیسکەیی، شوێنکەوتنی ئارەزوو،سەرسوڕمانی مرۆڤ بەخۆی) وەشوێن کەوتنی ئارەزوو لەدنیادا سیفەتی جولەکەو هاوەڵ بڕیاردەرەکانە- اليهود والمشريكين- وەك خوای گەورە لەچەند ئایەتێکدا باسیان دەکات بۆنمونە دەفەرموێت: (فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنْ اللَّهِ) (القصص:٥٠) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ئەو بێ بڕوایانە وەڵامیان نەدایتەوە، ئەوا بزانە ئەوانە شوێنی ئارەزووەکانی خۆیان دەکەون، دەی کێ گومراترە لەوەی کە شوێنی ئارەزووی خۆی بکەوێت بەبێ ڕێنمونی یەکی خوای؟) وەدەفەرموێت: (يَاأَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ وَلاَ تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِنْ قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثِيرًا وَضَلُّوا عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ) (المائدة:٧٧) واتە: (ئەی خاوەن

کتێبەکان(جولەکە و نەصرانیەکان) لەبەرنامەکەتاندا بەناهەق تێمەپەڕێنن، وەشوێنی ئارەزووەکانی گەلێك مەکەون کە پێشتر گومڕابوون، وەخەڵکێکی زۆریشیان پێشتر گومڕاکردوو لەڕێگەی ڕاست لایان دا) وە دەفەرموێت: (وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى اللّهِ هُوَ الْهُدَى وَلَئِنْ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنْ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنْ اللّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ) (البقرة:١٢٠) واتە: (ئەی محمد (ﷺ) جولەکەو دیانەکان لێت ڕازی نابن هەتاکوو شوێن بەرنامەکەیان نەکەویت، تۆیش بڵێ: تەنها ڕۆشنایی خوا ڕۆشنایی یە (بەرنامەی خوا). وەئەگەر لەدوای ئەو زانیاریەی کە بۆت هاتووە شوێن ئارەزووەکانیان بکەویت ئەوە ئیتر لەلایەن خواوە هیچ پشتیوانیو یارمەتیەکت بۆ نیە) لەجێگەیەکی تردا دەفەرموێت: (وَلَئِنْ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنْ الْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَمِنْ الظَّالِمِينَ) (البقرة:١٤٥) واتە: (ئەگەر شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت، پاش ئەو زانیاریەی –وەحی– کە بۆت هاتووە، ئەوە کەواتە تۆ ئەی محمد (ﷺ) لە ستەمکارانیت) وە دەفەرموێت: (وَأَنْ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ) (المائدة:٤٩) واتە: (حوکمیان لەبەیندا بکە بەو بەرنامەی کە خوا ناردوویەتی، وە شوێن ئارەزووی ئەوان مەکەوە).

هەرلەبەر ئەمەشە هەریەکێك لەزانایان و خوا پەرستان ئەگەر لەداخوازی یەکانی (قورئانی پیرۆز)و (سوننەت) لابدەن، ئەوە بەخەڵکانی شوێنکەوتەی ئارەزوو لەقەڵەم دەدرێن، هەروەك پێشینانمان پێیان دەوتن: (اهل الأهوال).

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێکی مسوڵمان بڕوانێتە خۆشەویستی و ڕقی خۆی، وە بڕوانێتە ئەندازەی خۆشەویستیەکەی یان ڕقی بۆ شتێك و بزانێت ئایا لەگەڵ فەرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) گونجاوە یان نا؟ وە نابێت پێشی خواو پێغەمبەر (ﷺ) بکەوێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (لاَ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ) (الحجرات:١) دەی هەرکەسێك مەیلی بۆ کردەوەیەك ببزوێت، یان ڕقی لەکردەوەیەك بێت پێش ئەوەی خواو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ بکەن ئەوە جۆرێك لە خۆ خستنە پێش خواو پێغەمبەری(ﷺ) تێدایە.

## سیفەتەکانی ئەو کەسەی فەرمان بەچاکەو پێشگیری لەخرا پەدەکات[1]

فەرمان بەچاکە و جڵەوگیری لەخراپە لەفەرزترین‌و چاکترین‌و مەزنترین کردەوە چاکەکانە، وەکردەوەش نابێتە کردەوەی صالح هەتاوەکو دوو مەرجی تێدا نەبێت:

یەکەم: تەنها بۆ خوا بێت.

دووەم: بەپێی فەرمانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) بێت.

هەروەك (فضیلی کوری عیاض) لەتوێژینەوەی ئەم ئایەتەدا (لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً) دەفەرموێت: (کردەوە دەبێت ساغ و دروست بێت، چونکە کردەوە ئەگەر ساغ بوو بەڵام ڕاست نەبوو ئەوا وەرناگیرێت، بەڵکو دەبێت هەم ساغ و هەم ڕاستیش بێت،

ساغ: ئەوەیە تەنها بۆ خوابێت، ڕاست: ئەوەیە لەسەر سوننەت بێت).

کەواتە: ئەگەر ئەمەش سنوری هەمووکردەوەیەکی صالح بێت، ئەوەی فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە دەکات دەبێت خۆی ئەو مەرجەی تێدا بێت. واتە: (الاخلاص).

وەهەمدیسان دەبێت زانیاری هەبێت بەو چاکەو خراپەیە (المعروف و المنکر) وە جیاوازی نێوانیان، هەروەك (عمری کوڕی عبدالعزیز)- خوای لێ ڕازی بێت- دەفەرموێت: (من عَبَدَ الله بغیر علم، کان ما یفسد اکثر مما یصلح) واتە: (هەرکەسێك بەبێ زانیاری خوا بپەرستێت، ئەوەی کە تێکی دەدات زیاترە لەوەی کەچاکی دەکات) وە ئەوەی کە فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە دەکات پێویستی یەکی زۆری بەهەردووك سیفەتی (الرفق والحلم) هەیە، واتە: (بەبەزەیی و نەرمو نیانی)،وەك پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت: (ماکان الرفق في شيء الا زانهُ، ولا کان العنف في شيء الا شانه) (رواه المسلم)

[1] لێرەدا شێخی ئیسلام تەنها ئاماژەی بۆ چەند سیفاتێك کردووە، ئەگەر نا سیفاتی دیکەش هەن.

واتە: (نەرمونیانی لەهیچ شتێکدا نەبووە مەگەر جوانی کردەوە، وە توڕەیی‌و هەڵچونیش لەهەر شتێکدا بوبێت مەگەر ناشرینی کردووە). وە دەفەرموێت: (إن الله رفقٌ يحب الرفق في الأمر كله، ويعطي عليه ما لا يعطي على العنف) (رواه ابوداود وابن ماجه) واتە: (خوا هێدی‌و نەرمەو لەهەموو شتێکدا نەرمی‌خۆش دەوێت، وەئەوەی کەبەهۆی نەرمیەوە دەی بەخشێت بەهۆی توڕەبوون‌و هەڵچونەوە نایدات). پێویستە زۆر ئارامگرو دان بەخۆداگربێت – صَبُوراً– لەسەر ئێش‌و ئازارو ناڕەحەتی یەکان، چونکە لەوڕێگەدا توشی ئازارو ناسۆری هەر دەبێت. کەواتە: ئەگەر نەرمونیان و ئارامگر نەبێت ئەوە بەرهەمی تێکدانی لەبەرهەمموو پەرێزی چاککردنی زۆرترە، هەروەك لوقمانی حکیم بەکوڕەکەی دەگوت: (وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنْ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ) (لقمان:١٧) واتە: (ئەی کوڕی خۆم: فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە بکە، وەئارام بگرە لەسەر ئەوناڕەحەتیەی کەدێت بەسەرتا). هەربۆیەش خوای گەورە زۆرجار فەرمانی بە پێغەمبەران (عليهم السلام) کردوە بەئارامگرتن. کە دیارە ئەوان پێشەوایانی فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە بوون. وەك کۆتا پێغەمبەر (ﷺ) کەلەدوای ئەوەی خوای گەورە بەناردنی ئایەتی(اقرا) دەیکات بە پێغەمبەر، یەکسەر بەدوایدا ئەم ئایەتانەی بۆ دەنێرێت: (يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ(١)قُمْ فَأَنذِرْ(٢)وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ(٥) وَلاَ تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ (٦) وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ (٧) (المدثر:١-٧) واتە: (ئەی ئەوەی کە لەنوێندا خۆت داپۆشیوە، هەستەو خەڵك بترسێنە، وە پەروەردگاری خۆت بەمەزن بگرە وەجلەکانت پاکۆکە، واز لە پیسی –شرك– بێنە، وە زۆر منەت مەکە، وەلە بۆ پەروەردگارت ئارام بگرە).

سەیردەکەی سەرەتای ئایەتەکە بەوە دەکاتەوە کە فەرمانی پێ دەکات بەترساندن و ئاگادار کردنەوەی خەڵکی وە کۆتایی ئایەتەکە بەفەرمان کردن بەئارام گرتن دێنێ چونکە خودی خەڵك ترساندن لەسزای خوایی فەرمان

کردنه بەچاکەو جڵەوگیری کردنه لەخراپە کەواته لەو ڕێیەشدا پێویستی بەئارامگرتن هەیە. وە پێی دەفەرموێت: (وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا) (الطور:٤٨) واته: (لەبۆ فەرمانی پەروەردگارت ئارام بگرە چونکه تۆ لەژێر چاودێری ئێمەدای) وەدەفەرموێت: (وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلاً) (المزمل:١٠) واته: (ئەوەی بێ بڕوایان دەیڵێن ئارامی لەسەر بگرە، وازیان لێ بێنە واز هێنانێکی جوان) وەهەم پێی دەفەرموێت: (فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنْ الرُّسُلِ) (الاحقاف:٥٣) وەدەفەرموێت: (فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلاَ تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُوتِ) (القلم:٤٨) وەدەفەرموێت: (وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلاَّ بِاللَّهِ) (النحل:١٢٧)

وەدەفەرموێت: (وَاصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ) (هود:١١٥)[١] واته: (ئارام بگرە بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران نافەوتێنێت).

کەواته: ئەو مسوڵمانەی فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە دەکات دەبێت سێ مەرجی سەرەکی تێدا بێت:

یەکەم: (العلم)، زانیاری.

دووەم: (الرفق)، نەرمونیانی و بەزەیی بوون.

سێ یەم: (الصبر)، ئارام گرتن و لەخۆ بردن.

چونکە/ پێش فەرمان و بەرگری یەکە پێویستی بە زانیاری هەیە، نەرمونیانیش لەگەڵیدا، ئارام گرتن لەدوای فەرمان‌و بەگریەکە، هەروەك ڕیوایەتێك کە پێشینان داویانەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)وە (قاضی ابو یعلی)یش لەکتێبی(المعتمد) دا باسی کردووە کە ئەمەیە: ((لا يأمر بالمعروف وينهى عن المنكر إلا من كان فقيها فيما يأمر به، فقيها فيما ينهى عنه، رفيقاً فيما يأمربه، رفيقاً فيما ينهى عنه، حليماً فيما يأمربه، حليماً فيما ينهى

---

[١] هەموو ئەم ئایەتانە فەرمانن بۆ پێغەمبەر ﷺ بەئارامگرتن‌و لێبوردن. وەرگێڕ.

عنه)) واته: (بافەرمان بەچاکە نەکاو جڵەوگیری لەخراپە نەکات تەنها ئەو کەسە نەبێت کە: تێگەیشتووە لەوەی کە فەرمانی پێدەکات وە تێگەیشتووە لەوەی کە جڵەوگیری لێ دەکات، بەبەزەیی و نەرم و نیانە بەوەی کە فەرمانی پێ دەکات، هەروەها لەوەیش کە جڵەو گیری لێ دەکات).

وە پێویستە بزانرێت: کاتێك کە دەوترێت لەکاتی فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە دا پێویستە ئەم مەرجانە هەبن ئیتر ئەمە وادەکات لەزۆربەی خەڵکی کە بەشتێکی قورس و ناڕەحەتی بزانن، واگومان دەبەن ئیتر بەمە لەسەریان لادەچێ و سەرئەنجام دەڕۆن وازلە فەرمان بەچاکەو جڵەو گیری لەخراپە دێنن، دەی بێگومان زەرەرو و زیانێك کە لەمەوە سەر هەڵدەدات زۆرترە لەوەی کە فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە بەبێ ئەو مەرجانەش بکەن، چونکە وازهێنان لەفەرمانێك کەکردنی فەرز بێت سەرپێچیە وە فەرمان و بەرگریش بەبێ ئەو مەرجانەش هەر سەرپێچیە، دەی ئەوەی کە لەسەرپێچییەکەوە دەڕوات بۆ سەرپێچییەکی تر، ئەوە بەدەردی ئەو کەسە چووە کە لەتاو گەرمای خۆر پەنا بۆ ئاگر ببات، یان وەك ئەوە وایە لە بەرنامەیەکی پوچەڵەوە سەرنگەر بگوێزێتەوە بۆلای بەرنامەیەکی پوچەڵ تر،وەجاری واش هەیە دووەمیان لەیەکەم خراپترە، جاری واش هەیە بچوکترە، زۆر جاریش وەك یەك وان، بەهەمان پێوەدان ئەوەی کەکەم تەرخەمی دەکات لەفەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپەداوە ئەوەشی کە زیادە ڕەوی تێدا دەکات زۆرجار گوناهی ئەمیان لەئەویان گەورەترە، وەجاری واش هەیە وەك یەك وان.

## سەرهەڵدانی گیرو گرفتەکان سوچی گوناهو تاوانەکانە

شتێکی روونە ئەوەندەی خوا لە نەفسی خۆمانو بونەوەرو قورئاندا پیشانی داوین ئەوەیە کە سەرپێچی کردنی خوا تاکە فاکتەری توشبونو هێنانەی گیروگرفتەکانە، چونکە گیروگرفتە ئاڵۆزو نارەحەتەکان لە کردەوە پیسو بەدەکانەوە سەرچاوە دەگرن، هەروەك گوێڕایەڵی خوا هۆکاری سەرەکی نیعمەتەکانە، بێگومان کردەوەی جوانی بەندەکان هۆی ئەوەیە کەخوای گەورە بەزەیی پێیاندا بێتەوەو چاکەیان لەگەڵدا بکات، وەلێزمەبارانی لوتفو کەرەمی بەسەریاندا ببارێنێت.

ئەم ڕاستیەش لەچەند شوێنێکدا خوای گەورە ئامارەی پیێ کردووە، وەك دەفەرموێت: (وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ) (الشورى:٣٠) واتە: (هیچ گیروگرفتێك نەهاتووە بەسەرتاندا مەگەر سوچی کردەوەکانی خۆتان بووە وەخوا لەزۆر گوناهتان دەبورێت)، وەدەفەرموێت: (مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ) (النساء:٧٩) واتە: (هیچ نیعمەتێکت توش نابێت مەگەر لەلایەن خواوەیە، وەهەر ناخۆشی یەکت توش دەبێت ئەوە تەنها لەلایەن خۆتەوەیە) ،وەهەم دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنْكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ) (ال عمران:١٥٥) واتە: (ئەو مسوڵمانانەی کەلەڕۆژی بەرەنگار بونەوەی دوو کۆمەڵەکە(ئوحود)دا هەڵاتن، ئەوە شەیتان تەنها بەهۆی هەندێ تاوانی پێشوویانەوە خستنیە نێو ئەو هەڵە گەوەرەیەوەو پشتیان هەڵکرد وە ئەوانە خوای گەورە لێیان خۆش بووە) وە دەفەرموێت: (أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ)(ال عمران:١٦٥) واتە: (کاتێك ئەو گرفتە گەوەرەیە کەلە شەڕی"ئوحود"دا بەسەرتاندا هات (کە کوژرانی حەفتا صەحابی بوو) کە

پێشتر ئێوه دوو ئەوەندەتان بەسەر بێبڕواکاندا هێنا بوو (حەفتایان کوشت و حەفتایان ئەسیر گرت) دەتانوت: ئەم گرفتە گەورە لە کوێوەهات؟!! تۆش ئەی محمد(ﷺ) پێیان بڵێ: ئەوە لەلایەن خۆتانەوەبوو کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)تان کرد). وەلەشوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: (أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا وَيَعْفُ عَنْ كَثِيرٍ) (الشورى:٣٤) واتە: (ئەگەر خوا بیەوێت کەشتیەکانیان نقوم دەکات بەهۆی تاوانەکانیانەوە، وەلەزۆر گوناهو سەرپێچیان دەبورێت). وەدەفەرموێت: (وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ الإِنسَانَ كَفُورٌ) (الشورى:٤٨) واتە: (ئەگەر خوا بەهۆی تاوانەکانی خۆیانەوە-کەپێش خۆیانیان خستوە-دووچاری ناخۆشی یەکیان بکات ئەوە مرۆڤ لەوکاتەدا لەئاقار نیعمەتەکان بێبڕوا دەبێت) لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ) (الانفال:٣٣) واتە: (ئەی محمد (ﷺ) هەتاوەکو تۆ لەنێو ئەو خەڵکەدا بیت خوا سزایان نادات هەتاوەکو ئەوانیش داوای لێخۆشبوون بکەن هەر خوا سزایان نادات).

وەخوای گەوە بۆمان باس دەکات کە چۆن لەدوونیادا میللەتانی پێشوتر بەهۆی تاوانەکانیانەوە سزای داون، وەك: گەلی"نوح"و"عاد"و ثمود"و "گەلی لوط"و"ئەصحابی مەدینە"و"گەلی فرعەون" وەبۆی باس کردووین کەلە دواڕۆژیشدا چۆن سزایان دەداتو سەرەنجامی گەندەڵیان چۆن دەبێت؟!.وەك خوای گەورە لەسەر زووبانی ئەو پیاوە بڕوادارەی کە لەناو خانەوادەی فیرعەوندا بوو بۆمان دەگێڕێتەوە: (يَاقَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ مِثْلَ يَوْمِ الأَحْزَابِ(٣٠)مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِلْعِبَادِ(٣١)وَيَاقَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِي(٣٢)يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُمْ مِنْ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ وَمَنْ يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ(٣٣) (الغافر٣٠-٣٣) واتە: (ئەی گەلەکەم من دەترسێم ئەوەی هات بەسەر میللەتانی پێشتردا

بەسەر ئێوەشدا بێت وەك خووخدەی پیسی گەلی "نوح" و"عاد"و "ثمود"ئەوانی دوای ئەوانیش کە پێغەمبەرانی خۆیانیان بەدرۆ زانی بەڕاستی خوا ویستی ستەمکردنی بۆ بەندەکانی خۆی نییە، ئەی گەلەکەم من مەترسیم هەیە لە ئێوە بۆ ڕۆژی بانگ کردن (ڕۆژی قیامەت)، ئەو ڕۆژەی کەبەپەلە ڕادەکەن پشت هەڵدەکەن بەشێوەیەك لاناکەنەوە بەلای دوادا، وە ئەو ڕۆژە هیچ کەسێکتان نی یە کە چەپاڵەتان بدا و سودتان پێ بگەیەنێت بەڕاستی هەرکەسێك خوا گومڕای بکات ئەوە هیچچ ڕێنمایی نیشاندەرێکی نیە). وەلەمەڕ باسکردنی داستانی ئەو کۆمەڵەی کە بێستانێکیان هەبوو هیچ مافێکیان بۆ هەژاران لێ دەرنەدەکرد دووچاری سزای خوایی بوون دەفەرموێت: (كَذَلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ) (القلم:٣٣) واتە: (وە بەوشێوە بۆ هەرکەسێك بەوچەشنە بێت سزای خوایی هەیە وە بەڕاستی سزای دواڕۆژ گەورەترە ئەگەر بزانن). وەسەبارەت بەدەغەڵەکان-دووڕووەکان- دەفەرموێت: (سَنُعَذِّبُهُمْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَى عَذَابٍ عَظِيمٍ) (التوبة:١٠١) واتە: (ئێمە دووجار سزایان دەدەین، لە دونیا بەگیروگرفت وە لەوەختی مردن، پاشانیش دەگەڕێنەوە بۆلای سزایەکی گەورە -لەقیامەتدا-) وە دەربارەی بێ بڕواکان دەفەرموێت: (وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنْ الْعَذَابِ الأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) (السجدة:٢١) واتە: (پێش سزا سەخت و گەورەکەی قیامەت هەر لەدوونیادا دووچاری جۆرەها سزایان دەکەین تا بەڵکوو بگەڕێنەوە). هەرلەم سۆنگەیەوە دەبینین خوای گەورە لەزۆربەی ئەو سورەتانەی کە ترسێنەرن باس لەوە دەکات کە چۆن تاوانبارن، لەدونیادا سزا دەدات و وە چی بۆ ئامادەکردوون لەدواڕۆژدا؟!! جاری واش هەیە تەنها تۆڵەی دوا ڕۆژ باس دەکات.

## خەڵکی لەئاست فەرمان بەچاکەو جڵەو گیری لەخراپەدا سێ بەشن

خەڵکی بەگشتی لەمەڕ فەرمان و ڕێگرتندا سێ کۆمەڵن:-

کۆمەڵی یەکەم: کۆمەڵێکن تەنها بۆ هەواو ئارەزووی خۆیان ڕادەپەڕن‌و هەڵوێست دەنوێنن، ڕەزامەندییان تەنها لەوەدایە کە شتیان پێبدرێت وە توڕەش نابن تەنها لەبەر ئەوەنەبێت کە شتیان لێ قەدەغە بکرێت وەهیواشیان هەیە ئەگەر حەزی لە شتێك کردوو پێی درا ئیتر ئەو شتە حەڵاڵ بێت یان قەدەغە کراو ئەوە یەکسەر ڕقەکەی دەڕواو خۆش حاڵ و ڕەزامەندە،وە ئەو شتەی کە جاران لەلای شتێکی خراپ‌و بەمونکەری دەزانی‌و بەرهەڵستی لێدەکردو ئەوەی کە بیکردبا لەسەری سەرزەنشتی دەکردلای دەبێت بەشتێکی باش و ئەنجامی دەدات و هاوەڵ و یارمەتیدەریەتی وە ئەوەش کە جڵەو گیری هەمان مونکەر بکات، ئەمجا ئەم دەبێتە بەرهەڵست‌و دوژمنی، وە بەڕاستی زۆرینەی هەرەزۆری خەڵکی بەم جۆرەن!

کۆمەڵی دووەم: ئەمانەش کۆمەڵێکن دینێکی ڕاست‌و ساغیان هەیە، وە بەشێوەیەکی پاك‌و بۆ خوا فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە دەکەن، هەمیشەو هەردەم چاکسازن لەوەی کەئەنجامی دەدەن وە لەسەری بەردەوامن‌و ئەگەر لەو پێناوەشدا ئەزیەت و ئازاریشیان بدرێت لەسەری ئارامدەگرن، ئەمانەش ئەو کۆمەڵەن کەئیمانێکی ڕاستیان هێناوەو هەردەم کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن وەئەمانە ئەو کۆمەڵەن کە چاکترینی ئوممەتن هاتبنە نێو خەڵکی فەرمان بەهەموو چاکەیەك و جڵەو گیری لەهەموو خراپەیەك دەکەن.

کۆمەڵەی سێیەم: ئەمانەش کۆمەڵە خەڵکێکن سیفەتی کۆمەڵی یەکەم‌و کۆمەڵی دووەمیشیان تێدا ئاوێتە بووە وە ئەمانە زۆرینەی بڕواداران‌و دین‌و ئیمانیان هەیەو بەڵام ئارەزوویان زاڵە، بۆیە لەنێو دڵیاندا هەم ویستی گوێڕایەڵی‌و هەم ویستی سەرپێچی خوا کۆبووەتەوەو وە هەرجارەش یەکێکیان زیاتر زاڵ دەبێت‌و فراژوو دەبێ.

ئەمە پۆلێنکردنی خەڵکی بوو بۆ سێ جۆر هەروەك چۆن دەروونی مرۆڤەکان بەگشتی سێ جۆرە:

یەکەم/(دەرونی ئەممارە): ئەمە هەمیشە فەرمان بەخاوەنەکەی دەکات بەخراپە.

دووەم/ (دەروونی موطمەئینە): ئەمیش هەمیشەو دەرهەم فەرمانی چاکەی پێ دەکات.

سێیەم/ (دەروونی لەووامە): ئەمیش هەردەم سەرزەنشتی خاوەنەکەی دەکات لەسەر کردنی خراپەو چواندنی چاکە.

جۆری یەکەم دەروونێکی (ئەممارە) یان هەیە،کە هەمیشە فەرمانی خراپەیان پێ دەکات، جۆری دووەمیش (موطمەئینە)یان هەیە ئەو دەروونە بێدارەی پێی دەفەرموێت: (يَاأَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ(٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً(٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي(٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي(٣٠) (الفجر٢٧-٣٠).

جۆری سێیەمیش دەرونێکی (لەووامە)یان هەیە، کە گوناهو تاوان دەکات و پاشان سەر کۆنەی خاوەنەکەی دەکات و کردەوەی چاك ئاوێتەی هی خراپ دەکات جا هەر لەبەر ئەمەش بوو کە خەڵکی لەسەردەمی (ئەبوبەکرو عومەر)دا –خوایان لێ ڕازی بێت– لەبەرئەوەی لەسەردەمی زێڕینی پێغەمبەر (ﷺ) وە نزیك بوون، وەئیمان و بۆخوا سوڵحانیان زۆرتر بوو بۆیە دەبینی هیچ وەیشومەو فیتنەیەك ڕووی نەدا، چوونکە زیاتر لە جۆری کۆمەڵەی دووەم بوون بەڵام لەملاشەوە لە جێنشینایەتی (عثمان وعلی)دا (خوایان لێ ڕازی بێت) لەبەرئەوەی خەڵکی لەجۆری کۆمەڵی سێ یەم زۆرتربوو وە لەگەڵ بڕواودینەکەیاندا ئارەزوو گومان (الشهوة والشبهة)یشیان ئاوێتە بوو بوو. وردە وردە ئەم حاڵەتە لەنێوان سەرکردە و جیلی خوارەوەشدا تەشەنەی کرد بۆیە دەبینی وەیشومەو فیتنە گەورەیەی لێوە پەیدا بوو کە هۆکارەکەی دەگەڕایەوە بۆ کەمبونەوەی ئاستی "تەقوا"و گوێڕایەڵی بۆ خوا، وە تێکەڵاوبونیان بەجۆرێك لە ئارەزوو سەرپێچی لە هەردوولاوە، وە هەریەکەیان

وای لێکدەدایەوە کە فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە دەکات، لەگەڵ ڕاستی و دادپەروەریدایە.

بەڵام لەگەڵ ئەو تەئویلەدا جۆرێك لە شوێنکەوتنی ئارەزوو هەبوو، ئەگەرچی هەریەکێك لەو دوو کۆمەڵە باشترو نزیکتر بوو لە حەقەوە لەویتر.[1]

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو بڕوادارێك کە هەمیشە پەنا بەخوا ببات و پشتی پێ ببەستێت لەوەدا کە خوای گەورە بەردەوامی بەدەرونی بداو لەڕێی ڕاست لای نەدات، وە لەسەر جادەی لەخواترسان و هیدایەت هەردەم ئارامگری کات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لأَعْدِلَ بَيْنَكُمْ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ) (الشورى:١٥)

واتە: تەنها خەڵك بۆ لای ئەو بەرنامە بانگ بکە کە بۆمان ناردویت، وەك چۆن فەرمانت پێکراوە ئاوا ڕاست ڕاوەستاو بە، وە شوێن ئارەزووی ئەوان مەکەوە، وە بڵێ: بڕوام هێناوە بەو پەڕاوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە، وە فەرمانم پێکراوە کە دادپەروەری لە نێوانتاندا بەرپاکەم، وە بڵێ: خوا پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشە).

---

[1] من پێم وایە (ئیبن تەیمیە) لەو مەسەلەیەدا نەیپێکاوەو زۆر خاتری (معاویة)و کۆمەڵەکەی گرتووە، چونکە لە چەندان فەرموودەدا هاتوە کە (معاویە)و کۆمەڵەکەی یاخیبوان (بغاة)ن، بۆ نمونە (ویح عمّار تقتله الفئة الباغية) رواه مسلم.. جا مادام (علی) خەلیفە بێ و (معاویة) باغی، نەدەبوو شوێنکەوتنی ئارەزوو پاڵ بدرێتە لای هەردوکیان. م.علی باپیر.

## سەرزەنشتکردنی ترسنۆکیو پیسکەیی ـ الجبن والبخل ـ

لە قورئانو سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ سەرزەنشتی پیسکەییو ترسنۆکی زۆر کراوە، وە مەدحو پیاهەڵدانی ئازایەتیو بەخشینو لەخۆبوردنیش زۆر کراوە (بەمەرجێك ئەو ئازایەتیو لەخۆبوردنە لەپێناو ڕێگای خوادا بێت نەك ئەوەی کەلە پێناو ئەودا نیە) پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (شر ما فى المرء شح هالع وجبن خالع) - رواه احمد وابو داود- واتە (خراپترین سیفەت لە مرۆڤدا ڕەزیلییەکی خەفەت بارکەرو ترسنۆکیەکی ڕوخێنەرە) وە لە ڕیوایەتی ڕاستەوە هاتووە کە (جابری کوڕی عبدالله) بە (ابوبکری صدیق)ی وت: یان پێم ببەخشەو دەستگیرم بکە، یان پیسکەیم لەگەڵکە، ئەویش بەسەرسوڕمانەوە فەرمووی: پیسکەیم لەگەڵکە باشە چ دەردێك لەدەردی پیسکەیی خراپترە؟! (بخاری). جا سەیریکە پیسکەیی بەخراپترین نەخۆشی داناوە! پیسکەییو ڕەزیلیش چەند جۆرێکن (گەورەو بچکۆلە) وە لەچەند ئایەتێکی قورئاندا سەرزەنشتی پیسکەیی کراوە. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (ال عمران:١٨٠).

واتە: (با ئەو کەسانەی کە پیسکەیی دەکەن لەوەی خوا پێی بەخشیون وایدانەنێن کە ئەوە شتێکی باشە بۆیان بەڵکو ئەو پیسکەییە خراپە بۆیان، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئەو سەروەتو سامانەی کە پیسکەییان تیادا کردوە، دەکرێتە گەردنیانەوە[1] وە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ مَنْ كَانَ مُخْتَالاً فَخُورًا(٣٦)الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ) (النساء:٣٦-٣٧)

واتە: خوا مرۆڤی خۆ بەگەورەزانو خۆهەڵنەری خۆش ناوێت، ئەوانەی کە پیسکەیی دەکەن وە فەرمان بەخەڵکی دەکەن بە پیسکەیی)، وە دەربارەی

---

[1] پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (من آتاه الله مالا فلم يؤد زكاته مثل له شجاعا اقرع، له زبيبتان يطوقه يوم القيامة، يأخذ بلهزمتيه، -يعني شدقية- ثم يقول: انا مالك انا كنزك ثم تلا هذه الآية (ولا يحسبن الذين يبخلون بما آتاهم...) اخرجه البخاري. مختصر تفسير إبن كثير م١ ص٣٤١. وەرگێڕ.

دووڕووەکان دەفەرموێت: (وَمَا مَنَعَهُمْ أَنْ تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَاتُهُمْ إِلاَّ أَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ وَلاَ يَأْتُونَ الصَّلاَةَ إِلاَّ وَهُمْ كُسَالَى وَلاَ يُنفِقُونَ إِلاَّ وَهُمْ كَارِهُونَ) (التوبة: ٥٤) واتە: هیچ شتێك نەبوەتە هۆی ئەوەی کە ئەمانە بەخشینەکانیان لێ وەرنەگیرێت، تەنها ئەوە نەبێت کە بێ بڕوابوونە بەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺ،وە نایەن بۆ ئەنجامدانی نوێژ مەگەر بەتەمەڵییەوە دێن، وە هیچ شتێك نابەخشن مەگەر پێیان ناخۆشەو پیسکەیی تێدا دەکەن) وە دوبارە دەربارەیان دەفەرموێت: (فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوا وَهُمْ مُعْرِضُونَ) (التوبه:٧٧) واتە: کاتێك کە خوای گەورە لە موڵکی خۆی پێی بەخشین ئەوان ڕەزیلییان تێدا کردو لێیان نەبەخشی، وە پشتیان کردە فەرمانبەری خواو کەوتنە دژایەتی ئیسلام[١]. وە دەفەرموێت: (وَمَنْ يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَنْ نَفْسِهِ) (محمد:٣٨) واتە: (هەرکەس ڕەزیلی بکات ئەوە تەنها ڕەزیلی لەخۆی دەکات، بەوەی کە پاداشتی کەم دەبێتەوەو لەدواڕۆژدا ڕەنج بەخەسارە [٢]) وە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) (التوبة: ٣٤).

واتە: (ئەوانەی کە ئاڵتوون و زیو کۆدەکەنەوەو لەپێناو ڕێگەی خوادا لێی نابەخشن ئەوە موژدەی سزایەکی بەئێشیان بدەرێ[٣]).

وەهەرچی لە (قورئاندا) کە فەرمان بە ماڵ بەخشین دەکات و لۆمەی ئەوانە دەکات کە ماڵ نابەخشن، هەرهەمووی سەرزەنشتکردنی ڕەزیلی و پیسکەییە..

وە خوای پەروەردگار زێدەجار سەرزەنشتی ترسنۆکیشی کردووە، وەك دەفەرموێت: (وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنْ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ) (الأنفال:١٦)

واتە: (هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی جەنگ) بشکێ و پشت بکاتە بێبڕوایان، تەنها مەگەر بە فێڵ نەبێت کە بیەوێ بگەڕێتەوەو لێیان داتەوە، یان خۆی بگەیەنێ بە

---

[١] الجامع لأحكام القرآن، القرطبي م٨ ص٢١٢. وەرگێڕ

[٢] الجامع لأحكام القرآن، القرطبي م٨ ص٢١٢. وەرگێڕ

[٣] الجامع لأحكام القرآن، القرطبي م٨ ص٢١٢. وەرگێڕ

کۆمەڵێکی تر بۆ لێدانی دوژمن، ئەوە تووشی تورەیی خوا بووەو مەنزڵگای ـوارۆژی نێو ئاگری بەکڵپەی جەهەننەمە کە خراپترین مەنزڵگایە).
وە سەبارەت بە دوڕووەکان، –المنافقين– دەفەرموێت: (وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنْكُمْ وما هُمْ مِنْكُمْ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ(٥٦)لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلاً لَوَلَّوْا إِلَيْهِ وهُمْ يَجْمَحُونَ) (التوبة: ٣٣–٣٤). واتە: (ئەو دوو ڕووانە سوێند دەخۆن بە خوا کە لە ئێوەن، بەڵام ئەوانە لە ئێوە نین، بەڵام کۆمەڵێکی ترسنۆکن، وە ئەو دوڕووانە لە ترسان ئەگەر پەناگەیەکیان دەستکەوێت یان چەند دۆڵ یان کونێك لە زەویدا، ئەوە بەپەلە ڕوی لێدەکەن و خۆیان دەشارنەوە)
وە دەربارەیان دەفەرموێت: (فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنْ الْمَوْتِ) (محمد:٢٠).
واتە: (ئەگەر بێت و سوڕەتێکی ئاشکرا دابەزێ و باسی فەرزبوونی جەنگی تێدا کرابێت، ئەوە دەبینی ئەوانەی کە دڵەکانیان نەخۆشی (نفاق)ی تێدایە سەیرت دەکەن ئەی محمد ﷺ وەك سەیرکردنی کەسێك لە ترسی مردن بوراوەتەوە، خوای بە توانا دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمْ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلاَ أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنْ اتَّقَى وَلاَ تُظْلَمُونَ فَتِيلاً) (النساء:٧٧).
واتە: (ئایا نابینی ئەوانەی کە لە شاری مەککە پێیان وترا دەستتان بنوقێنن نوێژ بکەن و زەکات بدەن، واتە: جەنگ مەکەن و ڕووبەڕویان مەبنەوە، وە کاتێك کە (جیهاد)یان لەسەر فەرزکرا، کۆمەڵێکیان هەبوو وەك چۆن لە خوا دەترسان واش لە خەڵکی دەترسان بەڵکو زیاتریش، وە وتیان: پەروەردگارمان ئەوە بۆچی ئێستا (جیهاد)ت لەسەر فەرز کردین، بەڵکو کەمێك دوات خستایە، (واتە: فەرزبوونی جیهادت دوا خستایە) تۆش پێیان بڵێ: خۆشی ئەم دنیایە کەمە، وە ژیانی دواڕۆژ(بەهەشت) باشترە بۆ کەسێك کە لەخوادەترسێت وە بەئەندازەیەکی کەمیش ستەمتان لێناکرێت).

وەهەرچی لە (قورئان)دا هاتبێت لەمەڕ هاندان بۆ جیهادو برەوپێدانیو لۆمەو سەرزەنشتکردنی ئەوانەی کە کەمتەرخەمی تێدا دەکەنو وازی لێدێنن، هەمووی لۆمەو سەرزەنشتکردنی ترسنۆکی دەگرێتەوە، وە لەبەرئەوەی کە بەرژەوەندی مرۆڤەکان لە دینو ژینیاندا بە ئازایەتیو بەخشین نەبێت نایەتە دی، بۆیە خوای دادگەر ڕوونی کردۆتەوە هەرکەسێكو کۆمەڵێك پشت لە جیهاد بکەن، ئەوە خوای باڵادەست ئەوان لادەباتو کۆمەڵێکی تر دێنێت کە بەو ئەرکانە هەستن، وەك دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنْ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ(٣٨)إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (التوبة:٣٨-٣٩).

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ئەوە چیتانە ئەگەر پێتان بوترێت، دەربچن بۆ جیهاد لە ڕێگەی خوادا، خۆتان بە قورسیی بە زەوییەوە دەچەسپێنن؟! ئایا ئێوە ڕازی بوون بە ژیانی کەمی دونیا لەچاو خۆشی ژیانی دواڕۆژدا؟! دەی بەڕاستی ژیانی دونیا لەچاو ژیانی دواڕۆژدا زۆر کەمە، وە ئەگەر ئێوە دەرنەچن بۆ جیهاد ئەوە خوا سزایەکی بە ئێشتان ئەدات، وە ئێوە لادەباو کۆمەڵێکی دیکە دێنێت، وە ئێوەش بەو پشت هەڵکردنەتان هیچ زەرەرێك بەخوا ناگەیەنن، وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵەو بەتوانایە). وە دەفەرموێت: (هَاأَنْتُمْ هَؤُلاَءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنْكُمْ مَنْ يَبْخَلُ وَمَنْ يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَنْ نَفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمْ الْفُقَرَاءُ وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لاَ يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ) (محمد:٣٨).

واتە: (ئێوە ئەو کەسانە بوون کە پێتان دەوترا بۆ ئەوەی سەروەت ببەخشن لە ڕێگەی خوادا، هەتان بوو ڕەزیلی دەکرد، وە هەرکەس ڕەزیلی بکات ئەوە تەنها زیانی بۆ خۆیەتی، بەڕاستی خوا دەوڵەمەندەو ئێوە هەژارن، وە ئەگەر ئێوەش پشت هەڵبکەن ئەوە خوا ئێوە دەگۆڕێو لاتان دەباو کۆمەڵێکی دیکە دێنێو پاشان ئەو کۆمەڵە وەك ئێوە نابن).

به ئازایەتیو بەخشین پێشینانمان بەرزو بڵندبوونەوە، وەك خوا دەربارەیان دەفەرموێت: (لاَ يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنْ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلاً وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى) (الحديد:١٠).
واتە: (وەك یەك نین ئەوانەی پێش فەتحی "مەککە" سەروەتیان بەخشیو جەنگیان کرد، وە هەموویان خوا بەڵێنی چاکە (بەهەشت)ی پێداون).
وە ئازایەتیش بریتی نییە لە هێزی لاشە، بەڵکو تەنها هێزی دڵو ئارامگرتنیەتی، چونکە زۆر جار پیاوی وا هەیە لاشەی بەهێزە بەڵام دڵی لاوازە، وە شەڕی ڕووبەڕووبونەوە بە هێزی لاشەو بەهێزی دڵەوە بەندە، وە بەگەڕخستنی هەردوك هێزەکەش کاتێك باشەو بەسودە کە چاوساغیو لێزانینی لەگەڵدا بێت، نەك هەڵچونێك کە خاوەنەکەی بیری لێ ناکاتەوەو جیاوازی ناخاتە نێوان خاوەن سودو بێ سودەوە، هەربۆیەش ئازاو بەهێزیش ئەوەیە کە لەکاتی توڕەبوندا جڵەوی خۆی بگرێت هەتاکو بۆی دەرکەوێت چی بەرژەوەندی تێدایە ئەوە بکات، بەڵام ئەوەی لەکاتی توڕەبونیدا خۆی ناگرێت، ئەوە نە ئازایەو نە بەهێزیشە.
وە خوای کاربەجێ زۆر ستایشی ئازایەتیو بەخشینی کردووە، وە زێدەجار پیایدا هەڵداوە، بەمەرجێك ئەو ئازایەتیو بەخشینە تەنهاو تەنها لەپێناوی خوادا بێت، وەك (أبو موسى) خوای لێ ڕازی بێت، دەفەرموێت: (قيل: يا رسول الله ﷺ، الرجل يقاتل شجاعة، ويقاتل حمية، ويقاتل رياء، فأي ذلك في سبيل الله ﷺ؟ فقال: من قاتل لتكون كلمة الله عي العليا، فهو في سبيل الله). البخاري ومسلم.
واتە: (وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوی وا هەیە لەبەرئەوەی پێی بوترێ ئازایە، جەنگ دەکات، وە پیاوی واش هەیە لەبەر دەمارگیری جەنگ دەکات، وە هی واش هەیە لەبەر ڕوپامایی جەنگ دەکات، ببینرێت، کام لەمانە لەپێناو خوادایە؟ ئەویش فەرمووی: هەرکەسێك جەنگ بکات لەبەرئەوەی تەنها وشەی خوا بەرز بێت، ئا ئەوە تەنها بۆ خوایەو لەپێناو خوادایە). وە خوای تۆڵە ئەستێن دەفەرموێت: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ) (الأنفال:٣٩). دەی بێگومان ئەمەش کە بەرنامە تەنها بۆ خوا بێت ئەو تاکە مەبەستەیە

دروستکراوەکانی بۆ خولقێنراوە، وە هەرچیش لەپێناو هێنانەدی ئەوەدا بێت کە مرۆڤی بۆ خولقێنراوە، ئەوە لەلای خوا ستایش کراوەو هەر ئەوەش لە بۆ خاوەنەکەی دەمێنێتەوە.

لەبەرئەوە خەڵکی لەم سۆنگەیەوە پۆلێن دەکرێن بۆ چوار کۆمەڵ:

یەکەم/ ئەوانەی کە بە (ئازایەتی)و (بەخشین)ەوە بۆ خوا کار دەکەن، ئەمەش ئەو بڕوادارانەن کە شایستەی بەهەشتن.

دووەم/ ئەوانەی کە بە (ئازایەتی)و (بەخشین)ەوە، کار بۆ غەیری خوا دەکەن، ئەمانەش لە دونیادا بەم کارەیان سودمەند دەبن، بەڵام لە (قیامەت)دا هیچ بەشێکیان بۆ نیە.

سێیەم/ ئەوانەی ئیش بۆ خوا دەکەن، بەڵام بێ بوونی (ئازایەتی)و (بەخشین)، ئەمانەش بەو ئەندازەیە (نیفاق)یان تێدایەو بڕواکەیان نوقسانە.

چوارەم/ ئەوانەی بۆ خوا ئیش ناکەن، وە (ئازایەتی)و (بەخشین)یشیان نیە، ئەمانەش نە دونیایان هەیەو نە قیامەت.

لە ڕاستیدا ئەم ئاکارو بەها جوانانە –ئازایەتیو، بەخشین، دوریی لە ترسنۆکییو، پیسکەیی– موسڵمان بە گشتی پێویستی پێیانەو دەبێ خۆی پێیان برازێنێتەوە، بە تایبەتیش لە وەختی فیتنەو تاقیکردنەوەی توندا، چونکە موسڵمانان لەکاتی سەرهەڵدانی فیتنەدا پێویستیان بەوە هەیە کە خۆیان باش بکەنو گوناهو تاوان لە خۆیاندا لابەرن، وە بەهەمان شێوە بە ئەندازەی تواناش فەرمان بەچاکەو ڕێگریش لە خراپە بکەن، دەی بێگومان هەریەك لەم دوانەش نارەحەتیو قورساییان تێدایە، ئەگەرچی بۆ هەر کەسێ خوا لەسەری ئاسان بکات ئاسانیشە.

## وازهێنان له فەرمان به چاكەو ڕێگریی له خراپه بەیەكجاری له ترسی دروستبوونی ( فیتنه ) بۆچونێكی هەڵەیه

لەبەرئەوەی حاڵەتی فەرمان بەچاكەو جڵەوگیری لەخراپەو جیهاد لەڕێی خوادا كۆمەڵە تاقیكردنەوەو ناڕەحەتییەكیان تێدایە كه مرۆڤ دووچاری فیتنه دەكات، بۆیه زۆر له خەڵكی لەكاتێكدا واز لەو فەرزه دێنێت پاساوو بیانو بەوە دێنێتەوە كه بۆیه وازی هێناوە لەبەرئەوەی خۆی له فیتنه بپارێزێت!! هەروەك خوای گەورە لەبارەی دوڕووەكان (المنافقین) دەفەرموێت: (وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلاَ تَفْتِنِّي أَلاَ فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا) (التوبة:٤٩)

واته: (ئەی محمد ﷺ هەندێك لەو دوو ڕووانه پێت دەڵێن: مۆڵەتم پێبدە بۆ دانیشتنم له جیهاد (شەڕی تەبوك)، وە توشی فیتنەم مەكە، دەی ئاگاداربە ئەوانه بەدانیشتنیان له جیهادەكە كەوتونەتە ئەصڵی فیتنەوە). له تەفسیری قورئاندا هاتووە كه ئەم ئایەتە دەربارەی (جەددی كوڕی قەیس) هاتوەتە خوارەوە ئەمەش كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكرد به خۆ گورجكردنەوەی بۆ شەڕی ڕۆمەكان، ڕۆمەكانیش ئافرەتی زۆر كەشخەو جوانیان هەبوو، بۆیه ئەویش له وەڵامیدا بۆ پێغەمبەر ﷺ وتی: (من پیاوێكم له ئاست ئافرەتاندا دان به خۆدا ناگرم، وە دەترسێم بەهۆی ئافرەتە ڕۆمییەكانەوە توشی فیتنه ببم، بۆیه مۆڵەتم پێبدە به نەهاتنم بۆ ئەم شەڕەو مەمخە نێو فیتنەوە، خوای گەورەش دەربارەی (جەدد) ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: (وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلاَ تَفْتِنِّي أَلاَ فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا) (التوبة:٤٩)

خوای بەرز لەسەر زوبانی ئەم كابرایه باس دەكات كه داوای دانیشتنی كردوە بۆ ئەوەی له شوێنی جیهادەكەدا دوچاری فیتنەی ئافرەتان نەیەت، بۆیه دەڵێت (ولا تفتنی) واته: توشی فیتنەم مەكە، بەڵام خوای زاناش

دەفەرموێت: (أَلاَ فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا) واتە: خودی پشتکردنە ئەو جیهادەی کە واجبە، وە ئەو ئیمانە لاوازەی کە وازهێنانی جیهادەکەی بۆ جوان کردوە.
ئا ئەوە فیتنەیەکی گەورەترە کە نوقمی بووە، ئیتر چۆن چۆنی داوای خۆپاراستن لە فیتنەیەکی بچکۆلە دەکات کە جارێ هەر نەهاتووە بەسەریشیدا، بە کەوتنە ناو فیتنەیەکی گەورە کە ئێستا دوچاری بووە[1]
خوای زاناو پەنهان بین دەفەرموێت: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّه) (الأنفال:٣٩) واتە: (جەنگیان لەگەڵ بکەن، هەتاکوو فیتنە نەمێنێ و گەردن کەچیی[2] هەرهەمووی تەنها بۆ خوا بێت)[3]
کەواتە:
هەرکەس وازی لەو جیهادە هێنا کە خوای کاربەجێ کردویەتیە ئالەتی نەمانی (فیتنە) بە بیانووی ئەوەی کە دوچاری (فیتنە) نەبێت، ئەوە خۆی کەوتۆتە نێو (فیتنە)وە، ئەویش بەهۆی نەخۆشی دەروونی و گومانی دڵی و وازهێنانی لەو جیهادەی کە خوا فەرمانی پێکردووە.
بۆیە ورد بیر بکەنەوە چاك لەم بابەتە ڕامێنن، چونکە ئەمە بابەتێکی مەترسی لێکراوەو خەڵکیش لەم سۆنگەوە دەبنە چەند بەشێکەوە:

---

[1] مەبەست لەوەیە کە بینینی ئافرەتان و تێکەڵاوبونیان فیتنەیەکی بچوکە، بەڵام وازهێنان لە جیهاد فیتنەیەکی گەورەیە، دەی ئەم دەڵێ با من توشی ئەو فیتنە بچوکە نەیەم لەهەمان کاتدا کەوتۆتە فیتنەیەکی گەورەترەوە کە واز لێهێنانی جیهادو دواکەوتنە لە پێغەمبەر ﷺ، دەیەوێت خۆی لە فیتنەیەك بپارێزێت بەهەڵگرتنی فیتنەیەکی گەورەتر لەو!! وەرگێڕ

[2] لێرەدا (دین) بەمانای گەردن کەچیە بۆ ئیسلام، با کابرا کافریش بێ (اهل الذمة) ئەگەر نا (دین) بەمانای ئیسلام هەر هی خوایە هەمیشە. م.علی باپیر

[3] ئەگەر سەرنجی ئەو ئایەتە بدەین دەبینین جیهادی کردۆتە هۆی بنبڕکردنی فیتنە نەك جیهاد بێتە هۆی فیتنە، چونکە ئەو تێگەیشتنە پێچەوانەی فەرمایشتە خواییەکەیە!! وەرگێڕ

بەشی یەکەم/ ئەوانە فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری دەکەنو هەروەها جەنگ نەکەن بەنیازی ئەوەی کە (فیتنە) نەهێڵن، بەڵام هەمان کردەوەی خۆیان فیتنە)یەکی گەورەترە، ئەمانەش وەك ئەوانەیکە شەڕیان کرد لەو فیتنە)یەی نێوان ئوممەتی ئیسلامدا..

بەشی دووەم/ ئەوانەش کۆمەڵێکن بەیەکجاری واز لە فەرمان بەچاکەو جڵەوگیر لەخراپەو جیهاد لەڕێی خوادا دێنن، بەنیازی ئەوەی کە دوچاری (فیتنە) نەیەن، بەڵام ئەوانە بەو جۆرە هەڵوێستەیان نوقمی (فیتنە) بوون، ئەمەش ئێستە حاڵی زۆرێك لە بڕوادارانە، دێن ئەوە کە واجبە لەسەریان لە فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لە خراپەو جیهاد لەڕێی خوادا وازی لێدێنن بە پاساوی ئەوەی بەهۆی ئارەزووەکانەوە نەکەونە نێو (فیتنە)وە، بەڵام خۆیان کەوتونەتە فیتنەیەکەوە کە زۆر گەورەترە لەوەی بە نیازی خۆیان لێی ڕا دەکەن!!.

وەهەرچی مرۆڤێك کەلەسەر ڕووی ئەم زەویەیە ئەگەرچی خۆیشی تەنها بێت هەر دەبێ فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە بکات، جا ئەگەر هەرخۆی تەنها بوو، ئەوە با فەرمانو بەرهەڵستی لە خودی خۆیدا بکات.

## مەرجەکانی کردەوەی صالح‌و ڕووپامایی - الریاء -

هەموو کردەوە چاکەکان بۆ ئەوەی لای خوای گەورە وەربگیرێن، پێویستە دوو مەرجیان تێدا بێت:

یەکەم: دەبێ مەبەست بە ئەنجامدانی ئەو کردەوەیە تەنها خوا بێت.

دووەم: دەبێ بەپێی بەرنامەی خوا بێت.

جا ڕەچاوکردنی ئەم دوو مەرجە چ لە وتەو قسەدا یان لە ڕەفتارو کردەوەدا بێت، جیاوازی نیە، بۆیە لەڕێگەی (صحیح)ەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن أول ثلاثة تسجر بهم جهنم، رجل تعلم العلم وعلمه، وقرء القرآن وأقراء ليقول الناس: هو عالم قاريء، ورجل قاتل وجاهد ليقول الناس: هو شجاعٌ وجريء ورجل تصدق واعطى ليقول الناس: جواد سخيٌ) مسلم.

واتە: (ئاگری جەهەننەم یەکەمجار بەسێ جۆرە کەسان خۆش دەکرێت: پیاوێك فێری زانیاری بووەو خەڵکیشی فێرکردووە، وە قورئانی خوێندوەتەوەو خەڵکانیشی فێرکردووە، بۆ ئەوەی خەڵك بڵێن: ئەو پیاوە خاوەن زانست‌و قورئان خوێنە، وە پیاوێك جەنگی کردووەو تێکۆشاوە بۆ ئەوەی خەڵکی پێی بڵێن: ئەو پیاوە ئازاو بوێرە، وە پیاوێك سەروەتی بەخشیوە بۆ ئەوەی خەڵکی بڵێن... بەڕاستی پیاوێکی بەخشندەیە).

جا ئەم سێ پیاوەی کە لە کردەوەکانیاندا مەبەستیان ڕیاو دونیا بووەو پاشان بەو چەشنەیان پێدەکرێت.. لەبەرامبەری ئەو سێ کۆمەڵەن کە لە دوای پێغەمبەرانەوەن‌و پێیان دەوترێت: (ڕاستان‌و، پیاوچاکان‌و، شەهیدان)، چونکە هەرکەسێك زانیاری بخوێنێ‌و لەبەر خوا خەڵکیش فێربکات ئەوە ڕاستگۆیە (صدیق)، وە هەرکەسێك جەنگ بکات بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرز بێتەوە، پاشان بکوژرێت ئەوە شەهیدە، وە هەر کەسێکیش سەروەت ببەخشێت‌و مەبەستی پێی خوا بێت ئەوە پیاوچاکە (صالح).

ـیە ئەو کەسەی کە کەمتەرخەمی یان زیادەڕەوی کردوە لە سەروەتەکەیدا
ـەوە لەکاتی مردندا داوای گەڕانەوە دەکات بۆ دونیا، وەك "ابن عباس"
خوای لێ ڕازی بێت، دەفەرموێت: (هەر کەسێك خوا پارەیەکی پێ ببەخشێت
ـەلام زەکاتی لێ نەداو سەردانی ماڵی خوای پێ نەکات، ئەوە لەکاتی سەختی
ـەرەمەرگدا داوای مۆڵەتو گەڕانەوە دەکات، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:
وَأَنْفِقُوا مِنْ مَا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلاَ أَخَّرْتَنِي
إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ) (المنافقون: ١٠).
واتە: (ببەخشن لەو سەروەتو سامانەی کە پێمان بەخشیون، پێش ئەوەی
یەکێك لە ئێوە مردن ڕێگەی پێبگرێت، ئەوسا دەڵێت: پەروەردگارم ئەگەر بۆ
ماوەیەکی کەم دوام بخەیتو بمگێڕیتەوە بۆ دونیا ئەوە سەروەتم بۆ تۆ
دەبەخشیو لە پیاوچاکان دەبووم).

## دۆستایەتیو دوژمنایەتی لەبەر خوا
## الولاية والعداوة في الله

موسوڵمانان دۆستانی خوان، وە هەندێکیان دۆستی هەندێکی تریانن، لەم لایشەوە بێ بڕوایانیش دوژمنانی خوان، وە دوژمنی بڕوادارانیشن، خوای گەورە دۆستایەتی نێوان بڕوادارانی فەرزکردووە، وە ڕوونی کردوەتەوە کە ئەو خۆشەویستیو دۆستایەتییە بەهۆی بڕواوەیە، واتە: گەر بڕوا هەبوو ئەوە ئەو خۆشەویستیو دۆستایەتیەش دەبێ هەبێ، وە بەهەموو شێوەیەك بەرهەڵستی کردووە لە دۆستایەتی بێ بڕوایانو ڕوونیشی کردوەتەوە کە دۆستایەتی کردنیان لەگەڵ بڕواداراندا پێچەوانەیەو بەهیچ شێوەیەك دانویان پێکەوە ناکوڵێت.

وە خوای زانا ڕوونی کردۆتەوە کە دۆستایەتی کردنی بێ بڕوایان سیفاتی بنەڕەتی دووڕووەکانە.

جا سەبارەت بە دۆستایەتیکردنی بڕواداران ئەوە ئایەتانێکی زۆر هاتوون، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا وَلِيُّكُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ(٥٥)وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمْ الْغَالِبُونَ) (المائدة:٥٦)

واتە: (ئەی موسوڵمانان: دۆستی ئێوە تەنهاو تەنها خواو پێغەمبەرەکەی‌و بڕوادارانن، ئەوانەن کە نوێژ بەرپادەکەن‌و زەکاتی سەروەتەکەیان دەدەن‌و هەردەم بۆ خوا ڕکوع دەبەن، هەرکەسێ دۆستایەتی خواو پێغەمبەرەکەی‌و بڕواداران بکات، ئەوە هەر کۆمەڵی خوا سەرکەوتوون). وە دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَنَصَرُوا أُوْلَئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ) (الأنفال:٧٢)

واتە: (ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کۆچیان کردو بەدارایی‌و گیانیان لە ڕێگەی خوادا تێکۆشانیان کرد، وە ئەوانەش کە داڵدەیان دان‌و سەریان خستن، ئەوانە هەندێکیان دۆستانی هەندێکی تریانن) وە دەفەرموێت: (أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ) (يونس:٦٣) واتە: ئاگاداربە: بەڕاستی دۆستانی خوا نەترسیان بۆ هەیەو نە خەفەتیش دەخۆن، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو هەردەم پارێز دەکەن).

وە سەبارەت بە دۆستایەتی نەکردنی بێ بڕوایان‌و خۆقوتارکردن لێیان دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ) (الممتحنة:١)

واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە دوژمنی من‌و دوژمنی خۆتان مەکەنە دۆست) وە هەر لەو سوڕەتەدا دەفەرموێت: (قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ) (الممتحنه:٣-٤) واتە:

(ئەی بڕواداران: بەڕاستی بۆ ئێوە سەرمەشقی جوان هەیە لە "ئیبراهیم"و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵیدا بوون، لەو دەمەدا بەگەلەکەی خۆیان وت: ئێمە بەریین لە ئێوە، وە لە هەرچییەکەیش کە لە غەیری خوا بەندایەتی بۆ دەکەن، وە ئێمە بێبڕوا بووین بە ئێوەو لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بەبەردەوامی دوژمنایەتیو ڕقو کینە ئاشکرا بووە، تا ئەو دەمەی ئێوە بڕوا بە تەنهایی خوا دێنن). وە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (لاَ تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنْ الآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ) (الممتحنة:١٣) واتە: (ئەی بڕواداران: دۆستایەتی گەلێك مەکەن کە خوا لێیان تووڕە بووە، ئەوانەی کە لە پاداشتی خوا بێ هیوا بوون، هەروەك بێ بڕوایان بێ هیوان لەوانەی لەنێو گۆڕدان)[1]

وە دەفەرموێت (اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمْ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنْ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ) (البقره: ٢٥٨) واتە: (خوا دۆستی بڕوادارانە، لە تاریکاییەکانەوە دەریان دێنێ بۆ نێو ڕۆشنایی، وە ئەوانەی کە بێ بڕوان دۆستانیان تاغوتەکانن، کە لە ڕۆشنایی ئیسلامەوە دەریان دێنن بۆ نێو تاریکاییەکانی کوفر) وە دەفەرموێت: (فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ)(البقره:٩٨) واتە: (بەڕاستی خوا دوژمنی بێبڕوایانە).

وە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنْ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ) (التوبه:٢٣) واتە: (هۆ بڕوادارینە: باب‌و براکاناتن مەکەنە دۆستی خۆتان، ئەگەر هاتوو ئەوان خۆشەویستی کوفریان هەڵبژارد بەسەر ئیماندا، وە هەرکەس لە ئێوە دۆستایەتیان بکات، ئەوە بێگومان ئەوانە ستەمکارن) وە

---

[1] دوو بۆچون هەیە لە توێژینەوەی ئەم ئایەتەدا (كما يئس الكفار من اصحاب القبور) بۆچونی یەکەم: واتە: هەروەك بێ بڕوایان بێهیوا بوون لە خزمە مردووەکانیان کە بیان بیننەوە، چونکە بڕوایان بە زیندووبونەوە نیە، ئەمەش بۆچوونی (إبن عباس‌و حەسەنی بەصری‌و قەتادە)یە. بۆچوونی دووەم: واتە: هەروەك چۆن ئەو بێبڕوایانەی کە لەنێو گۆڕدان هەردەم بێهیوان لەهەموو خێرێك کە پێیان بگات. ئەمەش بۆچونی (إبن مسعودو إبن جريري طبري)یە. مختصر إبن كثير م٣ ص٤٨٧. وەرگێڕ.

هەم دەفەرموێت: (قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ) (التوبه:٢٤) واتە: ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەگەر باب‌و باپیرانتان‌و، منداڵەکانتان‌و براکانتان‌و ژنەکانتان‌و هۆزەکەتان‌و، وە ئەو سەروەت‌و سامانەی کە بە ناڕەحەتی وە دەستتان کەوتووەو، ئەو بازرگانیەی کە دەترسێن زەرەر کات‌و، ئەو جێ‌و نیشتیمانەی کە خۆتان پێی ڕازین، خۆشەویستتر بوو لاتان لە خواو پێغەمبەرەکەی‌و جیهاد لە ڕێی ئەودا، ئەوە چاوەڕوان بکەن هەتاکو خوا سزای خۆی بنێرێ، بەڕاستی خوا هیدایەتی خەڵکی لادەر نادات).

وە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) (المائدة:٥١) واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە: جولەکەو گاورەکان بە دۆست مەگرن، لەکاتێکدا ئەوان هەندێکیان دۆستی هەندێکی تریانن، وە هەرکەس لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوە لەوانە، بەڕاستی خوا ڕێنومایی گەلی ستەمکار ناکات.) وە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ) (المائده:٥٧) واتە: (هۆ بڕوادارینە: ئەوانەی کە دینەکەی ئێوەیان گێڕاوە بە گاڵتەو گەمە، لەوانەی کە خوا پێش ئێوە کتێبی بۆ ناردوون‌و بێبڕوایان، ئێوە مەیانگرن بە دۆست، وە ئەگەر ئێوە بڕواداری ڕاستەقینەن پارێز لە خوا بکەن.) وە لە مەڕ سەرزەنشتکردنی دووڕووەکان دەفەرموێت: (تَرَى كَثِيرًا مِنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَنْ سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ(٨٠)وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ فَاسِقُونَ)

المائدە:٧٩-٨٠) واتە: (زۆربەیان دەبینیت دەچن دۆستایەتی بێبڕوایان دەکەن، بەڕاستی توێشوویەکی پیسیان وە پێش خۆیان خستووە، کە خوا لێیان تورە بووەو لە دواڕۆژیشدا بە بەردەوامی لەنێو سزادا دەمێننەوە، وە ئەوانە ئەگەر بڕوایەکی ڕاستیان بە خواو پێغەمبەر ﷺو ئەوەی کە بۆ پێغەمبەر ﷺ نێردراوە بهێنابایە ئەوە ئەو بێبڕوایانەیان نەدەگرت بە دۆست، بەڵام زۆرینەی ئەوانە لادەرو گوناهبارن[1]).

وە سەبارەت بە دوو ڕووەکان دەفەرموێت: (بَشِّرْ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا(١٣٨)الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمْ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا) (النساء١٣٧-١٣٨) واتە: (مژدە بدە بە دووڕووەکان بەوەی کە لە دواڕۆژدا سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە، ئەوانەی کە بێبڕوایان لە جێی موسوڵمانان دادەنێن بە دۆستی خۆیان، ئایا ئەو دووڕوانە چاوەڕوانی سەرکەوتنو عیززەت لە بێبڕوایان دەکەن؟!!! بەڕاستی سەرکەوتن هەرهەمووی بۆ خودایە[2]) وە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَتُرِيدُونَ أَنْ تَجْعَلُوا لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا مُبِينًا(١٤٤)إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا) (النساء ١٤٤-١٤٥) واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێبڕوایان مەکەن بە دۆستانی خۆتانو بچن واز لە دۆستایەتی بڕواداران بێنن، ئایا دەتانەوێ بەڵگەیەکی ئاشکرا بدەنە دەست خوا بۆ ئەوەی سزاتان بدات؟

بەڕاستی دووڕووەکان لە خواری خوارەوەی ئاگری دۆزەخدان، وە نابینی سەرخەرێکیان هەبێت ڕزگاریان بکات)[3]. وە هەم دەربارەیان دەفەرموێت:

---

[1] تفسير إبن كثير م٢ ص ٨٠-٨١. وەرگێڕ.

[2] تفسير إبن كثير م١ ص٥٣٦، وەرگێڕ.

[3] تفسير إبن كثير م١ ص٥٣٩-٥٤٠، وەرگێڕ.

(وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ) (البقرە:١٤) واتە: (ئەگەر بگەن بە بڕواداران دەمو دەست دەڵێن: ئێمە بڕوامان هێناوە، بەڵام هەر کە گەیشتنەوە لای شەیتانەکانیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەداین، ئێمە تەنها گاڵتە بەو بڕوادارانە دەکەین) وە دەفەرموێت: (لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ) (المجادلة::٢٢) واتە: (ئەی محمد ﷺ نابینیت گەلێك کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرﷺ هێنابێتو بچن دۆستایەتی ئەوە بکەن کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەر ﷺ دەکات، ئەگەر لە حالێکدا ئەوانە باوكو باپیرانیانو یان کوڕەکانیانو براکانیانو هۆزو گەلی خۆشیان بن). وە دەربارەی دووڕووەکان دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرى إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لإِخْوَانِهِمْ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلاَ نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ) (الحشر:١١) واتە: ئایا نابینی ئەوانەی کە دووڕوون (المنافقين) بە برا بێ بڕواکانیان (مەبەست گاورەکانی بەنونەضیرە)دەوت: ئەگەر ئێوە دەرکرێن ئەوە ئێمەش لەگەڵتان دێینە دەرەوە، ئەگەر شەڕتان لەگەڵ بکرێت ئەوا یارمەتیتان دەدەین (سەرتان دەخەین)، وە هەم دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ(٢٥)ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ) (محمد:٢٥-٢٦) واتە: ئەو کەسانەی کە وازیان لە بڕوا هێناو گەڕانەوە بۆ لای کوفر لەدوای ئەوەی کە بەرنامەو هیدایەتیشیان بۆ ڕوون بوەوە، ئەوە بوو شەیتان ئەو کارە بەدەی بۆ جوانو ڕازاوە کردنو هەڵی خەڵەتاندن، هۆی ئەم پاشگەز بوونەوەشیان ئەوەبوو دەیانوت بەوانەی کە بەرنامەی خوایان پێ ناخۆش بوو لەمەودوا لە هەندێ کاروباردا گوێڕایەڵیتان دەکەین، بەڕاستی خوا ئاگای لە نهێنیو پەنهانەکانە) مختصر تفسير إبن كثير ج٣ / ص٢٣٦.

# لە دۆستایەتی بێ بڕواکان حوکم بۆ لابردنیانە

جۆرێك لە دۆستایەتی بێبڕوایان کە خوای کاربەجێ سەرزەنشتی گاورەکان و دوڕوەکانی لەسەر کردووە: بریتیە لە بڕواهێنان بە چمکێك لەو بێبڕواییەی کە ئەوان لەسەرنی، یان داوای یاسا لێکردنیان لە پێش بەرنامەی خوادا- واتە: یاسای ئەوان لە قورئان بەباشتر بزانین- وەك خوای دادگەر لەمەڕ ئەم ڕاستیە دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا(٥١)أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ وَمَنْ يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا) (النساء:٥٠-٥٢) واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە چمکێك لە پەڕاوی خوایان پێ درابوو (مەبەست ئەهلی کیتابە) بڕوا دێنن بە جادوگەریی و شەیتان، وە بێبڕواکان دەڵێن: ڕێگەی ئەمانە لە بڕوادارەکان باشترو ڕوونترە، ئەوانەی خوای گەورە نەفرینی لێکردوون، لە ڕەحمەتی خۆی وەدووری خستوون- وە هەر کەس خوا نەفرینی لێ بکات ئەوە هیچ یاریدەدەرێکی نیە.[1]

وەك زانراوە ئەم ئایەتە دەربارەی (کەعبی کوڕی ئەشرەف) هاتە خوارەوە، لەو دەمەدا کە چوو بۆ لای موشریکەکانی شاری "مەککە"و بەرنامەکانی ئەوانی بە باشترو بەرقەرارتر لە قەڵەمدا لە بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی.[2]

---

[1] تفسير إبن كثير م١ ص ٤٨٥-٤٨٦.

تێبینی: (جبت) و (تاغوت) لەم ئایەتەدا بەچەند شێوەیەکی لێکدراوەتەوە، یەکەم: (جبت) جادووە -السحر- (تاغوت) شەیتانە، دووەم: (جبت) فاڵچییە یان بتە یان شیرك، وە (تاغوت) هەرچی شتێکە لە غەیری خوا بپەرستێت، هەمان سەرچاوەی پێشوو، وەرگێڕ

[2] تفسير إبن كثير م١ ص٤٨٥-٤٨٦.

وه‌ ده‌رباره‌ی جوله‌كه‌كان ده‌فه‌رموێت: (وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ(١٠١)وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ) (البقره:١٠١-١٠٢) واته: (كاتێك كه‌ پێغه‌مبه‌رێك وه‌ك محمد ﷺ له‌لایه‌ن خواوه‌ هات بۆ لایان، له‌كاتێكدا ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ كتێبه‌ ئاسمانیه‌كه‌ی لای ئه‌وانیش به‌ڕاست ده‌زانیّ، كۆمه‌ڵێك له‌وانه‌ی كه‌ په‌ڕاوی خواییان پێدرابوو كتێبه‌كه‌ی خوایان خسته‌ پشت خۆیانه‌وه‌ وه‌ك هه‌ر نه‌شزانن، (واته‌: وه‌ك نه‌شزانن كه‌ ئه‌و كتێبه‌ خواییه‌ باسی پێغه‌مبه‌ری ﷺ تێدا كرابێت) وه‌ چون شوێنی ئه‌وه‌ كه‌وتن كه‌ شه‌یتانه‌كان ده‌یان خوێنده‌وه‌ له‌ موڵكی (سوله‌یمان)دا، واته‌: كتێبه‌كه‌ی خوایان فرێداو چون شوێنی جادووگه‌ری (سحر) كه‌وتن.[1]

لێره‌دا خوای زانا هه‌واڵ ده‌دات كه‌ ئه‌وانه‌ وازیان له‌ به‌رنامه‌كه‌ی خوا هێناوه‌و پشت گوێیان خستووه‌، وه‌ له‌ جێیدا چوون شوێنی جادووگه‌ریی‌و ئاره‌زووبازی كه‌وتوون!!

وه‌ خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا(٦٠)وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا) (النساء:٦٠-٦١) واته‌ : (ئایا ته‌ماشای ئه‌وانه‌ ناكه‌ی كه‌وا گومان ده‌به‌ن بڕوایان به‌وه‌ هێناوه‌ كه‌ بۆ تۆو بۆ ئه‌وانه‌ی پێش تۆ دابه‌زیوه‌، له‌ كاتێكدا ده‌یانه‌وێ حوكمی خۆیان به‌رنه‌ لای تاغوت، به‌ڕاستی شه‌یتان ده‌یه‌وێ به‌ گومڕابوونێكی دوور گومڕایان بكات، وه‌ ئه‌وانه‌ ئه‌گه‌ر پێیان بوترێت وه‌رن بۆ لای ئه‌و به‌رنامه‌ی كه‌ خوا دای به‌زاندووه‌ته‌ سه‌ر پێغه‌مبه‌رﷺ ئه‌وه‌ یه‌كسه‌ر

---

[1] تفسیر إبن كثیر م١ ص١٢٨-١٢٩. وه‌رگێڕ.

ـحبینی دوڕووەکان بە جیددیو سەرسەختانە لێت دوور دەکەونەوە – یان خەڵکت لێ وەدوور دەخەن–).

ـ غوتیش لەسەر وەزنی (فەعلووتە) لە توغیانەوە هاتووە، واتە: لە سنوور ـدانو یاخیبوون، کە ئەویش ستەمو دەستدرێژی دەگرێتەوە، هەر پەرستراوێك لە غەیری خوا ئەگەر بەو بەندایەتی بۆ کردنە ناڕازی نەبوو، وە پێی قەڵس نەبوو ئەوە پێی دەوترێت (تاغوت)، هەر بۆیە لە فەرمودەدا هاتووە دەڵێت: (ویتبع من یعبد الطواغیت الطواغیت) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (ئەوەی بەندایەتی تاغوتەکان –بتەکان– دەکات، شوێنی تاغوتەکانیش ـدەکەوێت).

ئەوەی لەسەرپێچی خوادا گوێڕایەڵی دەکرێت، ئەوەی گوێڕایەڵی بۆ دەکرێت لە شوێنکەوتنی غەیری پەیڕەوی خواو حەقدا..... ئەوە تاغوتە، هەر بۆیەش ئەوەی کە حوکمی دەبرێتە لا و حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات ئەوە هەر (تاغوتە)، بۆیەش خوای دادگەر (فیرعەون)و (عاد)و ئەوانیش تریشی ناوناوە (تاغوت) کەواتە: هەرکەسێك لەم ئوممەتی ئیسلامەدا دۆستی بێبڕوایان بێت، لە موشریکین یان (ئەهلی کیتاب) بە هەندێك جۆری دۆستایەتیکردن وەك: چوونی بۆ لای لایەنگرانی (باطل) یان شوێن کەوتنیان لە هەندێ قسەو کردەوەی (باطل)یاندا، ئەوە بەئەندازەی ئەو دۆستایەتی کردنە (نیفاق) چۆتە دەروونیەوە، ئەمەش وەك شوێن کەوتنیان لە هەڵوێستو بۆچوونو کردەوەکانیاندا کە پێچەوانەی (قورئان)و (سوننەت)ی پێغەمبەر ﷺ بێت، وە هەرکەس دۆستایەتی مردوانیان بکات یان زیندووانیان، بە جۆرێك لە خۆشەویستی یان بەگەورە زانین یان ڕێککەوتن، ئەوە ئەویش لەوانەو وەك ئەوانە وایە کە پشتگیریو یارمەتی دوژمنانی حەزرەتی (ابراهیم) و (موسا)یان کردووە.

وە بێگومان گاورو جولەکەو ئاگرپەرستەکان ئەگەرچی کوفرەکەیان ڕوونە. بەڵام زۆرینەی ئەوانەی هاتوونەتە ناو ئیسلامەوە، تەنانەت ئەوانەی کە بەزانیاریو بەندایەتیو پێشەوایەتیش ناسراون، چونەتە نێو زۆرێك لە کوفری ئەوانەوە، وە هەندێك بنەماو ڕێچکە کە لە بنچینەدا ئەوان دایان ڕشتووە ئەمان پێیان باشە کە بکرێتە یاسا (حکم) وە ئەو حەقەی کە پێغەمبەران (علیهم السلام) هێنایان ئاوێتەی ئەو (باطل)ەیان کردووە کە دوژمنانی پێغەمبەران (علیهم السلام) لەسەر بوونو پەیڕەویان لێ دەکرد.

بەڵام خوای پەروەردگار پێی خۆشە (پیس) لە (پاك) و (حەق) لە (باطل) جیا بکرێتەوە، وە پێویستە بزانین: ئەوانەی دۆستایەتی بێبڕوایان دەکەن (مونافق)ن یان چمکێك لە نیفاق یان تێدایە ئەگەرچی بە ڕواڵەت لەگەڵ موسوڵمانیشدا بن، چونکە پیاوێك ئەگەر لە دەرەوە موسوڵمان بێت ئەوە مەرج نیە لەناوەوە مونافیق نەبێت، لەبەرئەوە مونافیقەکان بەڕواڵەت هەموویان موسوڵمان بوون، وە قورئانی پیرۆز ئاکارو سیفەتەکانیانی ڕوون کردۆتەوە، جا ئەگەر ئەو دووڕوانە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبووبن کە سەردەمی عیززەتی ئیسلامیش بووە، ئەوە لە دوای ئەو سەردەمە زێڕینە زۆر زۆرتر دەبن.

# ڕق لێبوون و قسە لەگەڵ نەکردن و مەرجەکانی

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی کە ڕق ڵێبوونی فەرز یان جائیزە؟ یان قسە لەگەڵ نەکردنی یان هەردووکیان لەبەرخوا؟ وە ئایا چ مەرجێك دانراوە بۆ ئەو کەسەی کە ڕقی لەو کابرایە دەبێت؟ یان قسەی لەگەڵ ناکات لەبەرخوا؟

وە ئایا سەلام نەکردن دەچێتە نێو بازنەی قسە لەگەڵ نەکردنییەوە یان نا؟ وە ئەگەر هاتوو قسە لەگەڵ نەکراوەکە لە سڵاوکردندا پێشی قسە لەگەڵ نەکەرەکە کەوت، ئایا فەرزە وەڵامی بداتەوە یان نا؟ وە ئایا ڕق لێ بوون و قسە نەکردنەکە بەردەوام دەبێت هەتاکو ئەو سیفەتەی کە لەسەری وای لێکراوە تێیدا نەمێنێت، یان ئەو قسە نەکردن و ڕق لێبوونە ماوەیەکی دیاریکراوی هەیە؟ وە ئەگەر ماوەیەکی دیاریکراوی هەیە ئەوە سنورەکەی چەندە؟ فەتوامان بۆ بدەن خوا پاداشتان بداتەوە...

ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە.

**قسە نەکردنی شەرعی دوو جۆرە:**

یەکەم: بەمانای وازهێنانی خراپەکان (المنكرات).

دووەم: بەمانای سەرزەنشت کردن و سزادان لەسەر ئەو خراپانە.

جۆری یەکەم: ئەمەیە لەو ئایەتەدا باسکراوە کە دەفەرموێت: (وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلاَ تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ) (الأنعام٦٨) واتە: (ئەگەر ئەوانەت بینی کە دەربارەی ئایەتەکانی ئێمە گاڵتەیان دەکرد، ئەوە یەکسەر پشتیان تێبکە هەتاوەکو دەچنە سەر باس و خواسێکی دیکە، وە ئەگەر هاتوو (شەیتان) لە بیری بردیتەوە ئەوە لە پاش ئەوەی بیرت کەوتەوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ستەمکارانەدا دانەنیشیت) وە دەفەرموێت: (وَقَدْ نَزَّلَ

عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلاَ تَقْعُدُوا مَعَهُمْ فَلاَ تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ) (النساء: ١٤٠)

واتە: (لە قورئاندا –خوا – بۆی ناردونە خوار کە ئەگەر هاتوو بیستتان ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانراو گاڵتەیان پێ دەکرا، ئەوە ئێوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە دامەنیشن، هەتاوەکو دەچنە سەر باسێکی دیکە، چونکە ئەگەر ئێوە لەگەڵیان دانیشن ئەوە کەواتە وەك ئەوانن)[1]

ئەمەش مەبەست پێی ئەوەیە کە نابێت بەبێ پێویستی ئامادەی ئەو شوێنانە بێت کە هەردەم خراپەی تێدا دەکرێت، بۆ نمونە: کۆمەڵێك ئارەق دەخۆنەوە بچیت لەلایان دانیشیت، یان ئەگەر هاتوو کۆمەڵێك بانگکران بۆ چێشتی ژن گواستنەوە، ئەگەر هاتوو ئارەق و گۆرانی و شمشاڵی تێدابوو، ئەوە فەرز نیە وەڵامیان بدەیتەوە، وە چەندین نمونەی لەم ناشەرعییانە هەیە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو کەسەی بۆ بەرهەڵستی لێکردنیان لەو شوێنەدا ئامادە دەبێت، یان بەبێ ویست و حەزی خۆی ئامادە دەبێت – واتە: زۆری لێ دەکرێت.[2]

بۆیە وتراوە (ئامادەبووی خراپە وەك ئەنجام دەرەکەیەتی) (حاضر المنكر كفاعله) وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من كان يؤمن بالله واليوم الأخر، فلا

---

[1] لەم دوو ئایەتەدا ئەوەی لێوەردەگیرێت کە: ئەو کۆڕو سیمینارانەی کە لە وڵاتی خۆماندا دەگێڕدرێت سەبارەت بە بەدرۆدانان و گاڵتەپێکردنی هەندێك بنەمای ئیسلامی، ئەوە جائیز نیە بۆ موسڵمان تێیدا دانیشێ، ئەگەر لە حاڵەتێکدا لە توانای نەبوو وەڵامیان بداتەوەو دەمکوتیان بکات، مەگەر وەك ئەرکێك لەلایەن قیادەوە بۆ (تجسس) پێی سپێرابێ. والله اعلم. وەرگێڕ.

[2] مەبەست ئەوەیە ئەگەر هاتوو بۆ ئەم دوو شتە ئامادەبوو ئەوە گوناهبار نیە.

یەکەم: بۆ بەرگری کردن و مەنع کردنیان.

دووەم: بە ویست و ئارەزوی خۆی نەبوو، بەڵکو بە زۆرو هەڕەشەی توند هاتبوو. وەرگێڕ.

يجلس على مائدة يشرب عليها الخمر) رواه ابو داود و الترمذي والدارمي.
وته: (هەركەسێك بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با لەسەر سفرەیەك
ـانەنیشێت كە ئارەقی لەسەر بخورێتەوە) ئەم جۆرەش وەك قوتاركردنی
ـحروون وایە لە ئەنجامدانی كردەوە خراپەكان، وەك پێغەمبەر ﷺ
ـحفەرموێت: (المهاجر من هجر ما نهى الله عنه) رواه البخاري وابو داود.
وە كۆچكردن لە وڵاتی (كوفر)و تاوانەوە بۆ وڵاتی (بڕوا)و (ئیسلام)یش لەم جۆرەیە: چونكە ئەمەش وازهێنانو كۆچكردنە لەمانەوە لەنێو بێبڕوایانو ـووڕووواندا ئەوانەی كە هەردەم ناهێڵنو بوارت پێ نادەن ئەوەی خوا فەرمانی پێكردووە ئەنجامی بدەیت.

جۆری دووەم: قسە لەگەڵ نەكردن بەشێوەی سەرزەنشت كردنو فێكردنی ئەدەب، ئەم جۆرەش بۆ ئەوانەیە كە بە ئاشكرا خراپە دەكەن، جا قسەیان لەگەڵ ناكرێت هەتاكوو داوا بكەن لە خوا كە لەو تاوانانەیان ببورێت، هەر وەك ئەو سێ (صەحابە)یەی كە بۆ جەنگی (تەبوك) لە پێغەمبەر ﷺ دواكەوتن، جا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەكانی دەنگیان لەگەڵدا بڕین، هەتاوەكو خوای بەخشندە ئایەتی دابەزاندو تەوبەی لێ وەرگرتن- ئەمانەش گوناهەكانیان ئەوەبوو كە وازیان لە جیهاد هێنا لەكاتێكدا بوو بە فەرزی عەینو هیچ بیانووو عوزرێكی شەرعییان نەبوو- بەڵام هەركەس خێرو چاكەی لێ دەركەوێت، ئەوە نابێت دەنگی لێ هەڵگریت ئەگەرچی لە ناوەوە بەنهێنی دووڕووبێت.

## قسه لەگەڵ نەکردن بە شێوەی تەمبێ کردن – تعزیر-

هەندێجار دەنگ لێ هەڵگرتن بۆ –تعزیر–ە، ئەمەش بۆ کەسێکە واز لە فەرزەکان بهێنێت‌و هەندێ کردەوەی قەدەغەکراو ئەنجام بدات وەك: ئەو کەسەی کە وازی لە نوێژ هێناوەو زەکات نادات، لە کاتێکدا بەد ڕەوشتی‌و ستەم دەکات، یان ئەو کەسەی کە بانگەواز بۆ –بیدعە– دەکات، لەکاتێکدا بەپێچەوانەی (قورئان)و (سوننەت)ی پێغەمبەر ﷺو کۆڕای زانایان‌و پێشینانی ئەم ئوممەتە بێت.

هەر لەبەرئەمەشە کۆمەڵێك لە پێشەوایانی پێشینانمان (السلف) دەفەرمون: ئەوانەی کە بانگهێشت بۆ لای بیدعە دەکەن ئەوە "تعزیر" دەکرێن‌و شاهیدییان وەرناگیرێت، ئەمەش وەك سزاو سەرزەنشتێك وایە بۆیان هەتاوەکو وازی لێ بهێنن‌و دەستی لێ هەڵگرن، وە لەم بۆچوونەشیاندا جیاوازی دەخەنە نێوان ئەوەی بانگهێشتی خەڵکیش دەکات بۆ لای بیدعەکەو ئەو کەسەی کە بانگهێشتی بۆ ناکات، چونکە ئەوەی کە بانگهێشتی بۆ دەکات، ئەوە خراپەکەی ئاشکرا کردووە، بۆیە شایستەی سزاو سەرزەنشتە، بەپێچەوانەی ئەوەیان کە بانگهێشت ناکاو دەیشارێتەوە هەمان حوکمی نیە، چونکە ئەوەی کە خۆی خەریکی –بیدعە–یەو خەڵکی بۆ بانگ ناکات، ئەوە خراپتر نیە لە (دووڕووەکان) کە پێغەمبەر ﷺ شتە ئاشکراکانی لێ وەردەگرتن وە نهێنییەکانیشی دەدایە دەست خوای دادگەر، لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاداری حاڵی زۆربەشیان بو و[1] بۆیە لە فەرمودەی

---

[1] تێبینییەکی گرنگ: خوێنەری بەڕێز لێرەدا شێخی ئیسلام کە دەفەرموێت: ئەوانەی کە ئەهلی بیدعەن نوێژیان لەدواوە ناکرێ‌و شایەتیان لێ وەرناگیرێت مەبەستی هەموو بیدعەیەك نیە، واتە زیاتر ئەو بیدعانە دەگرێتەوە کە لەبواری عەقیدەدان، نەك لە مەجالی هەندێ عیبادات‌و معامەلات ئەمە خاڵی یەکەم.
خاڵی دووەم: مەبەست بەو کەسانەیە کە هاوکات لەگەڵ ئەنجامدانی بیدعەکەدا خەڵکیشی بۆ بانگ دەکەن، بەڵام ئەگەر خەڵکیان بۆ بانگ نەکرد ئەوە ئەو حوکمەی نیە کە باس کرا، والله أعلم. وەرگێڕ

پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: (ان المعصية اذا خفيت لم تضر الا صاحبها ولكن اذا اعلنت فلم تنكر ضرت العامة) واتە: (بەڕاستی تاوان ئەگەر شارایەوەو بەنهێنی کرا ئەوە تەنها زیان بە خاوەنەکەی دەگەیەنێت، بەلأم ئەگەر بە ئاشکرا کراو ئینکاری نەکرا، ئەوە زیان بە هەمووان دەگەیەنێت).
ئەمەش لەبەرئەوەیە – کە: زیان بە گشتی دەگەیەنێت– چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ان الناس اذا رأوا المنكر فلم يغيروه، أوشك ان يعمهم الله بعقاب منه) رواه احمد وابو داود وابن ماجه، واتە: (خەڵکی ئەگەر خراپەیەکیان بینی و نەیانگۆڕی، ئەوە نزیکە خوا بەگشتی سزایەکیان بۆ بنێرێت).
کەواتە: ئەو خراپانە کە بەئاشکرا ئەنجام دەدرێن (واجبە) بە هەموو شێوەیەك بەرهەڵستیان لێ بکرێت، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە بەنهێنی دەکرێن، چونکە دووەمیان سزاکەی تایبەتە بە خاوەنەکەیەوە، وە ئەمجۆرە قسەنەکردنە کە بەشێوەی (تعزیر)ـە بە گوێرەی جیاوازی ئەوانەی ئەنجامی دەدەن دەگۆڕێ، لە (بەهێز)ی و (لاوازی)یاندا، وە لە کەمی و زۆریاندا، چونکە ئەوەی مەبەستە لێرەدا دوو شتە:
یەکەم: سەرزەنشتکردنی بابای دەنگ لەگەڵ هەڵگیراو.
دووەم: گەڕانەوەو ترساندنی خەڵکانی تریش لەو جۆرە کردەوانە، ئەگەر لەم دەنگ دابڕینەدا بەرژەوەندی زۆرترو زاڵتر بوو، بەشێوەیەك سەری کێشا بۆ لاوازکردن، و شاردنەوەی خراپەکە، ئەوە "جائز"ە بەلأم ئەگەر هاتوو قسە لەگەڵ نەکەرەکە لاواز بوو، وە ئەوەی کە قسەی لەگەڵ ناکرێ و خەڵکانی تریش هیچ سەرزەنشتێکیان نەدەکراو، ئەو حاڵەتە وای لێ نەکردن کە واز بێنن، بەڵکو تاوانەکە زۆرترو زیاتری دەکرد، بەجۆرێك زەرەرەکەی لە بەرژەوەندییەکەی زۆرتر بوو، ئەوە ئەو دەنگ دابڕینە جائیز نیە، بەڵکو دڵ ڕاگرتنی هەندێ خەڵکی لە دورخستنەوەو قسە لەگەڵ نەکردنیان بەسوودترە، وە هەندێ خەڵك هەن دەنگ لێ هەڵگرتنیان لە دڵ ڕاگرتنیان

بەسوودترە، بۆیەش دەبینی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك دڵی ڕادەگرتن‌و هەندێکیش دەنگی لێ هەڵدەگرتن، سەیر دەکەی ئەو سێ نەفەرەی کە لە شەڕی (تەبوك) دوا کەوتن، لەبەرئەوەی موسوڵمانی دامەزراو بوون‌و چاوەڕوانی خراپەیان لێ نەدەکرا، بۆیە قسە لەگەڵ نەکردنیان بەرژەوەندی زۆرتر بوو، هەم عیززەتی دینی خوای تێدابوو، هەم پاك بوونەوەیەکیش بوو بۆ خۆیان لە تاوان، بەڵام دڵ ڕاگیراوەکان "المؤلفة قلوبهم" لەبەرئەوەی پیاوی ناودارو لەنێو هۆزەکانیاندا گوێڕایەڵ بۆکراو بوون، بۆیە جەوهەری بەرژەوەندیەکە لە ڕاگرتنی دڵیاندا بوو نەك دەنگ لێ هەڵگرتنیان.

جا بەرژەوەندی لە چیدا زۆرترو زووتر دەستەبەر ببێت دەبێ ئەوە بکرێت، بۆیە دەبینی جاری وا هەیە لەگەڵ دوژمندا شەڕکردن شەرعی ترە، وە جاری واش دەبێ ڕێککەوتن‌و هودنە باشترە وە جاری واش هەیە سەرانە وەرگرتن‌و هەموشی بەپێی بەرژەوەندی‌و حاڵی موسوڵمانان، وە وەڵامی هەموو پێشەوایان‌و زانایانی ئیسلامیش لەمەڕ ئەم باسەدا لەسەر ئەم بنچینەیە بنیات نراوە کە باسکرا.

کەواتە: دەنگ هەڵگرتنی شەرعی- بەو شێوەی باسکرا- لەو کردەوانەیە کە خواو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێکردووە، گوێڕایەڵی کردنی خواش پێویستە بۆ خوا بێت‌و بەپێی فەرمانی خواش بێت، واتە ساغ بێت بۆ خواو هەم ڕاستیش بێت، کەواتە هەرکەس دەنگ هەڵگرتنەکەی لەبەر ئارەزووی خۆی بێت - نەك شەرع -، یان بەو شێوەیە نەبێت کە فەرمانی پێکراوە، ئەوە لەو سنوورە دەرچووە، واتە لە سنووری -شەرع-وە زۆرجاریش مرۆڤ بەپێی ئارەزووی خۆی شتێك دەکات‌و واش گومان دەبات کە لەبەر گوێڕایەڵی خوا دەیکات، وە دەنگ هەڵگرتن لەبەر مافی مرۆڤ خۆی لە سێ ڕۆژ زیاتر جائز نیە -واتە لەبەر شتی شەخصی- وەك لە (بوخاری)و(مسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يحل لمسلم ان يهجر اخاه فوق ثلاث، يلتقيان

فيصد هذا ويصد هذا، وخيرهما الذي يبدأ بالسلام) واته: (بۆ موسوڵمان حەلاڵ نیە زیاد لە سێ ڕۆژ دەنگ لەگەڵ برا موسوڵمانەکەیدا هەڵگرێت، لەکاتێکدا بگەن بەیەك ئەمیان خۆی لاداو ئەویشیان خۆی لادات، وە چاکترینیان ئەوەیە کە پێش دەکەوێت لە سڵاودا) وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (تفتح ابواب الجنة كل اثنين وخميس، فيغفر لكل عبد لا يشرك بالله شيئا الا رجلا كان بينه وبين اخيه شحناء، فيقال انظروا هذين حتى يصطلحا) (رواه البخاري ومسلم). واته: (هەموو ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممەیەك دەرگاکانی بەهەشت دەکرێتەوە، هەر بەندەیەك هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدات خوا لێی خۆش دەبێت، تەنها موسوڵمانێك نەبێت کە لە نێوان خۆیو براکەیدا ناکۆکییەك هەبێت، بۆیە دەوترێت ئەو دوانە ڕاوەستێنن هەتاوەکو نێوان خۆیان باش بکەن) جا بۆیە دەنگ هەڵگرتن لەبەر مافی شەخصی بەگشتی قەدەغەیە تەنها ڕوخسەت بەهەندێکی دراوە – کە سێ ڕۆژە – هەروەك ڕووخسەت دراوە بە مێرد لەسەر جێگە پشت بکاتە ژنەکەی ئەگەر هاتوو سەرپێچی فەرمانی مێردەکەی کرد، کەواتە جیاوازی بکرێتە نێوان دەنگ هەڵگرتنێك کە لەبەر خوایەو دەنگ هەڵگرتنێکیش کە لەبەر مرۆڤ خۆیەتی، یەکەمیان فەرمانی پێکراوەو دووەمیان بەرهەڵستی لێکراوە، چونکە موسوڵمانان هەردەم برای یەکترن، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لا تقاطعوا ولا تدابروا ولا تحاسدوا وكونوا عباد الله اخوانا المسلم اخو المسلم) رواه البخاري ومسلم. واته: (نێوانتان مەپچڕێنن، وە لەکاتی بەیەك گەیشتن پشت مەکەنە یەکترن وە ڕقتان لە یەکتر نەبێت، وە ئێرەیی بەیەکتر مەبەن، وە هەمووتان تێکڕا ببنە بەندەی خواو برا بن، موسوڵمان برای موسوڵمانە) وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (الا انبئكم بأفضل من درجة الصلاة والصيام والصدقة والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر؟ قالوا بلى يا رسول الله ﷺ!!! قال اصلاح ذات البين فان فساد ذات البين هيَ الحالقة، لا اقول

تحلق الشعر ولكن تحلق الدين) رواه ابو داود والترمذي. واته: (ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لە بەرزتر لە پلەی نوێژو ڕۆژووو ماڵ بەخشینو فەرمان بە چاکەو بەرهەڵستی لە خراپە؟
وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: چاکسازیکردنی نێوان، چونکە خراپکردنی نێوان هەڵتاشەرە، من ناڵێم موو هەڵدەتاشێت، بەڵام دین دەتاشێت) وە دەفەرموێت: (مثل المؤنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم كمثل الجسد الواحد اذا اشتكي منه عضو تداعي له سائر الجسد بالسهر والحمي) رواه البخاري ومسلم، جا لە ڕاستیدا مرۆڤی موسوڵمان ئەرکی سەر شانیەتی کە دەبێ هەردەم دۆستایەتیو دوژمنایەتی بۆ خوا بکات، وە هەر کات موسوڵمانێك هەبوو ئەوە "واجب"ە دۆستایەتی بکات ئەگەرچی لە حاڵێکدا ئەو موسوڵمانە ستەمیشی لێ بکات چونکە بوونی ئەو ستەم لێکردنە نابێتە باعیسی پچڕاندنی دۆستایەتی ئیمانی، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێت: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ * إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ) (الحجرات:٩-١٠)
واته: (ئەگەر دوو کۆمەڵ لە بڕواداران بە شەڕ هاتن، ئەوە ئێوە چاکسازی لەنێوانیاندا بەرپا بکەن، جا ئەگەر یەکێکیان دەستدرێژی کردە سەر ئەوەی تر، ئەوە لەگەڵی بجەنگن دەتاوەکو بگەڕێتەوە بۆ لای شەرعی خوا، جا ئەگەر گەڕایەوە بۆ لای شەرعی خوا، ئەوە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە نێوانیان چاك بکەن وە هەردەم دادگەر بن، چونکە خوا دادپەروەرانی

خۆش دەوێت، وە تەنها بڕواداران برای ڕاستەقینەی یەکترن[1] سەیر دەکەی خوای دادگەر لەگەڵ بوونی پێکدادان و دەستدرێژی کردنە سەر یەکتریش هەر بە برا ناویان دەبات!! وە فەرمان دەکات بەهەردەم چاککردنی نێوانیان، بۆیە: پێویستە جیاوازی ئەو دوو جۆرە قسە نەکردنە تێبگات و ئاگادار بێت" واتە: ئەوەی لەبەر خوایە و ئەوەشی لەبەر خۆیەتی"، چونکە زۆر کەس هەن کە یەکێکیان ئاوێتەی ئەویتر دەکەن، وە دەبێ بزانرێت کە بڕوادار دۆستایەتی کردنی فەرزە ئەگەرچی ستەمیشی لێ بکات و دەستدرێژیش بکاتە سەری، وە بێبڕواش دوژمنایەتی کردنی فەرزە ئەگەرچی شت ببەخشێ و چاکەشت لەگەڵدا بکات، چونکە خوای گەورە پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانیەکانی بۆ ئەوە ناردوە کە (دین) هەر هەمووی تەنها بۆ خوا بێ، وە خۆشەویستی تەنها بۆ دۆستانی خوا بێت، وە ڕقەبەرایەتیش بۆ دوژمنانی ئەو بێت، وە پاداشت و ڕێز بۆ دۆستانی ئەوو تۆڵەش بۆ دوژمنانی بێت.

وە ئەگەر هاتوو لە پیاوێکدا (چاکەو خراپە خێرو شەڕ، گوێڕایەڵی و سەرپێچی، سوننەت و بیدعە) کۆبوونەوە، ئەوە بە ئەندازەی ئەو خێرەی کە تێیدایە شایستەی دۆستایەتی و پاداشتە، وە بە گوێرەی ئەو شەڕەی کە تێیدایە شایستەی دوژمنایەتی و سزایە، چونکە دەگونجێ لەیەك پیاودا هۆکاری ڕێز لێگرتن و بێڕێزیش کۆببێتەوە، وەك (دزێکی فەقیر) دەستی دەبڕدرێت لەبەر دزیەکەی و لە -بیت المال-یش بە ئەندازەی پێویستی خۆی پارەی پێدەدرێت، ئەمەش ئەو بنچینە زێڕینەیە کە (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) لەسەری تێکڕا یەك دەنگن و کۆمەڵە گومڕاکان

---

[1] مختصر تفسیر ابن کثیر م٢ ص٣٦٢-٣٦٣. وەرگێڕ.

**پێچەوانەیان دەکەن، چونکە ئەوان دەڵێن خەڵکی بە گشتی یان تەنها شایستەی پاداشتە یان بە تەنها سزا، بەڵام (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) دەفەرموون: خوای دادگەر ئەهلی تاوانە گەورەکان بە ئاگر سزا دەدات و پاشان بەهۆی شەفاعەتی هەرکەسێك کە خۆی مۆڵەتی پێبدات لە ئاگر دەریان دێنێت، هەروەك زۆر لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە هاتوون. والله أعلم.**

**وصل اللهم علی محمد وعلی آله وصحبه أجمعین[1]**

---

[1] خوێنەری بەڕێز: وەڵامەکەی شێخی ئیسلام، ئیبن تەیمیە وەڵامێکی گشتی و زۆر شتی تری لەژێردا کۆدەبێتەوە، بۆیە هەندێ لە پرسیارەکەی بەڕاشکاوی وەڵام نەداوەتەوە، بەڵام ئەگەر بە وردی سەیری وەڵامەکانی بکەیت و لێکیبدەیتەوە ئەوە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی تێدا دەبینیت، وە شێخی ئیسلام -ڕەحمەتی خوای لێبێت- هەرکاتێك پرسیارێکی لێکرابێت ئەوە بەشێوەیەکی گشتی وەڵامی داوەتەوە، نەك تەنها پرسیار لێکراوەکە، وەك لەمەودواش لە وەڵامی پرسیارەکانیدا بە ڕوونی دەیبینیت. وەرگێڕ.

# ئارەق خۆرو چەند ئاگادارکردنەوەیەك

شێخی ئیسلام – ئیبن تەیمیە – (خوا لێی خۆش بێت) لەمەڕ ئارەق خۆر پرسیاری لێکرا:

ئایا سڵاوی لێ دەکرێت؟ وە ئەگەر سڵاویشی کرد وەڵامی دەدرێتەوە؟ وە ئایا لە پاش مردن تەرمەکەی لە وەختی بەگۆڕسپاردندا وەك تەرمی موسوڵمان مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت؟ وە ئەگەر گومانی لە حەڕامبوونی ئارەقەکەدا هەبوو، ئەوە حوکمی کوفری هەیەو پێی کافر دەبێت؟ .. لە وەڵامدا فەرمووی: پاش سوپاس بۆ خوای بەرز، هەرکەسێك بە ئەندازەیەك لە کردەوە خراپو قەدەغە لێکراوەکان ئەنجام بدات، وەك: بەدڕەوشتیو شەڕواڵ پیسی،و ئارەق خواردنەوە، دەست درێژی کردنە سەر خەڵکی،و غەیری ئەمانەش، ئەوە بەگوێرەی تواناو بۆ لوان قەدەغەکردنی –واجب–ە. وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فأن لم يستطع فبلسانه فأن لم يستطع فبقلبه وذلك اضعف الإيمان) رواه مسلم. واتە: (هەر کەس لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بەدەست بیگۆڕێت، جا ئەگەر نەیتوانی ئەوە با بە زبان بیگۆڕێت، وە ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت وە ئەوەش لاوازترین ئیمانە) جا ئەگەر ئەو کابرایە بە پەنهانی ئەو کردەوە خراپەی دەکردو ئاشکرای نەدەکرد، ئەوە بەنهێنی بەرهەڵستی دەکرێو بۆی دەپۆشرێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من ستر عبدا ستره الله في الدنيا والأخرة) رواه البخاري ومسلم. واتە: (هەرکەس عەیبی بەندەیەك بپۆشێت، خوا لە دونیاو دواڕۆژدا عەیبی ئەو دەپۆشێت). بەڵام ئەگەر ئەو کابرایە خراپەکەی بە ئاشکرا دەکردو نەیدەشاردەوە، ئەوە –واجب–ە بە ئاشکرا بەرهەڵستی لێ بکرێتو بە ئاشکراش سزا بدرێت، بە سزایەك کە خۆیو خەڵکانی تریش بترسێنێتو لە خراپە بیان گێڕێتەوە، جا هەر بۆیە نابێت

سەلامی لێبکرێت، وە وەڵامی سەلامیشی نادرێتەوە، ئەگەر هاتوو دەتوانراو زیانێکی گەورەتری لێ نەدەکەوتەوە!!

وە پێویستە ئەهلی (خەیرو دین) هەروەك چۆن بە زیندویی بوغزاندویانە ئاوهاش بە مردوویی وازی لێ بێنن‌و بیبوغزێنن، ئەمەش ئەگەر هاتوو ئەو سزایە دەبویە هۆی چاوترسانی ئەوو هاوچەشنەکانی ئەو کابرایە، جا بۆیە دەبێ: ئامادەی ناشتن‌و ڕێکخستنی تەرمەکەی نەبن، هەروەك پێغەمبەری خواش ﷺ زۆرێك لەوانەی کە جەریمەیان کردووە نوێژی بە سەرەوە نەکردوون، بۆ وێنە: جارێکیان بە (سومرەی کوڕی جوندب)یان وت: کوڕەکەت دوێ شەو خەریك بوو بمرێت- بەهۆی زۆر خواردنەوە- ئەویش وتی: ئەگەر بشمردایە ئەوە نوێژم لەسەر نەدەکرد چونکە خۆی یارمەتی کوشتنی خۆیی داوە، بۆیە وەك ئەوە وایە کە خۆیی کوشتبێتەوە، جا پێغەمبەر ﷺ کابرایەك خۆی خۆیی کوشتبێتەوە نوێژی لەسەر نەکردووە، بەڵام ئەگەر ئەو کابرایە تەوبەی کردو گەڕایەوە، ئەوە دەبێ هەردەم چاکەی لە ئاقار بکرێت، وە هەر کەسێك ئینکاری شتێکی -حەڕام- کە بە موتەواتیری حەڕام بێت بکات، وەك: ئارەق خواردنەوەو خواردنی مرداڕۆبوەو شەڕواڵ پیسی‌و بەدڕەوشتی‌و...هتد.

یان گومانی لە حەڕام بوونیدا هەبێت، ئەوە ئەو کابرایە لە سەرەتاوە داوای تەوبەی لێ دەکرێ‌و وریا دەکرێتەوە کە ئەو ڕەفتارە -حەڕام-ە، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر تەوبەی نەکرد، ئەوە دەبێ بکوژرێت‌و بە (مورتەد) پاشگەزبووەوەش لە قەڵەم دەدرێت، وە نوێژی مردوی بە سەرەوە ناکرێ‌و لە گۆڕستانی موسوڵمانانیشدا نانێژرێت[1]!!.

---

[1] خوێنەری بەڕێز: شێخی ئیسلام کە ئەم فەتوایەی داوە نابێت بەهەڵە لێی حاڵی ببین، چونکە (تنفیذ) کردنی ئەو حوکمانە لەسەر خەلیفەی موسڵمانانەو لەکات‌و مەرجی تایبەتی خۆیدایە، نەك هەر کەسێك هەڵسێ‌و بە ئارەزوی خۆی شت بکات. وەرگێڕ.

## غەیبەتکردنی فاسق‌و حوکمی ئامادەبوون لەو جێگایانەی کە سەرپێچی خوای گەورەیان تێدا دەکرێت

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (خوای لێ ڕازی بێت) پرسیاری لێ کرا سەبارەت بەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (لا غيبة لفاسق) واتە: مرۆڤی فاسق باسکردنی غەیبەت نیە) وە ئایا سنوری فسق چیە؟ وە ئەگەر کابرایەك ئارەق خۆر بوو یان لەلای ئارەق خۆران دادەنیشت، یان حەرام خۆر بوو. یان هەردەم ئامادەی سەماو ڕەقس بوو، یان گوێی لە (دەف) دەگرت، یان شمشاڵ ئایا ئەو کەسەی کە سڵاوی لێ ناکات تاوانبار دەبێت؟. ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: سەرەتا ئەو فەرمودەیە، ئەوە وتەی پێغەمبەر ﷺ نیە بەڵام لە حەسەنی بەصریەوە هاتووە کە وتویەتی (ئایا خۆتان لە باسکردنی -فاجر- لادەدەن؟!! باسی بکەن بۆ ئەوەی خەڵکی بیناسن‌و خۆیانی لێ قوتار بکەن، وە لە قسەیەکی تردا هاتووە کە دەڵێ: (هەر کەس پەردەی شەرمی لە خۆی فرێدا، ئەوە باسکردنی غەیبەت نیە) بۆیە دوو جۆر لەخەڵکی "بەبێ جیاوازی زانایان" غەیبەتیان -جائز-ە.[1]

یەکەمیان: پیاوێکە بە ئاشکرا تاوان دەکات، وەك ستەمکردن‌و بەدڕەوشتی‌و شەڕواڵ پیسی‌و کاری زیادە داهێنراو (بیدعە) لە دیندا، کە پێچەوانەی قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت، جا ئەگەر بە ئاشکرا خراپەی دەکرد، ئەوە -واجب-ە، بەگوێرەی توانا بەرهەڵستی لێبکرێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فاءن لن يستطع فبلسانه فأن لم يستطع فبقلبه وذلك اضعف الإيمان) رواه مسلم. وە ئەبوبەکری صدیق -خوای لێ ڕازی بێ- دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە ئێوە لە قورئاندا ئەم ئایەتە دەخوێننەوە بەڵام لە شوێنی مەبەستی خۆیدا داینانێن: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا

[1] چەند کاتێکی تردا غەیبەت جائیزە، لەدوایدا خۆی ئامارژەی بۆ دەکات. وەرگێڕ

عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ)(المائدة:١٠٥) وه من له پێغەمبەرم ﷺ بیستووه كه دەیفەرموو: (بەڕاستی خەڵكی ئەگەر خراپەیەكیان بینیو نەیانگۆڕی، ئەوه ئیتر نزیكه خوای گەوره لەلایەن خۆیەوه به گشتی سزایەكیان بۆ بنێرێ) رواه احمد وابن ماجه.

دووەمیان: ئەگەر یەكێك ڕاوێژی پێكرا سەبارەت به پیاوێك كه دەیانەوێ ژنی لێ ماره بكەن، یان مامەڵەی لەگەڵدا بكەن یان به شایەت بیگرن، ئەمیش دەیزانی كه ئەو كابرایه بۆ ئەوه ناگونجێت، واته: -ژنی پێ بدرێو سەودای لەگەڵ بكرێ-، بۆیه لەو كاتەدا دەبێ ئامۆژگاری بكاتو باسی ئەو كابرایەی بۆ بكات كه دەربارەی ڕاوێژی بەم كردووه وەك، له ڕێگەی -صحیح-ەوه هاتووه (فاتیمەی كچی قەیس) به پێغەمبەری ﷺ وت: (ئەبوو جەهم)و (معاویه) خوازبێنی منیان كردووه، ئەویش پێی فەرموو: ئەبوو جەهم پیاوێكه هەردەم له ئافرەتان دەداتو (موعاویه)ش پیاوێكی هەژارەو هیچ پارەی نیه) رواه مسلم.

سەیر دەكەی پێغەمبەر ﷺ حاڵی ئەو دوو خوازبێنیكەرەی بۆ ئەو ئافرەته ڕوون كردەوه، ئەمەش بەڵگەیه بۆ گوفتارەكەی (حەسەنی بەصری) كه دەیفەرموو: (باسی "فاسق" بكەن بۆ ئەوەی خەڵكی خۆیانی لێ قوتار بكەن) چونكه ئامۆژگاری له (دین)دا له ئامۆژگاری له (دونیا)دا گەورەتره، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری ئافرەتێكی بۆ دونیا كردبێت، ئەوه ئامۆژگاریكردنی بۆ دینی حەوت جار پێویستتره!! وەئەگەر كابرایەك وازی له نوێژكردن هێنابوو، وه كردەوەی خراپیشی ئەنجام دەدا، پیاوێكی تریش هاوڕێیەتی دەكردو مەترسی هەبوو كه زیانی بۆ دینەكەی هەبێت. ئەوه دەبێت باسی ئەو كابرایەی بۆ بكرێتو بۆی ڕوونبكرێتەوه، هەتاوەكو خۆی له هاوڕێیەتی كردنی بپارێزێت، یان ئەگەر پیاوێك بیدعەچی بوو، وه خەڵكیشی بانگ دەكرد بۆ بیروبڕوایەك كه پێچەوانەی (قورئان)و (سوننەت)ی

ـیغەمبەر ﷺ بوو، یان ڕێگەو ڕێچکەیەکی گرتبووەبەر کە پێچەوانەی قورئان)و (سوننەت)ی پێغەمبەر ﷺ بوو، وە مەترسیشی هەبوو کە خەڵکی ـەرەو گومڕاکردن ببات، ئەوە لەو دەمەدا دەبێ حاڵی ئەو کابرایە بۆ خەڵکی ـوون بکرێتەوەو پێویستە ئەم ڕوونکردنەوەیەش بۆ خوا بێتو بەشێوەی ـموژگاریش بێت، نەك لەبەر هەواو ئارەزووی خۆی!! بۆ وێنە: لەنێوانیاندا ـوژمنایەتیەکی دونیایی هەبێت، یان ئیرەیی بردن، یان ڕقی لێی بێت، یان کێشەیان لەسەر –منصب–و کورسی هەبێت،و بڕوات باسی خراپەکانی ـکاتو لەوەدا وای دەرخات کە مەبەستی ئامۆژگارییە، بەڵام لە ناخەوە مەبەستی شتێکی دیکە بێت.

ئەمەش لە کردەوەکانی (شەیتان)ە (انما الأعمال بالنيات وانما لكل امرء ما نوي) رواه البخاري ومسلم. وە بۆ هیچ کەسێك –جائز– نیە بەبێ زەرورەت بە ئارەزووی خۆی ئامادەی ئەو جێگایانە بێت کە –مونکەر–یان تێدا دەکرێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من كان يؤمن بالله واليوم الأخر فلا يجلس على مائدة يشرب عليها الخمر) رواه ابوداود والترمذي. واتە: (هەرکەس ئیمانی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، با لەسەر سفرەیەك دانەنیشێت کە ئارەقی لەسەر بخورێت) وە جارێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز (خوا لێی خۆش بێت) ئاگادار کرایەوە کە کۆمەڵێك ئارەق دەخۆنەوە، ئەویش فەرمانی بە (شەلاق) لێدانیان کرد، جا پێی وترا: ئاخر پیاوێکی ڕۆژوەوانیان تێدایە!! فەرمووی دەی لەوەوە دەست پێ بکەن، ئایا ئەزانن خوا دەفەرموێت: (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلاَ تَقْعُدُوا مَعَهُمْ فَلاَ تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ) (النساء:١٤٠) واتە: (لە قورئاندا بۆتان دابەزیوە ئەگەر هاتوو بیستتان ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانرانو گاڵتەی پێدەکرا، ئەوە ئێوە لەگەڵ ئەو

**کۆمەڵەدا دامەنیشن، هەتاکو دەست بە قسەوباسی دیکە دەکەن، جا ئەگەر ئێوە لەگەڵیان دانیشتن، ئەوە کەواتە ئێوەش وەك ئەوانن).**

**عومەری کوڕی عبدالعزیز (خوا لێی خۆش بێت) ڕوونیکردەوە کە خوای گەورە ئامادەبووی –مونکەر–ی وەك ئەنجام دەرەکەی لە قەڵەمداوە، بۆیە زانایان فەرموویانە: ئەگەر یەکێك بانگکرا بۆ چێشتی ژن گواستنەوە بەڵام ئەو ژن گواستنەوە مونکەری تێدابوو: وەك ئارەق خواردنەوە، یان شمشاڵو گۆرانی، ئەوە –جائز– نیە، ئامادەی بێت، چونکە خوای توانا فەرمانی پێکردووین بە ئەندازەی توانا بەرهەڵستی لە –مونکەر– بکەین جا بۆیە هەرکەس بە ویستی خۆی ئامادەی مونکەرێك بێتو بەرهەڵستی لێ نەکات، ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەری کردووە ﷺ کەواتە: ئەو کەسەی بە ویستی خۆی ئامادەی دانیشتنی ئارەق خواردنەوە دەبێت– یان هەر مونکەرێکی تر– بەبێ پێویست، وە بەو شێوەی خوا فەرمانی پێکردووە بەرهەڵستی لێ نەکرد، ئەوە لە تاوانو (فیسق)ی ئەو دەستەیەدا وەك ئەوانەو سەرەنجامیش بەرەو ئەوان دەڕوات.**

# غەیبەتکردن

شێخی ئیسلام "ئیبن تەیمیە" خوا لێی خۆش بێت، دەربارەی غەیبەت پرسیاری لێکرا: ئایا جائیزە غەیبەتی کۆمەڵێکی دیاریکراو بکرێت وە حوکمی ئەوە چیە؟ فەتوامان بۆ بدەن‌و وەڵامێکی ئاسانمان بدەنەوە بۆ ئەوەی فەرمانبەران بە چاکەو بەرهەڵستی کارانی خراپە ئاگایان لەمە بێت، ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

پاش سوپاس‌و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، پێش هەموو شتێك پێویستە بزانرێت (غەیبەت) بریتیە لە باسکردنی براکەت بە شتێك کە پێی ناخۆش بێت وەك پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەربارەی غەیبەت پرسیاری لێکرا ئەویش بەم شێوەیە بۆیانی لێکدایەوە: (هي ذكرك اخاك بما يكره، قيل يا رسول الله، أرأيت ان كان في اخي ما اقول؟ قال ان كان فيه ما تقول، فقد اغتبته وان لم يكن فيه ما تقول، فقد بهته) رواه مسلم وابوداود. واتە: (غەیبەت باسکردنی براکەتە – لە پاش ملە– بە شتێك کە پێی ناخۆش بێت، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەگەر ئەوەی من دەیڵێم لە براکەمدا هەبوو؟ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی دەیڵێی تێیدا بوو ئەوە غەیبەتت کردووە، وە ئەگەر تێیدا نەبوو، ئەوە بوهتانت بۆ کردووە). پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموودەیەدا جیاوازی نێوان (غەیبەت)و (بوهتان)ی ڕوون کردۆتەوە کە ئەگەر بە درۆوە باسی براکەت بکەیت، ئەوە (بوهتان)ە، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (ان اليهود قوم بهت) اخرجه البخاري. واتە: (بەڕاستی جوولەکە گەلێکی بوهتان کەرن)، جا درۆکردن بەسەر کەسێکەوە بە گشتی قەدەغەیە، ئیتر ئەو کەسە موسوڵمان بێت‌و کافر بێت، یان چاك بێت‌و فاجر بێت وەك یەك وایە، بەڵام ئەوەندە هەیە درۆ هەڵبەستن بۆ موسوڵمان خراپترە، ئەگینا درۆ بە گشتی حەڕامە.[1]

---

[1] تەنها لەچەند شوێنێکدا چاوپۆشی لێکراوە، وەك لەم فەرمودەدا ئاماژەی بۆ کراوە: (في الإصلاح بين الناس، وفي الحرب، وفي الرجل يحدث إمرأته) رواه مسلم. نوسەر.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ جیاوازی خستۆتە نێوان (غەیبەت)و (بوهتان)ەوە، وە هەواڵیشی داوە کە ئەوەی باسی برا موسوڵمانەکەی دەکات بە شێوەیەك ئەو پێی ناخۆشە -ئەگەر لەو هەواڵەدا ڕاستیش بکات- ئەوە غەیبەتی کردووە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت: (ذکرك اخاك بما یکره) لەگەڵ ئەم ئایەتەدا گونجاوە کە دەفەرموێت: (وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ) (الحجرات:١٢) واتە: هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان مەکەن، ئایا یەکێك لە ئێوە پێی خۆشە گۆشتی براکەی خۆی بە مردوویی بخوات؟) سەیر ئەکەی ڕووی حەرامییەکەی لەوەدا دیاری کردووە کە ئەو کابرایە برای ئیمانییەتی بۆیە بە گوێرەی حاڵی ئەو موسوڵمانە غەیبەت کراوە، غەیبەتەکە گەورەترو پیستر دەبێت، واتە: هەتا کابرای غەیبەتکراو بڕوادارێکی باشترو بۆ خوا سوڵحاوتر بێت، ئەوە غەیبەت کردنەکەی توندترو پیستر ئەبێت.

وە هەروەها گاڵتەکردن بەخەڵکی و عەیب و عار لێنانیان یەکێکە لە جۆرەکانی (غەیبەت)، ئیتر چ بە کردەوە بێت کە پێی دەوترێت: (اللمز)، یان بە گوتارو قسە بێت کە پێی دەوترێت (ألهمز)، چونکە: هەردوکیان وەك (غەیبەت) تانەدان و عەیب و عارنانی خەڵکییان تێدایە[1]، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ) (التوبة:٥٨) واتە: (هەندێك لەو دوڕووانە لە دابەشکردنی زەکات و صەدەقەدا، عەیب و عارت لێ دەگرن) وە دەفەرموێت: (وَلاَ تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ)(الحجرات:١١) واتە: (تانە لە خۆتان مەگرن، هەندێکتان لە هەندێکی ترتان[2]).

وە لەچەندین ئایەتی تردا ئاماژە بۆ (هەممان) و (لەممان) کراوە.

---

[1] چەند جۆرێك گاڵتەکردن هەیە: ١- ڕووبەڕوو. ٢- لە پاشملە. ٣- بە چاو. -وەك چاو هەڵتەکاندن. ٤-بەزمان. -وەك زمان لێ داڕنین. ٥- بەدەست. لە تەفسیری ئیبن کثیردا ئاماژەی بۆ ئەم پێنج جۆرە کراوە. مختصر تفسیر إبن کثیر. م٣ ص٦٧٥. وەرگێڕ

[2] مختصر تفسیر إبن کثیر م٣ ص٣٦٢. وەرگێڕ

كەواتە دەڵێین:

ـسكردنی خەڵكی بەشتێك كە پێیان ناخۆش بێت لە بنچینەدا دوو جۆرە:
ـیەكەمیان: باسكردنی جۆرە، دووەمیان: باسكردنی كەسێكی دیاریكراوە
ـتر زیندوو بێت یان مردوو. سەبارەت بە یەكەمیان دەڵێین: هەر كۆمەڵێك
خواو پێغەمبەر ﷺ زەمیان كردبێت، ئەوە زەم كردنی "واجب"ە، وە ئەو زەم
كردنەش غەیبەت نیە، هەروەك هەر كۆمەڵێك خواو پێغەمبەر ﷺ پیایاندا
هەڵدابێت، ئەوە پیاهەڵدانی "واجب"ە، وە هەركەسێك خواو پێغەمبەر ﷺ
نەفرەتیان لێكردبێت ئەوە دەبێ نەفرەتی لێ بكرێت!!

بۆ نموونە: خوای گەورە زەمی بێبڕوای كردووە، وە زەمی فاسق و فاجرو، سودخۆرو، ستەمكارو، لادەرو، خۆبەگەورەزان و، پیسكەو، جادووگەرو، ـزو، شەرواڵ پیس و، زیناكەری كردووە.

هەروەك "مەدحی" بڕوادارو، لە خوا ترس و، ڕاستگۆو، چاكسازو، دادپەروەرو، ڕێگەپیشاندەرو، تێگەیشتوو، بەڕێزو، بەخشندەو، خاوەنی بەزەیی كردووە. وە پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لە سودخۆرو هەردوو شاهێدو نوسەری سودەكەش كردووە، وە نەفرەتی لە هەر كەسێك كردووە، كە ڕەفتارەكەی گەلی (لوط) بكات، واتە: نێربازی، وە نەفرەتی لەوە كردووە كە لە "دین"دا شتی زیادە دابهێنێت، وە نەفرەتی لە عارەق و گوشەرو هەڵگرو بۆ هەڵگیراو و فرۆشەرو كڕیارو بخۆرو پارەكەشی كردووە.

وە نەفرەتی لە گاورو جولەكە كردووە، وە خوای تۆڵەسێن نەفرەتی لەوانە كردووە كە ئایەتەكانی خوا دەشارنەوەو ڕوونی ناكەنەوە بۆ خەڵكی!!!

وە سەبارەت بە جۆری دووەمیشیان: دەڵێین كەسی دیاریكراو ئەو خراپەیەی كە تێیدایە لە چەند شوێنێكدا باسی خراپەی دەكرێت..

یەكەم: ستەملێكراو بۆی هەیە باسی سیفاتی ستەمكارەكەی بكات، یان بە شێوەی ئەوەی كە ستەمی ئەو ستەمكارە لە خۆی دوور بخاتەوەو مافی خۆی وەرگرێتەوە، وەك (هند)ی خێزانی (ئەبوسوفیان) وتی: (ئەی پێغەمبەری خواﷺ (ئەبوسوفیان) پیاوێكی ڕەزیلەو ئەوەندە نەفەقەم ناداتێ كە بەشی خۆمو منداڵەكانم بكات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەندەی كە بەشی خۆتو منداڵەكەت دەكات لە پارەكەی وەربگرە) رواه البخاری ومسلم.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ليُّ الواجدِ يحل عرضهُ وعقوبته) رواه البخاري. واتە: (كەمتەرخەمی كردنی كەسێك –كە هەشیەتی– لە دانەوەی قەرزەكەیدا كەرامەتو سزای حەلاڵ دەكات) "وكيع" دەفەرموێت: (كەڕامەتی) واتە: شكات لێكردنی (سزای) واتە: زیندانیكردنی، وە خوای گەورەش دەفەرموێت: (لاَ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنْ الْقَوْلِ إِلاَّ مَنْ ظُلِمَ) (النساء:١٤٨). واتە: (خوا ئاشكراكردنی خراپەی خۆش ناوێ لە قسەدا، مەگەر كەسێك ستەمی لێ كرابێت). ڕیوایەتێك هاتووە كە ئەم ئایەتە دەربارەی پیاوێك هاتووەتە خوارەوە كە بڕواتە لای كۆمەڵێ لە خەڵكیو ئەوانیش میوانداری نەكەن، ئەوە بۆی هەیە باسیان بكات، چونكە ستەمیان لێ كردووە[1]، جا ئەگەر لە حاڵەتێكدا ئەمە دەربارەی كەسێك بێت كە ستەمی لێكراوە بە نەكردنی میوانداری، ئەی چی دەوترێت سەبارەت بە كەسێك كە مافێك شایستەشیەتیو نایشی دەنێ؟!!

دووەم: دەتوانرێت بە شێوەی ئامۆژگاری موسوڵمان لە "دین" و "دونیا"یاندا باسی كابرایەك بكرێت، وەك (فاتیمەی كچی قەیس) كاتێك بە پێغەمبەر ﷺی وت: (موعاویە)و (ئەبوجەهم) خوازبێنیان كردووم، ئەویش

---

[1] ئەمە بۆچوونی زانای موفەسیر ئیمامی موجاهیدە، وە لەو بارەوە فەرمودەش هاتووە. مختصر تفسير إبن كثير م١ ص٤٥٢. وەرگێڕ.

فەرمووی: (موعاویە): ئەوە پیاوێکە هیچ پارەی نیە، (ئەبو جەهم)یش پیاوێکە هەردەم لە ژن دەدات) رواه ابوداود والنسائي والدارمي.
سەیر دەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردەوە کە (موعاویە) پیاوێکی نەبووەو ناتوانێت ماف خۆیی پێبدات، وە (ئەبو جەهم)یش بە لێدان ئەزیەتی دەدات.

جا ئەم ڕوونکردنەوەیە ئەگەرچی باسکردنی عەیبی ئەو دوو پیاوەی لە خۆگرتووە، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ ئافرەتەکە ئامۆژگارییە!! وە ئامۆژگاری پیاوێك بۆ ئەوەی کە مامەڵەو سەودای لەگەڵ دەکات، ئەویش هەر لەو جۆرەیە، یان کەسێك کە بە (وەکیل) یان (شایەت) دەگرێت، یان حوکمی بۆ لادەبات، جا ئەگەر ئەمە لەبەرژەوەندییەکی تایبەتدا –جائیز– بێت، ئەوە ئامۆژگاریەك کە پەیوەندی بە ماف تێکڕای موسوڵمانانەوە هەیە حەوت جار حەوت جار شایستەترە، وەك ئامۆژگاریکردنی ئەمیرەکان "الأمراء" یان حاکمەکان‌و بەرپرسەکان[1]، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (الدين النصيحة، الدينُ النصيحة، قالوا: لمن يا رسول الله؟ قال: لله ولكتابه، ولأئمة المسلمين وعامتهم) رواه البخاري ومسلم.

کەواتە: ئامۆژگاری لەبەرژوەندییە دینیەکاندا، چ تایبەتییەکان‌و ..چی گشتییەکان، واجبە، بۆ نموونە: ئەوانەی کە سەرقاڵی نەقڵکردنی فەرمودەی پێغەمبەرﷺن، ئەوانەیان کە هەڵەی تێدا دەکەن، یان درۆ دەکەن، ئەوە ..بێ بۆ خەڵکی باسبکرێن، وەك "ڕەحبانی کوڕی سعید" دەفەرموێت: پرسیا.. لە (مالك)و (ثوري)و (لەیث)و (ئەوزاعی) کرد سەبارەت بە پیاوێك کە لە

[1] مەبەست لەوەیە: ئەگەر ئامۆژگاری ئافرەتێك پێویست بێت لە شتێکدا کە بەرژەوە..ی تایبەتیشە، ئەوە ئامۆژگاریکردنی فەرمانەدەو لێپرسراوی موس..مانان‌و ئاگادارکردنەوەیا.. لە هەڵەکانیان بێگومان شایستەترە، چونکە بەرژەوەندی هەموو موس..مانانە. والله أعلم. وەرگێر

فەرمودەی پێغەمبەر ﷺدا گومانی لێکراوە، واتە: لە باسکردنیدا، یان لەبەرکردنی ساغو باش نیەو تێکەڵاوی دەکات!! ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: ئیشو کارو حاڵی بۆ خەڵکی ڕۆشن کەوە، وە یەکێك بە (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)ی (خوای لێ ڕازی بێت). وت: من لەسەرم بارێکی قورسە بڵێم: فڵان کەس واو فڵان وا، واتە: حاڵیان بۆ خەڵك ڕۆشن بکەمەوە، ئەویش وتی: ئەگەر تۆ قسە نەکەیتو منیش قسە نەکەم.. ئیتر خەڵکی بێ ئاگا چۆن ڕاست لە هەڵە جیا بکاتەوەو بیناسێت؟!

وە هەروەها پێشەوایانی (بیدعە) ئەوانەی کە قسەو عیبادەتیان پێچەوانەی (قورئانو سوننەت)ە، باسکردنیانو ڕوونکردنەوەی حاڵیانو ئاگادار کردنەوەی ئوممەتی ئیسلامی لێیان، بە کۆڕای هەموو موسوڵمانان واجبە، جارێکیان بە (ئیمامی احمد) وترا: پێت خۆشە پیاوێك نوێژی سوننەتو ڕۆژوی سوننەت بگرێو لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، یان دەربارەی (ئەهلی بیدعە) قسە بکات؟

ئەویش وتی: ئەگەر نوێژ بکاتو ڕۆژوو بگرێتو لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، ئەوە سودەکەی تەنها بۆ خۆیەتی، بەڵام ئەگەر سەبارەت بە (ئەهلی بیدعە) قسە بکاتو خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە، ئەوە سودەکەی بۆ هەموو موسوڵمانانە، بۆیە ئەمیان باشترە!!!

(ئیمامی احمد) ڕوونی کردەوە کە ئاگادارکردنەوەی ئوممەتی ئیسلامی لە(ئەهلی بیدعە) سودەکەی بۆ تێکڕای موسوڵمانانەو وەك "جیهاد" وایە، چونکە: پاککردنەوەی بەرنامەو ڕێگای خوا لە هەر زیادەیەك، وە ڕەتکردنەوەی دەستدرێژیو هێرشی دوژمنان، هەردوك فەرزی کیفایەیە، وە ئەگەر بێتو خوای گەورە دەستەیەك دروست نەکات بۆ ئەوەی زیانی (ئەهلی بیدعە) دوور بخەنەوە ئەوە دینی ئیسلام تێكو پێك دەچێت، بێگومان تێکچوونی دینەکەش لە سەرکەوتنی دوژمنان خراپترو ترسناکترە، چونکە لە

حەنێکدا ئەگەر دوژمنان سەر بکەون، ئەوە لەسەرەتاوە ناتوانن دڵەکان تێك ـدن. بەڵام بە "تەئکید" ئەهلی بیدعە هەر لەڕێوە دڵەکان تێكو پێك دەدەن! ـدی پێغەمبەرﷺیش دەفەرموێت: (ان الله لا ینظر الی صورکم واموالکم، و نما ینظروا الی قلوبکم وأعمالکم) رواه مسلم. واتە: (خوا سەیری شێوەو ماڵەکەتان ناکات!!! بەڵکو تەنها سەیری دڵەکانتانو کردەوەکانتان دەکات) وە خوای دادگەر دەفەرموێت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ لكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ للنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ) (الحدید:٢٥) لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای کاربەجێ ڕوونیکردۆتەوە کە (کیتاب)ی ناردووەو تەرازوو)ش بۆ ئەوەی خەڵکی هەستن بەبەرپاکردنی دادپەروەری، ئاسنیشی ناردووە، بۆ پاراستنی، بێگومانیش مانەوەو بەرپاکردنی (دین) بە کیتابێکی ڕێپیشاندەرو شمشێرێکی سەرخەرە، (وَكَفَى بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا) (الفرقان:٣١) دوژمنانی دینیش دوو جۆرن (کۆمەڵن): (بێبڕوایانو دووڕووان) خوای گەورە فەرمانی بە جیهادی هەردوو کۆمەڵەکە کردووە، وەك دەفەرموێت: (جَاهِدْ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ) (التوبة:٧٣) ئەگەر دەستەیەك هەم دوو ڕوو بوون، هەم بیدعەچیش، وە خەڵکیان پێ چاو بەست دەکرد بەڵام خەڵکیان لێ ئاگادار نەکرایەوە، ئەوە ئیتر دەرئەنجام (قورئان) تێکدەچێو (دین)ەکەش دەپڕوزێو دەگۆڕێت، هەروەك دینی میللەتانی پێشوو، بەهۆی ئەو گۆڕانکارییەوە کە تێیدا کراو کەس بەرهەڵستی لێ نەکردن تێکچوو!!!

بەس ئەگەر کۆمەڵێك خۆیان دوو ڕوو نەبوون، بەڵام گوێیان لە دووڕووان دەگرت، گومانیان وابوو کە قسەکانیان ڕاستە....

لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانەی (قورئان) بوو، وە وردە وردە وایان لێهات بانگەوازیشیان بۆ لای ئەو بیدعەیە دەکرد کە دووڕووەکان دایان هێنا، ئەوە

لەو حەلەدا پێویستە باسی ئەوانەش بکرێ‌و هەڵوێست‌و ئیش‌و کاریان ڕۆشنبکرێتەوەو تەنانەت ئەگەر پێویست بکات دەبێ دەستنیشانیان بۆ بکرێ‌و ناویشیان ببرێت، وە لەحەلێکدا ئەگەر ئەو بیدعەیان بە (دین) دەزانی‌و وا گومانیان دەبرد کە هەر ئەوە دینەو خێرە، ئەوە هەر واجبە حاڵیان بۆ خەڵکی ڕۆشنبکرێتەوە، بۆیە ئەو کەسەی کە لەگێڕانەوەو باسکردنی فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هەڵە دەکات، یان لە هەڵوێست‌و فەتوادا، یان لە بە ناو دونیا نەویستی‌و خواپەرستیدا.... ئەوە دەبێ حاڵی بۆ خەڵکی ڕوونبکرێتەوە، ئەگەرچی لەو ئیجتیهادەی کە دەیکات هەڵەی تێدا دەکات، خوا لێی خۆش دەبێت، پاداشتیشی بۆ هەیە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندییەکی گەورەتر هەردەبێ حاڵی بۆ خەڵکی ڕۆشنبکرێتەوە، وە بۆ هیچ کەسێك حەڵاڵ نیە کە دەم بکوتێتە ئەم جۆرە ئیشانە، تەنها کاتێك نەبێ کە مەبەستی خوا بێت‌و بۆ ئەوە بێت کە وشەی خوا هەردەم بەرز بێت، وە (دین) تەنهاو تەنها بۆ خوا بێت، وە هەرکەسێك لەم جۆرە ئیشانەدا، بەبێ زانیارییەکی تەواو قسە بکات، یان بە پێچەوانەوە، ئەوە گوناهبارە.

وە تەنانەت ئەوەشی کە بە زانیارییەوە لەم بابەتانەدا قسە دەکات، واتە: ڕونکردنەوەی ڕێگەی ئەهلی بیدعە، پێویستە زانیاریەکەی کامڵ‌و باش بێت‌و بۆ خوا بێت، چونکە ئەگەر باسی "حەق"ێك بکات، بەڵام لە ناخەوە مەبەستی خۆ بەرزکردنەوەو خراپەکاری بێت، ئەوە وەك ئەوە وایە کە لە پێناو "ڕیا" و "دەمارگیری" بەشەڕ بێت، بەڵام ئەگەر لەو قسەیەیدا مەبەستی خوا بێت، ئەوە لە تێکۆشەرانی ڕێگەی خواو میراتگری پێغەمبەرانە (علیهم السلام) وە ئەم باسکردن‌و ڕوونکردنەوەیەش پێچەوانەی ئەم فەرمودە نیە: (الغیبة ذکرك أخاك بما یکره) چونکە ئەوەی کە تۆ باسی دەکەی براوادارە، براواداریش ئەگەر ڕاست بکات ئەوە باسکردنی "حەق"ی نابێت پێ ناخۆش بێت، لەکاتێکدا خواو پێغەمبەر ﷺ پێیان خۆشە، بەڵکو لەسەر ئەویش فەرزە کە

مەستێت بە بەرپاکردنی دادپەروەری، وە هەردەمێك ڕوونکردنەوەی ئەو حەق"ەی پێناخۆش بێت ئەوە ئیمانەکەی نوقسانەو بە ئەندازەی نوقسانی بوونی ئیمانەکەیشی برایەتیەکەی نوقسان دەبێت، خوای گەورەش دەفەرموێت: (يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ) التوبة:٦٢) وە هەندێك خەڵکی هەیە، هاوڕێکانیان، ئەوانەی کە لەگەڵی دانیشتوون غەیبەتی کەسێك دەکەن، ئەمیش لەبەر ڕازی کردنی دڵی ئەوان، یەکسەر دەکەوێتە غەیبەتی!! لەگەڵ ئەوەشدا دەشزانێت بابای غەیبەت کراو. لەو شتەی ئەمان دەیڵێن بەریو پاکە، بەڵام وا دەزانێت ئەگەر ئەم بەرهەڵستییان لێبکاو بڵێ: خەڵکینە غەیبەتی مەکەن، ئەوە دەبێتە هۆی تێکچوونی مەجلیسەکەو بەکارێکی قورسی دەزانن‌و دەرئەنجام خوا حافیزی لێدەکەن!! جا وا دەزانێت ئەگەر ئەمیش وەك ئەوان بکات ئەوە کارێکی چاك‌و مایەی هاوڕێیەتیەکی باشە، هەر بۆیەش وای لێدێت ئەگەر ئەوان تووڕە بن، ئەمیش لەبەر تووڕەبوونەکەی ئەوان تووڕە دەبێت‌و ئەوان چی بکەن ئەمیش وا دەکات[1]!! وە هەندێ خەڵك هەیە غەیبەتەکە دەئاخننە چەند قاڵبێکی جیا جیاوە، وەك:

یەکەم: هەیە غەیبەتەکە دەخزێنێتە قاڵبی دینداریو چاکسازییەوە، واتە: وا خۆی دەردەخات کە مەبەستی خێرە، بۆ وێنە دەڵێت: من خوو ڕەوشتم وایە بە خێر نەبێت باسی کەس ناکەم، وە غەیبەت‌و درۆکردنم پێ خۆش نیە، بەڵام تەنها چەند شتێکتان سەبارەت بەو کابرایە پێ ڕادەگەیەنم، بۆیە دەڵێت: بەڕاستی فلانە کەس فەقیرە... یان دەڵێت: فلانە کەس پیاوی چاکە.. بەڵام ئەوەندەیە ئەمەو ئەوەی تێدایە، یان دەڵێ لێمان گەڕێ لەو کابرایە، وە باسی مەکە... خوا لە ئێمەش‌و ئێوەش خۆش بێت، بەڵام لە ناخەوە

---

[1] مەبەستی شێخی ئیسلام ئەوەیە کە ئەم جۆرە تێگەیشتن‌و بۆچوونە هەڵەیە. وەرگێڕ

مەبەستەکەی سوککردنو شکاندنی کابرای ناوبراوە، بۆیە دەبینی (غەیبەت)ەکە دەخەنە قاڵبی دینداریو چاکسازییەوەو دەیانەوێ بەو شێوەیە فێڵ لە خوا بکەن!!!

دووەم: هەیە بەشێوەی ڕیابازی کەسێك بەرز دەکاتەوە، بەڵام لە ناخیدا مەبەستی بەرزکردنەوەی خۆیەتی!! بۆ نمونە دەڵێ: ئەگەر دوێ شەو لە میانەی نوێژەکەدا دوعام بۆ فلان کەس بکردایە...ئەوە فلانو فیسار کردەوەی نەدەکرد، جا لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە خۆی بەرز بکاتەوەو ئەو بابایەش بشکێنێ[1]!! یان دەڵێ: فلانە کەس مێشکی باش نیە، زرنگو زیرەك نیە، تێگەیشتنی کەمو لاوازە!! لەمەشدا مەبەستی ئەوەیە بە خۆیدا هەڵدا کە ئەم شارەزایەو لەو باشترە، واتە: هەم خۆی پێ بەرز بکاتەوەو هەم ئەویشی پێ بشکێنێ!!.

سێیەم: هەندێکی تر هەن ئیرەیی هەڵیان دەپێچێ بۆ غەیبەتکردنی کەسێك، لێرەشدا دوو ئاکاری ناشرین لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە، (غەیبەتو حەسودی (ئیرەیی))، هەر بۆیەش هەمیشە ئەوەندەی بۆی بلوێ دەیشکێنێو سوکی دەکات، ئیتر لە قاڵبی دینداریدا بێت یان ئیرەیی (حسد)!!.

چوارەم: هەمیشە غەیبەتەکە لە قاڵبی یاریو گاڵتەکردنەوە دەکات، بۆ ئەوەی بە باسکردنو گاڵتەکردن بەو بابایە خەڵکی بخاتە پێکەنینەوە، هەتاوەکو دەرئەنجام کابرای گاڵتەپێکراو سوك دەکات.

پێنجەم: هەندێك غەیبەتەکە دەخەنە قاڵبی تێسوڕمانو سەرسوڕمانەوە، بۆ نمونە دەڵێ: من سەرم لە فلانەکەس سوڕ دەمێنێ، ئایا چۆن ئەوەو ئەوە

---

[1] واتە دەیەوێت بە تیرێ دوو نیشانە بپێکێ، یەکەم: خۆ بەرزکاتەوە کە دوعای گیرا دەبێو شەو نوێژ دەکات، دووەم: بۆ ئەوەی لەبەرچاو خەڵکی ئەو کابرای پێ بشکێنێ کە ئەوەو ئەمەی کردووە. وەرگێڕ.

ـكات. يان فلانه كەس چۆن ئەوەو ئەوەی لێ ڕوودا!!! يان بۆ ئەوەی كردو ـوەی نەكرد!!! بۆیە دەبینین غەیبەتی كابراكە لە قاڵبی سەرسوڕماندا ـدەكات!!

ـەشەم: دەستەیەكیش غەیبەتەكە دەخەنە قاڵبی دڵسۆزیو خەفەت بۆ خواردنەوە، بۆ وێنە دێتو دەڵێت: بەڕاستی فلانە كەس فەقیرە!! ئەوەی كە ـوچاری بوە، منی غەمبار كردوە، جا گوێگر وا هەست دەكات كە خەفەتو ـەسەف بۆ ئەو كابرایە دەخوات، بەڵام لە ناخیشەوە پێی خۆشە كە ئەو ـتەی دووچاری بووە باسی بكات، وە ئەگەر لە تواناشیدا بوایە زیاد لەوەی ـدەخستە سەر، وە زێدە جاریش دەڕواتە لای دوژمنانو ناحەزانی ئەو كابرایە بە چڕی باسی دەكات، بۆ ئەوەی دڵخۆشیان بكات...

حەوتەم: هەندێكیش غەیبەتەكە لە قاڵبی توڕەبوونو بەرهەڵستی كردنی مونكەر)ەوە ئاشكرا دەكەن!! بۆیە دەبینی چەندین قسەی زرقوبرق دەكاتو لە ناخیشەوە مەبەستەكەی پێچەوانەیە، خوا پەنامان بداتو هەردەم پارێزراومان بكات.

لەڕاستیدا ئەم جۆرە ئاكارانە لە گەورەترینی نەخۆشیەكانی دڵو دەروونو بە ڕووكەش فێڵ كردنە لە خواو خەڵكی[1].

---

[1] خوێنەری خۆشەویست: بەڕاستی ئەم جۆرە سیفەتە بەدانەی كە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە باسیكردن لە گەورەترینی ئەو نەخۆشییانەیە كە ئەمڕۆ موسوڵمانانی جیهان پێیەوە دەناڵێنن، بەشێوەیەك زاناو نەزانو موجاهیدو بانگبەرو سەركردەو سەربازو گەورەو بچوك پێوەی دەتلێنەوەو كەسمان لێی دەرباز نەبوین!! سا خوا بە میهرەبانی خۆی لێمان خۆش بێو شەیتانەكانمان لاواز بكات. وەرگێڕ.

## ئایا ئامادەبوون لەو شوێنانەی کە سەرپێچی خوایان تێدا دەکرێت، عەدالەتی پیاوی موسوڵمان دەڕوشێنێت؟!

شێخی ئیسلام – إبن تیمیه –ی حەڕڕانی پرسیاری لێکرا سەبارەت بە پیاوێك کە بانگهێشت دەکرێت بۆ شوێنێك، جا لەو شوێنەدا مونکەر دەبینێ و ناشتوانێت بیگۆڕێت، وە جاری واش هەیە خێزانیشی لەگەڵ خۆی دەبات، ئایا ئەمە –جائیز–ە؟! ئایا ئەم ڕەفتارە عەدالەت و متمانەی ئەو بابایە دەڕوشێنێت؟! ئەویش بەم چەشنە وەڵامی دایەوە.

بۆ هیچ مرۆڤێکی موسوڵمان نیە ئامادەی ئەو شوێنانە بێت کە خراپەو مونکەری تێدا دەکرێت و لەو دەمەشدا توانای بەرهەڵستی لێکردنی نەبێت... مەگەر تەنها لەبەر داخوازییەکی شەرعی، وەك: ئەمەی لەو شوێنەدا شتێك هەبێت کە ئەم بۆ بەرژەوەندی دین و دونیای پێویستی پێی بێت، جا بۆ وەدەستهێنانی ئەو شتە پێویستە خۆی ئامادە بێت، یان ئەگەر هات و بەزۆر ڕاپێچی ئەو شوێنەیان کردبوو!!! بەڵام ئەگەر تەنها بۆ ڕابواردن بوو، وە ژنەکەشی لەگەڵ خۆی دەبرد... وە ئەگەر بەردەوام بێت لەسەری ئەوا (عەدالەت) و (پیاوەتی)یشی هەردەم دەڕوشێنێت!! والله أعلم.

# دار الإسلام و كۆچكردن!!

ـيبن تەيميەی حەڕڕانی -خوای لێ ڕازی بێت- سەبارەت بە شاری (ماردین) پرسیاریان لێكرد كە ئایا (دار الكفر)ە یان (دار الإسلام)[1]؟ وە ئایا ئەو ـوسوڵمانەی كە نیشتەجێی ئەوێیە لەسەری فەرزە كۆچ بۆ وڵاتانی ئیسلام بكات یان نا؟ وە لە حاڵەتێكدا ئەگەر كۆچكردنی لەسەر واجب بوو، بەڵام هەر كۆچی نەكرد، وە بە "نەفس و ماڵ" یارمەتی دوژمنانی ئیسلامیشی دا، ئایا بەو ڕەفتارەی تاوانبار دەبێ؟!

وە ئەگەر كەسێكیش بەو كابرایە بڵێ دووڕووەو جنێویشی پێبدا، گوناهبار دەبێ یان نا؟! لە وەڵامدا فەرمووی: پاش سوپاس بۆ خوای گەورە: خوێن و ماڵی موسوڵمانان لە هەركوێ بن، هەردەم قەدەغەیە!! وە پشتگیریو یارمەتیدانی یاخیبوان لە بەرنامەی خوا -ئیتر خەڵكی (ماردین) بن یان هەر وڵاتێكی دیكە - قەدەغەیە، وە ئەو موسوڵمانە كە نیشتەجێی ئەو وڵاتەیە ئەگەر هاتوو لە ئاست بەرپاكردنی دروشمەكانی دینەكەیدا بێ توانا بوو، وە ڕێی لێ دەگیرا... ئەوە كۆچكردنی لەسەرشان واجب دەبێ!! بەڵام ئەگەر وا نەبوو ئەوا كۆچكردنەكە فەرز نیەو سوننەتە!!

وە یارمەتیو پشتگیری كردنیان لە بۆ دوژمنانی ئیسلام - چ بە ماڵ چ بە نەفس - لەسەریان قەدەغەیە!!

وەلەسەریان فەرزە كە بەهەرجۆرێك بۆیان دەلوێ یارمەتیان نەدەن و خۆیانی لێ قوتار بكەن، ئیتر بە خۆونكردن بێ... یان بە هەڵهاتن... یان هەر ڕێگەیەكی

---

[1] (دار الإسلام) ئەو شوێنەیە كە موسوڵمانان تێیدا باڵادەستن و یاسای ئیسلامی تێدا بەڕێوەدەچێ، كە پێشی دەوترێ (دار السلام) یان (دار السلم) وە (دار الكفر) ئەو شوێنەیە بێبڕوایانی تێدا باڵادەستن و یاسای كوفری تێدا بەڕێوە دەچێت، وە پێشی [illegible] (دار الحرب). وەرگێڕ.

دی... بەڵام ئەگەر تاکە ڕێگە بۆ خۆ قوتار کردن، هەر کۆچکردن بوو، ئەوە کۆچکردنیان لەسەر فەرز دەبێ، وە حەڵاڵ نیە بە شێوەیەکی گشتی جنێو بەهەموویان بدرێ‌و پێیان بوترێ: دووڕوو (المنافق) چونکە سیفاتی دووڕوەکان لە (قورئانی پیرۆز)و (سوننەت)دا تاووتوێ کراوە، جا ئەو سیفەتانە لە هەندێ خەڵکی وڵاتی (ماردین)دا هەیە، لە هەندێکیشیدا نیە!!
وە سەبارەت بەوەی کە ئەو شارە (دار الکفر)ە یان (دار الإسلام) دەڵێین: هیچ کامیان نیە بەڵکو –مرکب– لێکدراوە...
چونکە لە شوێنی (دار الإسلام)دا نیە، کە یاسای ئیسلامی تێدا پیادە بکرێ، وە (دار الکفر)یش نیە، کە خەڵکەکەی بێ بڕوا بن، بەڵکو جۆری سێیەمە، کە موسوڵمان بەشێوەیەکی گونجاو کاری تێدا دەکات‌و وە بە ئەندازەی بۆ گونجان لەگەڵ یاخیبوان بەبەرنامەی خواوە بەشەڕ دێن.[1]

[1] خوێنەری خۆشەویست: لەوانەیە پرسیارێك خوت خوتەی دڵت بدات کە ئایا ئەم پرسیارە لە ئیبن تەیمیە کراوە سەبارەت بەو شارە. ئێستە ئێمە چ پێویستیمان بە وەڵامەکەیەتی؟ لەوەڵامدا دەڵێم: ئیبن تەیمیە –ڕەحمەتی خوای لێبێت– کاتێ کە پرسیاری لێکراوە، وەڵامەکەی بە گشتی داوەتەوە، بەشێوەیەك زۆر وردە بابەتی تری لە ژێردا کۆ دەبێتەوە، بۆ نمونە: لەم پرسیارەدا (دارالکفر) و (دار السلام)ی باسکردووە، یان باسی ئەوەی کردووە کە لە چ کاتێکدا کۆچکردن فەرزەو چ کاتێکیش سوننەتە. یان باسی ئەوەی کردووە کە یارمەتیدانی دوژمنانی ئیسلام بە گشتی قەدەغەیە. وەرگێڕ.

# نامەیەکی ئیبن تەیمیەی حەڕڕانی بۆ لێپرساوی موسوڵمانان کە تێیدا هانی دەدات بۆ نوێژ بەرپاکردن و زەکات دان و فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە!

بسم الله الرحمن الرحيم

لە (ئەحمەدی کوڕی تەیمیە)وە... بۆ (سوڵتان)ی موسوڵمانان، جێگری پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو ئوممەتەکەیدا داواکارم خوای گەورە پشتگیری بکات بەجۆرێك کاروباری دونیاو دواڕۆژی موسوڵمانانی پێ چاك بکات... هەتاوەکو ئەو ئایەتەی (قورئانی پیرۆز) بیگرێتەوە: (الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنْ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ) (الحج:٤١) واتە: (ئەوانەی کە ئەگەر لەنێو زەویدا سەقامگیریان بکەین، سەریان بخەین و ببنە خاوەن هێز، ئەوە یەکسەر نوێژ بەرپا دەکەن، وە زەکات دەدەن، وە فەرمان بە چاکەو، جڵەوگیری لە خراپە دەکەن، کۆتایی هەموو ئیشەکانیش هەر بۆ خوایەو بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە). وە خوای گەورە بیخاتە بەر ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرﷺ (سبعةٌ يظلهم الله في ظله يوم لا ظل إلاّ ظله: إمام عادلٌ..... الخ) واتە: (حەوت دەستە، خوا لەڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری ئەو نەبێت، دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، یەکێك لەوانە پێشەوایەکی دادپەروەرەوە داواکارم پەروەردگار دەستی بگرێ و یارمەتی بدات... چونکە بەڕاستی لێپرساو ئاتاجترین مرۆڤی خوایە بۆ یارمەتیدانی خوایی... خوای گەورە دەفەرموێت: (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ

لَهُمْ دِينَهُمْ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا) (النور:٥٥) واته: خوا پەیمانی بەبڕواداران لە ئێوە داوە، ئەوانەی کە کردەوەی چاك دەکەن، کە لە نێو ئەم زەویەدا دەیانکات بە جێنشین، هەروەك ئەوانەی پێش ئێوەی کرد بە جێنشین، وە دینەکەی خۆیان بۆ سەردەخات، ئەو دینەی کە خوا ڕازیە هەردەم (دینیان) بێت، وە ترسیان بۆ دەگۆڕێ بە هێمنی، ئەوانە بەندایەتی بۆ من دەکەن‌و هیچ هاوەڵێکم بۆ بڕیار نادەن. شایەنی باسە چاکبوونی کاروباری سوڵتانی موسوڵمانان بە خۆ یەکلا کردنەوەیەتی بۆ شوێنکەوتنی (قورئانی پیرۆز) و (سوننەتی پێغەمبەرﷺ)و خەڵك خستە سەر ئەو ڕێگەیە، چونکە خوای گەورە لە دوای سەرکەوتن چوار مەرجی بۆ موسوڵمانان داناوە:

١/ نوێژ بەرپاکردن.

٢/ زەکات دان.

٣/ فەرمان بە چاکە.

٤/ جڵەوگیری لە خراپە.

چونکە لێپرسراوی موسوڵمانان ئەگەر هات‌و هەموو نوێژەکانی لە وەختی خۆیدا بە (جەماعەت) کردو فەرمانیشی کرد کە موسوڵمانان بیکەن، وە ئەگەر ئەندامێکیش کەمتەرخەمی تێدا کرد، سزایەکی شەرعی دا... ئەو سزایەی کە خوا بۆی دیاریکردووە، وە پاشان ئەگەر هەردەم لەوەختی بەرەبەیاندا پاڕایەوەو پەنای بۆ لای خوا بردو وتی: (یا حي یا قیوم لا اله الا انت برحمتك أستغیث) ئەوە ئیتر خوا دەرگای لێ دەکاتەوەو سەرکەوتن‌و دەسەڵاتێکی وای پێدەبەخشێ، مەگەر خوای گەورە هەر خۆی بزانێت چۆنە!!!

وەك دەفەرموێت: (وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنْ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوْ اخْرُجُوا مِنْ دِيارِكُمْ مَا فَعَلُوهُ إِلاَّ قَلِيلٌ مِنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا(٦٦)وَإِذًا لآتَيْنَاهُمْ مِنْ لَدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا(٦٧)وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا)(النساء:٦٦-٦٧)

واتە: (خەڵكی ئەگەر بهاتبا ئامۆژگارییەكانیان ئەنجام بدایە، لە ئەنجامدانی فەرمانو وازهێنانی قەدەغە، ئەوە چاكتر بوو بۆیان، لە وازهێنان لە فەرمانو ئەنجامدانی تاوان... وە جێگیركردنێكی توندتر بوو بۆیان، كەواتە ئێمە لەلایەن خۆمانەوە پاداشتێكی مەزنمان پێدەدان (بەهەشت) وە هیدایەتمان دەدان بۆ ڕێگەی ڕاست لە دونیاو لە دوارۆژدا[1]).

وە پاشان هەموو سودو چاكەیەك كە دەیگەیەنێت بە خەڵكی ئەوە وەك "زەكات" وایە، وە بنبڕكردنو نەهێڵانی هەژاریو دەستەبەركردنی پێویستیەكانو سەرخستنی ستەم لێكراوو، فریاكەوتنی بێنەواو خەفەتبار، لە مەزنترینو بڵندترینی عیبادەتەكانە!!!.

(فەرمان بە چاكە)ش بریتیە: لە فەرمانكردن بە هەر كارێك كە خواو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێ كردبێت، لە (دادپەروەر)یو (چاودێری خوا)و فەرمانكردن بە لێپرسراوەكان بە شوێنكەوتنی (كتاب)و (سوننەت)و وازهێنان لە قەدەغەكراوەكانی خوا!!!.

(بەرهەڵستی لە خراپەش) بریتیە: لە جڵەوگیری كردن لە هەر كارێك كە خواو پێغەمبەر ﷺ بەرگرییان لێ كردبێت[2]!! جا بۆیە: ئەگەر (سوڵتان)ی

---

[1] مختر تفسیر إبن كثیر م١ ص٤١١، وەرگێڕ.

[2] خوێنەری خۆشەویست: ئیبن تەیمیە -ڕەحمەتی خوای لێبێت- باسی چوار مەرجی كرد.

١. نوێژ. ٢. زەكات. ٣. فەرمان بە چاكە. ٤- بەرگری لە خراپە.

پاشان بەكورتی شەرحی هەریەكەیانی كرد، بۆیە لێت تێكنەچێت. وەرگێڕ.

**موسوڵمانان. له زۆربه‌ی شاره‌كانی ئیسلامدا، به‌م شێوه‌یه هاته پێشه‌وه، ئه‌وه مایه‌ی چاكسازی دونیاو دواڕۆژی خۆیی‌و موسوڵمانانه. والله یوفقه لما یحبه ویرضاه!!**

## بەشی سیاسەتی شەرعی

### پێشەکی نوسەر لە چەند دێڕێکدا

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە ڕووناکییەکانەوە -البينات- پێغەمبەرانی خۆی (عليهم السلام) ڕەوانە کردووە.. وە لەگەڵیشیاندا (بەرنامە) و (تەرازوو)ی ناردووە تا خەڵکی سەر زەوی هەستن بە بەرپاکردنی دادپەروەری!!

ئاسنیشی ناردووە کە هێزێکی توندی تێدایەو سودی بۆ خەڵکی هەیە، بۆ ئەوەی دەرکەوێ کێ یارمەتی دینی خوا دەدات؟! بەڕاستی خوا بەهێزو بە عیززەتە، وە کۆتایی پێغەمبەرانیشی (عليهم السلام) بە (محمد) هێناوە... چ پێغەمبەرێك ﷺ!! ئەو پێغەمبەرە ﷺ کە خوا بە دینێکی ئەوپەڕی ڕاستو دروستەوە ناردی، تا بەسەر دوا بەیەکی بەرنامەکانی تردا سەری بخات، ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە کۆکەرەوەی (زانستو هێزو قەڵەمو شمشێر) بوو!! وە شایەتی دەدەم کە تەنها "الله" نەبێت هیچ خوایەك نیە شایستەی پەرستن بێت، شایەتیەکی پاكو بێگەردو خاوێنتر لە ئاڵتون! وە شایەتیش دەدەم کە (محمدﷺ) بەندەو نێردراوی خوایە! لە پاشان:

ئەم نوسراوە پەرتوکێکی کورتە کە کۆکەرەوەی سیاسیەتی خوایی و بەڵگەی پێغەمبەرایەتیە بەشێوەیەك کە هیچ کام لە (سەرکردەو سەربان) لێی بێ نیاز نین! داخوازی نوسینی ئەم پەرتوکەش ئەرکی دڵسۆزییە، کە خوا فەرزی کردووە، بۆ هەر سەربازێك لە ئاست سەرکردەی وەك پێغەمبەری سەردار ﷺ دەفەرموێت: (ان الله يرضى لكم ثلاثة: أن تعبدوه ولا تشركوا به شيئا، وان تعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا، وأن تناصحوا من ولاه الله أمركم) رواه مسلم.

واتە: بەڕاستی خوا لە سێ کارتان ڕازیە: بیپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن، وە دەست بگرن بەبەرنامەی خواوەو جیاواز مەبن، وە ئەو کەسەی خوا کاروباری ئێوەی پێ دەسپێرێ هەردەم دڵسۆزی لەگەڵ بکەن...

## نێوەڕۆکی ئەم بابەتە

ئەم پەرتوکە لە میانەی دوو ئایەت لە (قورئانی پیرۆز) کە پێی دەوترێت: (آیة الأمراء). دامەزراوە، ئەو دوو ئایەتەش بریتین لە: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا(٥٨)يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً) النساء:٥٩) واتە: (خوا فەرمانتان پێ دەکات کە هەموو ئەمانەتەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان، وە ئەگەر لە نێو خەڵکیدا (حوکم)تان کرد ئەوە حوکم)بە دادپەروەرانە بکەن، بەڕاستی ئەم سیفەتە (حوکم کردن بە عدل) نیعمەتێکی زۆر جوانە کە خوا فەرمانتانی پێ دەکات، بەڕاستی خوا بیسەری بینەرە، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە فەرمانبەری خوا بکەن، وە فەرمانبەری پێغەمبەر ﷺ بکەن، وە لێپرسراوانیش لەخۆتان، وە ئەگەر لەکارێکدا ناکۆك بوون، ئەوا بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خواو ڕۆژی بەرێ هەیە!!! چونکە هەر ئەوە چاکترەو سەرەنجامی باشترە[1]).

زانایان دەفەرموون: ئایەتی یەکەم لەمەڕ لێپرسراوان دابەزیوە، کە لەسەریان فەرزە تێکڕای (ئەمانەت)و سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانی خۆیان، وە ئەگەر لە نێو خەڵکیشدا دادوەرییان کرد، ئەوە دەبێت بە ڕەچاوگرتنی دادپەروەری بێت، بەڵام ئایەتی دووەم لەمەڕ تاك تاکی موسوڵمانان هاتوەتە خوارەوە، کە لەسەریانە لە هەموو شتێکدا گوێ بیستی بەرپرسەکانیان بن، (دابەشکردنی شت، شەڕکردن، حوکم کردن) تەنها مەگەر فەرمانیان پێ کردن بەسەرپێچی خوا، جا ئەگەر فەرمانیان پێکردن بە سەرپێچی خوا، ئەوە بە

[1] تفسير القاسمي (محمد جلال الدين القاسمي) م٥ ص٢٤٢. وەرگێڕ

هیچ شێوەیەك نابێ گوێ بیستی بن، چونکە گوێڕایەڵی کردنی دروستکراو لەسەرپێچی دروستکەردا نیە، وە هەم ئەگەر لە شتێکدا ناکۆکییان تێکەوت، ئەوە دەبێ بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ کەواتە:

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەگەر (گێڕانەوەی هەموو ئەمانەتێك بۆ خاوەنەکەی)و هەروەها (حوکمی دادپەروەرانە)ی فەرزکردبێت.. دەی بێگومان ئەم دوو بنچینەیە کۆکەرەوەی سیاسەتی دادپەروەرانەو ویلایەتی صاڵحن!!

# بەشی یەکەم
# جۆرەکانی ئەمانەت

بەشی یەکەم

جۆرەکانی ئەمانەت

ئەم بەشە دوو بەندی لە خۆ گرتووە:

بەندی یەکەم

(الولايات) — (لێپرسراویەتی- کردن بە لێپرسراو-)

گێڕانەوەی ئەمانەتەکان دوو جۆرن:

یەکەمیان: (الولايات) لێپرسراوێتی.

-کردن بە لێپرسراو-،

چونکە هۆی دابەزینی ئایەتەکەش بریتی بووە لەوە..

جا ئەم بەندەیان بریتیە لە چوار فەصڵ:

# فەصڵی یەکەم

## ( هەڵبژاردنی چاکترین و گونجاوترین کەس بۆ هەر لێپرسراوێتییەك )

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە یارمەتی پەروەردگار شاری (مەککە)ی فەتح کردو لەلایەن (بەنی شەیبە) وەکلیلەکانی ماڵی خوای پێدرا، لەو دەمەدا (عەبباس) ی مامی داوای کرد کەکلیلەکان بدات بەو، بەڵام پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند (إن الله يأمركم... الخ) ئیتر پێغەمبەریش ﷺ کلیلەکانی ماڵی خوای گێڕایەوە بۆ (بەنی شەیبە)[1]. کەواتە: لەسەر لێپرسراوی موسوڵمانان فەرزە لە هەموو کارێك لە کاروباری موسوڵماناندا کەسێك بکاتە لێپرسراو کە چاکترین بێت بۆ ئەو کارە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (من ولي من امر المسلمين شيئا فولى رجلا وهو يجد من هو اصلح للمسلمين منه فقد خان الله ورسوله) رواه الحاكم. واتە: (هەر کەسێك بەشێك لە کاروباری موسوڵمانانی پێ بسپێردرێ و بڕوات پیاوێك بکا بە لێپرسراو لەکاتێکدا پیاوێکی تری دەستکەوێت کە لەوی پێشوتر بۆ موسوڵمانان چاکتربێت ئەوا ناپاکی لە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە!!)، وە

---

[1] ئەم ئایەتە دەربارەی (عثمانی کوری طلحة) دابەزی چونکەکاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ شاری مەککەی فەتح کرد کلیلی ماڵی خوا بەدەست (عثمانی کوڕی طلحة) وەبوو پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو کلیلەکانی لێوەرگرت پاشان دەرگاکەی پێکردەوەو چوەناویەوەو هاتەدەر ئیمامی (عەلی) داوای کرد کە کلیلەکانی ماڵی خوای پێبدات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (عثمانی کوڕی طلحة) لەکوێیە؟ بۆی بانگکراو پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی (عثمان) ها ئەوە کلیلەکەت ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەو وەفایە. سيرة ابن هشام م٤ ص٥٢ وتفسير ابن جرير الطبري م٨ ص٤٩٢ وتفسير ابن كثير. وەرگێڕ.

تێبینی: شایانی باسە ئێستاش لە (مەککە)ی پیرۆز کلیلەکانی (بيت الحرام) هەر بە دەستی نەوەکانی (بني شيبة)وەن و ئەو شەرەفە تا ڕۆژی قیامەت هەر بە ئەوان دراوە. وەرگێڕ.

ـەریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (من ولي رجُلاً على عصابة، وهو يجد في تلك لعصابة من هو أرضى لله منه، فقد خان الله ورسوله وخان المؤنين) رواه الحاكم في صحيحه.

واتە: (هەرکەس لەنێو دەستەیەك موسوڵماندا یەکێکیان بکاتە لێپرسراو، بەڵام هەر لەو دەستەیەدا یەکێکی تری دەست بکەوێت کە خوا لەو ڕازیتر بێ لە هی پێشوو، ئەوە ناپاکی لەخواو پێغەمبەرﷺو بڕواداران کردووە).

·عومەری کوڕی خەتتاب –خوای لێ ڕازی بێت–) دەفەرموێت: (من ولي من أمر المسلمين شيئا فولي رجُلاً لمودة أو قرابة بينهما، فقد خان الله ورسوله والمسلمين). واتە: (هەرکەس بەشێك لە کاروباری موسوڵمانانی پێبسپێردرێت، ئەویش بڕوات لەبەر خۆشەویستی یان خزمایەتی نێوانیان پیاوێ بکاتە لێپرسراو ئەوە ناپاکی لە خواو پێغەمبەرﷺو موسوڵمانان کردووە). جا شایەنی باسە لێپرسراوی موسوڵمانان لەسەری فەرزە کە بگەڕێت بە دوای ئەوانەدا کە بۆ لێپرسراوێتی شایستەن بۆ ئەوەی بە نوێنەرو جێگری خۆی بۆ شارەکانیان بنێرێت، ئیتر ئایا ئەوانە: (حاکمن، یان لێپرسراوی سەربازگەن، یان لێپرسراوی داراین، یان هەر کارێکی تر....)

ئەوە جیاوازی نیەو دەبێ کێ چاکترو شایستەترە ئەوە دابنێت، تەنانەت ئەوانەی کە (ئیمامی مزگەوتو بانگبێژو قورئان خوێنو مامۆستا)یان تێکڕای چینو توێژەکانی تریش هەر هەمان (حوکم)یان هەیە!! نابێت کەسێك پێش بخات هەر لەبەرئەوەی خۆی داوای لێپرسراوێتی کردووە، یان لە داواکردنەکەدا پێشکەوتووە، بەڵکو هەرکەس خۆی هەڵپە بکاتو بێتە پێشەوەو داوا بکات ئەوە دەبێت هەر پێی نەدرێت!! چونکە لەڕێگەی ڕاستەوە هاتووە، کە دەستەیەك هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺو داوای لێپرسراوێتییان لێکرد، ئەویش فەرمووی: (انا لانولي أمرنا هذا من طلبهُ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (ئێمە کەسێك لە کاروباری ئاینماندا خۆی داوای لێپرسراوێتی بکات. نایکەینە لێپرسراو)!!. وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە (عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە)ی فەرموو: (یا عبدالرحمن لا تسألي الأعمارة، فإنك إن أعطيتها من غير مسالأةِ، أُعنت عليها وإن أعطيتها عن مسألةِ، وكِلت اليها) رواه البخاري و مسلم. واتە: (ئەی عەبدوڕەحمان، داوای بەرپرسیارێتی مەکە، چونکە ئەگەر بەبێ داواکردنی خۆت پێت سپێردرا ئەوا لەلایەن خواوە لەسەری یارمەتی دەدرێیت، وە ئەگەر بە داواکردنی خۆت پێتدرا، ئەوە دەدرێیتە دەست خۆت!!) وە پێغەمبەری بەڕێزﷺ لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: (من طلب القضاء واستعان عليه، وكل إليه، ومن لم يطلب القضاء، ولم يستعن عليه، أنزل الله ملكا يسددهُ) رواه أهل السن. أبوداود والترمذي وإبن ماجه والنسائي.

واتە: (هەرکەس داوای بوون بە (قازییەتی) بکاتو بۆی تێبکۆشێ ئەوە دەدرێتە دەست خۆی، بەڵام هەرکەس خۆی داوای نەکاتو بۆی تێ نەکۆشێ ئەوا خوا فریشتەیەکی بۆ دەنێرێ تا هەردەم ڕاستی بکاتەوە!!) بەڵام ئەگەر لێپرسراوی موسوڵمانان لە کابرایەکی شایستەترو باشترەوە لایدا بۆ لای یەکێکی تر، ئەویش لەبەر (خزمایەتی نێوانیان یان هاوڕێیەتی یان هاوولاتییەتی یان هاو(مەزهەبیەتی) یان لەبەریەکبوونیان لە ڕەگەزدا وەك: عەرەبایەتی، فارسیەتی، تورکیەتی، ڕۆمیەتی، یان لەبەر ڕەشۆیەك لە پارەو هەرشتێکی دی کە لێی وەردەگرتن، یان هەر هۆیەکی تر، یان لەبەرئەوەی ڕقێکی لە دڵدایە بۆ بابای خاوەن شایستە، یان دوژمنایەتیو ناکۆکی نێوانیان، ئەگەر لەبەر ئەمانە لێپرسراوێتییەکەی پێ نە ئەدا، ئەوا ناپاکی لە خواو پێغەمبەرﷺو بڕواداران کردووە!! وە هەڕەشەی ئەم ئایەتەش دەیگرێتەوە (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ(٢٧)وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ

عَظِيمٌ) (الأنفال:٢٧-٢٨) واته: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، ناپاکی لە خواو پێغەمبەرﷺو ئەمانەتەکانتان -سپاردە- مەکەن لەکاتێکدا خۆتان دەزانن، وە بیشزانن کە ماڵو منداڵەکانتان تەنها بۆ تاقیکردنەوەیە! وە ئاگادار بن خوا پاداشتی گەورەی لایە!)

چونکە زۆرجار پیاوی وا هەیە لەبەرخۆشەویستی بۆ وڵاتەکەی یەکێك لەویتر پێش دەخات، یان شتێکی پێ دەبەخشێت، لەکاتێکدا شایستەی نیە! یان جاری واش هەیە ئەو بەخشینو پێشخستنە تەنها لەبەر وەرگرتنی پارەیەکە یان خۆشەویستییەکی تایبەت، دەی ئەوە -بەو کارەی- خیانەتی لە خواو پێغەمبەرﷺو ئەمانەتەکەیدا کردووە! پاشان ئەوەی کە ئەمانەتەکەی بەپاکیو بەپێی فەرمانی خوا دەگێڕێتەوەو گوێبیستی ئارەزووی خۆی نابێتو هیچ کات سەرپێچی ناکات ئەوە بێگومان خوای گەورە سەقامگیری دەکاتو لە پاش خۆیشی ماڵو منداڵەکانی دەپارێزێ! بەپێچەوانەوە ئەوەی گوێبیستی ئارەزووی خۆیەتیو زۆر خۆی ناپارێزێ، ئەوە پەروەردگار تۆڵەی لێ دەستێنێو بەپێچەوانەی ویستی خۆی بۆی دەکات! بۆیە هەم منداڵەکانی زەلیل دەکاتو هەم پارەو ماڵەکەشی دەفەوتێنێو دەرئەنجام ڕەنج بەخەساری دەکات!!.

لەمەڕ ئەم خاڵەش ڕوداوێکی بەناوبانگ هەیە: دەڵێ یەکێك لە خەلیفەی (عەبباسی)یەکان جارێك داوای لە زانایەك کرد ڕووداوێکی بۆ باس بکات کە خۆی پێی گەیشتبێو بینیبێتی؟!، ئەویش لە وەڵامدا وتی: جارێکیان بە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) -خوای لێ ڕازی بێت-یان وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئایا تۆ دەمی منداڵەکانت لەم -بیت المال-ە وشك دەکەیتەوەو هەروا لە پاش خۆت بە هەژاری بەجێیان دێڵی؟!! ئەویش فەرمووی: ئادەی بیانهێننە ژورەوە، جا بۆیان هێنانە ژورەوە، کە سەیر دەکەن (١٠) کوڕنو هیچیشیان باڵغ نەبوون!! کاتێك بینینی چاوی پڕ بوو لە فرمێسك! پاشان

فەرمووی: ئەی کوڕەکانم سوێند بە خوا هەر شتێك كە مافی خۆتان بوبێت لێتانم قەدەغە نەکردووە، وە من لەوانە نیم کە ماڵی خەڵکی هەڵگرمو بیدەم بە ئێوە، چونکە ئێوە یان "صالح"ن یان "نا صالح"ن، جا ئەگەر صالح بن، ئەوە خوا هەردەم یارمەتیدەری پیاو صاڵحانەو ئەگەر صاڵحیش نەبن ئەوە من شتێکتان بۆ بەجێ ناهێڵم کە یارمەتیدەرتان بێت بۆ سەرپێچی خوای گەورە!!

جا ئەو زانایە دەڵێ: یەکێك لەو کوڕانەییم دیت ئەوەندە خوا دەسەڵاتی پێدابوو تا "صەد" وڵاخی بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا بەڕێخست!! منیش دەڵێم: ئەمە لە کاتێکدا خەلیفەی موسوڵمانانیش بوو، لە ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتەوە – وڵاتی تورك– بۆ ئەوپەڕی ڕۆژئاوا –وڵاتی ئەندەلوس– لە ژێر دەستیا بوو، وە لە وڵاتی "جەزائیر"ەوە، بۆ "یەمەن" هەر لە ژێر دەستیا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەی لەدوا خۆی بەجێهێشت کە منداڵەکانی هەریەك ئەندازەیەکی زۆر کەمیان بەرکەوت!!

تەنانەت دەڵێن: لە "٢٠" درهەم کەمتر بوو!! کەچی لەم لایشەوە خەلیفەی وا هەبوو لە دابەشکردنی سەروەتەکەیدا منداڵەکانی هەریەکە (شەش صەد) هەزاری وەبەرکەوت، بەڵام لە پاشان منداڵەکانی سواڵیان دەکردو دەستیان لە خەڵکی پان دەکردەوە!!

بەڕاستی لەم بارەوە چەندین ڕووداوو چیرۆك هەن کە سەراپا پەندو ئامۆژگارییە بۆ هەموو خاوەن عەقڵێك! وە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لێپرسراوێتی ئەمانەتەو دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەڕ لێپرسراوێتی بە (ئەبو زەڕ)ی فەرموو: (إنها أمانة، وإنما يوم القيامة خزي وندامة، إلا من أخذها بحقها، وأدى الذي عليه فيها) رواه مسلم. واتە: (ئەی "ئەبو زەڕ": لێپرسراوێتی ئەمانەتە، وە لەڕۆژی قیامەتدا مایەی سەرشۆڕیو پەشیمان بوونەوەیە، تەنها مەگەر

کەسێك مافی خۆی بداتێ و ئەو ئەرکەی تێیدا لەسەر شانیەتی بە ئەنجامی
بگەیەنێت) وە ئیمامی "بوخاری" لە "ئەبو هورەیرە"وە دەگێڕێتەوە کە
پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا ضیعت الأمانة، فانتظر الساعة، قیل: یا
رسول الله ﷺ وما إضاعتها؟ قال: إذا وسد الأمر الی غیر أهله فأنتظر
الساعة). واتە: (هەرکات ئەمانەت فەوتێنرا ئەوە چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی
بکە! وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەوتانی ئەمانەت چیە؟! فەرمووی:
هەرکات کاروبار بە غەیری خەڵکانی شایستەی خۆی سپێردرا، ئەوە
چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی بکە!!).
شایەنی باسە زانایانیش تێکڕا لەسەر ئەم مانایە کۆ دەنگن، واتە:
لەسەرئەوەی کە لێپرسراوێتی ئەمانەتە...
ئەمەش لەبەرئەوەیە کە لێپرسراو بۆ خەڵکی وەك شوان وایە، ئەوەتا
پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (کلکم راع وکلکم مسؤولٌ عن رعیته...الخ)
اخرجاه في الصحیحین. واتە: (هەمووتان شوانن، هەموشتان لەمەڕ ژێر
دەستەکانتان بەرپرسن[1]...) وە پێغەمبەری سەروەر ﷺ دەفەرموێت: (مامن
راع یسترعیه الله رعیة، یموت یوم یموت وهو غاشٍ لها إلا حرَّم الله علیه رائحة
الجنة) رواه مسلم. واتە: (هیچ لێپرسراوێك نیە کە خوا کاری کۆمەڵێکی پێ
بسپێرێت، جا بمرێت ڕۆژێك بمرێت کە غەشی لێکردبن، ئەوە خوا بۆنی
بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات!!).
دەڵێ: جارێکیان (ئەبوموسلیمی خەوەلانی) چووبوە لای (موعاویەی کوڕی
ئەبوسوفیان) وتی: السلام علیك أیها الأجیر!! جا پێیان وت کە بڵێ: السلام
علیك أیها الأمیر، ئەویش هەر وتی: السلام علیك أیها الأجیر، وتیان بڵێ: أیها

---

[1] مەبەست لە شوان لێرەدا لێپرسراوەو مەبەست لە مێگەلیش جەماوەرە، ئەم وێك چونەش وێکچونێکی زۆر جوانەو پڕ بە پێستی خۆیەتی. وەرگێڕ.

الأمير! ئەویش هەر وتی: السلام علیك أیها الأجیر! لەو كاتەدا (معاویە) – ڕەزای خوای لێ بێ– فەرمووی: واز لە (أبومسلم) بێنن، چونكە خۆی باشتر دەزانێ بەوەی كە دەیڵێ، جا (أبومسلم)یش ڕوویكردە (معاویە)و وتی: تۆ تەنها كرێ گرتەیەكی كە خاوەنی ئەم خەڵكە گرتوێتی بە كرێ بۆ چاودێریكردنیان، جا ئەگەر بە چاكی لەگەڵیان مامەڵە بكەی ئەوە خاوەنەكەی كرێكەی خۆتت پێدەدات، بەڵام ئەگەر بە چاكی لەگەڵیان نەجوڵێیەوە، ئەوە خاوەنەكەی لێت ڕازی نابێ و سزات دەدات!!!

## فەصڵی دووەم

## هەڵبژاردنی چاکترین تا چاکتر

پێشەوای موسوڵمانان بۆی نیە هیچ کەسێك دابنێت گونجاوترین‌و چاکترین نەبێت، جاری واش هەیە لەوانەدا کە ئامادەن هیچ کامیان بۆ ئەو کارە گونجاوترین‌و چاکترین نین، جا لەوەدەمەدا دەبێ بۆ هەر جێگایەك بە گوێرەی خۆی کامیان باشترە ئەوەیان هەڵبژێرێت، پاشان باشتر تا باشتر..!! جا ئەگەر لە پاش تێکۆشانێکی تەواو بەم شێوەیە مامەڵەی کردو مافی لێپرسراوێتییەکەی خۆیدا، ئەوە ئیتر ئەمانەتەکەی خۆی گەیاندووەو بە واجبەکەی خۆی هەڵساوە، وە لەو جێگایەدا -لای خوای گەورە- لە پێشەوایانی دادپەروەری دەژمێردرێت، ئیتر ئەگەرچیش لە هەندێ وردەکاردا بەهۆی یەکێکی ترەوە هەڵەیەکیش بکات ئەوە قەیدی نیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ) (التغابن:١٦) واتە: (چەندە دەتوانن ئەوەندە پارێز لە خوا بکەن). وەدەفەرموێت (لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا) (البقرە:٢٨٦) وە بۆ جیهاد دەفەرموێت: (فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ وَحَرِّضْ الْمُؤْمِنِينَ) (النساء:٨٣) واتە: (لەرێگەی خوادا بجەنگە تەنها داوای خۆتت لێ دەکرێ، وە موسوڵمانانیش بۆ جیهاد هانبدە).
وە پێغەمبەر ﷺیش دەفەرموێت: (إذا أمرتكم بأمرٍ، فأتوا منهُ ما أستطعتم) اخرجاه في الصحيحين. واتە: (ئەگەر فەرمانم پێکردن بەکارێك، ئەوە چەندەی دەتوانن ئەوەندەی ئەنجام بدەن!)

وە پێویستە بۆ هەر شوێنێك‌و کارێك خەڵکانی شیاوو شایستە بناسرێن‌و دیاریبکرێن، چونکە هەموو لێپرسراوێتییەك لەسەر دوو پایە دامەزراوە!
یەکەم: القوة "هێز" بە توانایی.
دووەم: الأمانة "دەستپاکی".

وەك خوای گەورە دەفەرموێت، لەسەر زوبانی کچەکەی (شعیب) کە دەربارەی موسا "علیهم السلام" بە باوکی وت: (قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَاأَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنْ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ) (القصص:٢٦) واتە: ئەی باوکی خۆم: بیگرە بە کرێ، چونکە چاکترینی کەسێك کە تۆ بیگری بە کرێ ئەوەیە کە (بەهێز)و (دەست پاك) بێت، وە پاشای (مصر) بە حەزرەتی یوسفی وت: (إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ) (یوسف:٥٣) واتە: (ئەمڕۆ تۆ لەلای ئێمە خاوەن شوێن‌و ئەمانەتی). وە خوای گەورە لەمەڕ سیفەتی (جبریل)دا دەفەرموێت: (ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ(٢٠)مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ) (التكوير:١٩-٢١) واتە: ("جبریل" خاوەنی هێزێکە، لاشەی گەورەو بەهێزەو توند هەڵمەت دەبات، وە لەوێش لە ئاسمانەکان یان لە مەلەئی ئەعلی، بە گوێ کراوەو دەست پاکە، خاوەن ئەمانەتە[1]) بوونی هێزیش لەهەر لێپرسراوێتییەکدا بەگوێرەی ئەو ئیشەیە، بۆ نموونە: (هێز) لەسەرپەرشتی کردنی شەڕدا دەگەڕێتەوە بۆ ئازایەتی دڵ‌و، خیبرە بە شەڕو، فێڵ کردن تێیدا، چونکە "جەنگ" بریتیە لە "فێڵ" وە دەگەڕێتەوە بۆ توانینی جۆرەکانی شەڕ، وەك: ڕەمی کردن، یان هاویشتن، یان سواربوون،و هێرش بردن، گەڕانەوەو جۆرەکانی تریش، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ) (الأنفال:٦٠) وە (هێز) لە (حوکم کردن لەنێو خەڵکیدا) دەگەڕێتەوە بۆ: شارەزا بوون‌و ناسینی دادپەروەریی، ئەو دادپەروەرییەی کە (قورئان)و (سوننەت)ی پێغەمبەر ﷺ داکۆکی لێدەکەن، وە دەگەڕێتەوە بۆ توانینی جێبەجێکردنی یاسا شەرعییەکان!! بەڵام (ئەمانەت) دەگەڕێتەوە بۆ سێ شت: یەکەم: ترسان لە خوا.

دووەم: نەفرۆشتنی ئایەتەکانی خوا بە پارە. سێیەم: نەترسان لە خەڵکی.

---

[1] مختصر تفسیر إبن کثیر م٢ ص٢٥٤. وەرگێڕ.

ئەم سێ مەرجە خوای گەورە دایناوە بەسەر هەر کەسێکەوە کە بیەوێت حوکم) لەنێوان خەڵکیدا بکات، وەك دەفەرموێت: (فَلاَ تَخْشَوْا النَّاس واخْشَوْنِي وَلاَ تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلاً وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ) (المائدة:٤٤) واتە: (لەخەڵکی مەترسێن، بەڵکو لە من بترسن، وە ئایەتەکانی من بەنرخێکی کەم مەفرۆشن، وە هەرکەس بەوەی کە خوا ناردویەتی -قورئانی پیرۆز- حوکم نەکات، ئەوە ئەوانە بێبڕوان)، بۆیە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (القضاة ثلاثة: قاضيان في النار، وقاض في الجنة، رجل علم الحق وقضى بخلافه، فهو في النار، ورجلٌ قضى بين الناس على جهلٍ، فهو في النار، ورجُلٌ علِمَ الحق وقضى به، فهو في الجنة) رواه اهل السنن. واتە: (قازییەکان سیانن: دوانیان لەنێو ئاگردان‌و یەکێکیان لە بەهەشتدایە: پیاوێك (حەق) بزانێ‌و بەڵام بە پێچەوانەیەوە دادگایی بکات، ئەوە لە ئاگردایە، وە پیاوێك دادگایی لەنێو خەڵکدا لەسەر بنچینەی نەزانی بکات، ئەوەش لەنێو ئاگردایە، پیاوێکیش (حەق) دەزانێ‌و دادگایش بەو (حەق)ە دەکات، ئەوەیان لەنێو بەهەشتدایە).

قازیش: ناوێکە بۆ هەرکەسێك کە دادگایی‌و حوکم لەنێوان دوو کەسدا بکات، ئیتر ئەو کەسە (خەلیفە)یە یان (سوڵتان)ە یان (جێگر)ە یان....هتد، ئەوە وەك یەکە و هیچ جیاوازی نیە!!

# فەصڵی سێیەم:
## کەمی هەردوو سیفەتی "بەهێزیی و دەست پاکیی" لەنێو خەڵکدا

کۆبوونەوەی هەردوو سیفەتی (هێز+دەستپاکی)"القوة والأمانة" لەنێو خەڵکیدا کەمە، بۆیە (عومەری کوڕی خەتاب) -خوای لێ ڕازی بێ- هەردەم دەیفەرموو: (خوایە شەکوای جەربەزەیی پیاوی فاجرو، دەستەپاچەیی پیاوی پارێزکار، وەلای تۆ دێنم!!) بۆیە واجبە لەهەر شوێنێکدا -بەگوێرەی ئەو شوێنە- خەڵکی گونجاوو شایستە دابنرێت، جا ئەگەر هاتوو دوو پیاو دیاریکران، یەکێکیان (ئەمانەت)ەکەی زۆرتر بوو، ئەوی تریشیان هێزو تواناکەی زۆرتر بوو، ئەوە کامیان بۆ ئەو لێپرسراوێتییە بەسودترەو زیانەکەی کەمترە، ئەوەیان دەبێ وەپێش بخرێت.

بۆ نمونە: بۆ بەرپرسێتی "جەنگ" دەبێ پیاوی بەهێزو ئازا -ئەگەر هەندێ فجوریشی تێدا بێت- پێش پیاوی لاوازو بێ توانا- ئەگەرچی دەستپاکیش بێت- بخرێت، وەك دەڵێ: پرسیاریان لە ئیمامی (ئەحمەد) کرد لەمەڕ دوو پیاو لە (جەنگ)دا کە هەردووکیان فەرماندەن، یەکێکیان خاوەن هێزو فاجرەو، ئەوی دیکەیان پیاوچاكو لاوازە، ئایا لەگەڵ کامیاندا جیهاد دەکرێت؟! لە وەڵامدا وتی: فەرماندە بەهێزو فاجرەکە هێزەکەی بۆ هەموو موسوڵمانانەو فاجریەکەی تەنها بۆ خۆیەتی! بەڵام فەرماندە پیاوچاكو لاوازەکە چاکیەتییەکەی بۆ خۆیەتی و لاوازییەکەی بۆ تێکڕای موسوڵمانانە، بۆیە -جیهاد- شان بە شانی فەرماندە فاجرو بەهێزەکەدا دەکرێت، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (إن الله يؤيد هذا الذين بالرجل الفاجر) وروي (بأقوام لأخلاق لهم) رواه البخاري ومسلم. واتە: (خوا یارمەتی ئەم دینە بە پیاوێکی فاجریش بێت دەدات)، لە گێڕانەوەیەکی تردا: (بە کۆمەڵێکیش کە لە قیامەتدا، هیچ بەشێکیان نیە).

بۆیە دەبینی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بۆ فەرماندەیی شەڕ هەردەم خالیدی کوڕی وەلید)ی دادەنا، لەو کاتەدا کە خالید موسوڵمان بوو، وە دەیفەرموو: (إن خالداً سيف الله على المشركين) رواه الترمذي وأحمد. (بەڕاستی خالید شمشێری خوایە بۆ سەر هاوەڵ بڕیاردەران). لەگەڵ ئەوەشدا کەمو زۆر "خالید" هەندێ کاری ئەنجام دەدا پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستی لێ دەکردو پێی قەڵس دەبوو، تەنانەت جارێکیان دەرەنجامی کردەوەیەکی خالید ڕاوەستاو هەردوو دەستی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمانو فەرمووی: (اللهم إني أبرأ إليكَ مما فعلَ خالد) رواه البخاري. (خوایە من بەریم لەوەی کە خالید کردویەتی، واتە: من پێی ڕازی نیمو فەرمانم پێی نەکردووە)[١]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەردەم بۆ فەرماندەیی شەڕ دەیخستە پێشەوە، چونکە لەو ڕووەوە لە خەڵکانیتر شیاوترو باشتر بوو، ئەوەیشی کە دەیکرد بەجۆرێك -تأويل- ئەنجامی دەدا!!!.

بەڵام لەم لایشەوە (ئەبو زەڕی غەففاری)، خوای لێ ڕازی بێ، لە (ڕاستگۆیی)و (ئەمانەت)دا لە (خالید) باشتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموو: (يا أبا ذر إني أراك ضعيفاً، وإني أُحِبُّ لكَ ما أحب لنفسي، لا تأمرن على إثنين، ولا تولين مالَ يتيمٍ) رواه مسلم. واتە: (ئەی ئەبو زەڕ من دەتبینم لاوازی، وە ئەوەم کە بۆ خۆمم پێ خۆشە بۆ تۆشم پێ خۆشە، بۆیە داوات لێ دەکەم نەبیتە ئەمیری دوو کەس، وە ماڵی هەتیو لە ئەستۆ نەگری!!)

سەیر دەکەی بەرهەڵستی کرد، لەوەی کە ئەبوزەڕ ببێتە فەرماندەو لێپرسراو، چونکە دەیبینی بۆ ئەو کارە لاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بە ئەبو زەڕ

---

[١] ئەمە لەکاتێکدا بو پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی نارد بۆ لای (بني حذيمة)و هەموویانی کوشتو داراییەکەی هەموویانی هێنا، بەڵام ئەو ئیشەی کە کردی جائیز نەبوو بیکات، بۆیە کۆمەڵێك لەو هاوڕێیانەی کە لەگەڵیبوون بەرگرییان لێکرد لەسەر ئەو ئیشەی کە کردی، دوایی پێغەمبەر ﷺ خوێنی کوژراوەکانیداو ماڵو داراییەکانی گرتە ئەستۆی خۆی. نوسەر.

دەیفەرموو: (ما أظلت الخضراء ولا أقلت الغبراء أصدق لهجة من أبي ذر) رواه الترمذي وإبن ماجه، واتە: (ئاسمان سێبەری بۆ هیچ کەس نەکردووەو، زەوی هیچ کەسی هەڵنەگرتووە، لە (ئەبوزەڕ) ڕاستگۆتر بێت!!) تحفة الأحوذي شرح الترمذي- ج١، ص٢٨١ تا ٢٨٣.

یان جارێکیان لە شەڕی (ذات السلاسل)دا پێغەمبەری خوا ﷺ (عەمری کوڕی عاص)ی بەسەر کەسانێکەوە کردە فەرمانده کە لەویش باشتر بوون، وە (ئوسامە) جاروبار دەیکردە فەرماندە، بەو شێوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ڕەچاوگرتنی بەرژەوەندییەکی پەسەندتر پیاوێکی بەکاردەهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار هەندێك لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەبوون کە لە (ئیمان)و (علم)یش لەو باشتر بوون!!. بەهەمان پێودانیش (ئەبوبەکری صدیق) -خوای لێ ڕازی بێ- جێنشینی پێغەمبەر ﷺ "هەردەم لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا "اهل الردة" خالیدی کوڕی وەلیدی دەکردە فەرماندە، وە هەروەها لە فەتح کردنی (عێراق)و (شام)دا هەر ئەوی دەکردە سەرکردە!، وە ئەگەر جاروبار وردە شتی لێ ڕوودابا ئەوە لەبەر جۆرە (تأویل)ێك دەیکردو پێغەمبەرﷺیش تەنها سەرزەنشتی دەکردو لە فەرماندەیەتی لای نەدەبرد!!. چونکە بەرژەوەندی مانەوەی (خالید) لەزیانەکەی زۆرتر بوو، وە ئەو شوێنو بۆشاییەی کە (خالید) گرتبووی کەسی تر ئەوەی لەباردا نەبوو پڕی بکاتەوە!! جا هەر لەبەرئەوە ئەگەر هاتوو فەرماندە خوڕەوشتی بەرەو نەرمی دەڕۆیی، ئەوە پێویستە جێگرەکەی خوڕەوشتی بەرەو توندی بڕوات! وە ئەگەر خۆیشی توند بوو، ئەوە دەبێت جێگرەکەی نەرمو نیانو لەسەرخۆ بێت، بۆ ئەوەی ئیشەکەی ڕێك ڕاوەستێو هاوسەنگی بپارێزێت. بۆیە سەیر دەکەی (ئەبوبەکری صدیق) -خوای لێ ڕازی بێت- پێی خۆشبوو (خالد) وەك جێگرێکی خۆی لە شوێنان سەرکردە بێت، بەڵام (عومەری کوڕی خەتتاب) خوای لێ ڕازی بێت پێی خۆش بوو (خالد) لە فەرماندەیەتی عەزل بکرێتو (ئەبوعوبەیدەی جەڕاح) لە شوێنان بکرێتە جێگری خۆیی و

فەرماندە، چونکە (خالد) وەك (عومەر) توندبوو، وە (ئەبوبەکر)یش وەك (ئەبو عوبەیدە) نەرمو نیان بوو، بۆیە ئەوەی کە خۆیان دایان نابوو بەرژەوەندی هەر لەوەدا بوو، بۆ ئەوەی کارەکەیان ڕێكو هاوسەنگ بێت!!

وە ئەگەر هاتوو لەو کارەدا زیاتر پێویستی بە دەستپاکی دەکرد، ئەوە دەبێت پیاوی دەستپاکی بۆ پێش بخرێت، بۆ نمونە: مەسەلەی پاراستنی پارەو دارایی، ئەوە پیاوی دەستپاکی دەوێت، بەڵام کۆکردنەوەو پاراستنیشی ئەوە پیاوی خاوەن هێزو هەم دەستپاکیشی دەوێت، بۆیە دارایی دەبێ پیاوێکی دەستپاكو پیاوێکی خاوەن هێز تێیدا بکرێتە بەرپرس.

بەم شێوە لە تێکڕای ئیشو کارو لێپرسراوێتییەکدا ئەگەر بەرژەوەندی بە تاکە پیاوێك بەرجەستە نەدەبوو، ئەوە دەبێت لەو حەلەدا دوو پیاوی بۆ دابین بکرێت. لە کاروباری (دادگایی کردن)دا پێویستە پیاوێکی (زاناتر)و (خۆپارێزەرتر لەتاوان)و (بەهێزتر) پێشبخرێت، بۆیە ئەگەر دوو پیاو هەبوون، یەکەمیان زاناتر بوو، بەڵام ئەوی تریان خۆپارێزەرتر بوو لەتاوان، ئەوە سەیر دەکرێ: لەو جۆرە کێشانەدا کە حوکمەکەی ڕوونە بەڵام مەترسی ئارەزوو تێکەڵاو کردن هەیە، دەبێ ئەوەیان پێش بخرێت کە زیاتر خۆپارێزەرترە، لەملایشەوە ئەگەر کێشەکە حوکمەکەی ورد بوو، وە ترسی هەڵە تێداکردنی تێدا هەبوو، ئەوە دەبێت ئەوەیان وەپێش بخرێت کە زاناترە! چونکە لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺدا هاتووە: (ان الله یحب البصر النافذ عند ورود الشبهات، ویحب العقل الکامل عند حلول الشهوات) (بەڕاستی خوای گەورە لەکاتی هاتنی گومانەکاندا تێڕوانینێکی تیژی خۆش دەوێت، وە لەکاتی تێکەڵاوبوونی ئارەزووەکاندا عەقڵێکی کامڵی خۆش دەوێت[1]).

بەڵام ئەگەر دادگاییەکە زیاد لەو دوو مەرجە پێویستیشی بە هێزو توانا دەکرد، ئەوە دەبێ بابای خاوەن توانا پێشبخرێت. چونکە هەموو (قازی)یەك بە گشتی

---

[1] ئیبن تەیمیە -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- گێڕەرەوەی ئەم فەرمودەیەی باس نەکردووە. وەرگێر.

پێویستە: (زانا، دادپەروەر، بەتوانا) بێت. عالما+عادلاً+قادراً. بەڵکو هەموو لێپرسراوێك کەم‌و زۆر دەبێ ئەو مەرجانەی تێدا بێت، گومانیش لەوەدا نیە کە: هەر سیفەتێك لەو سێ سیفەتە ئەگەر نوقسان بوو نەهاتە دی، ئەوە بەگوێرەی ئەو نوقسانییە کەمی‌و ناتەواوی بەدەردەکەوێت.

جارێکیان پرسیار لە زانایەك کرا: ئەگەر کەس دەست نەدەکەوت بکرێتە لێپرسراوی دادگا، تەنها زانایەکی فاسق، یان نەزانێکی خاوەن (دین) نەبێت، ئایا لەو دەمەدا کامیان پێش دەخرێت؟! ئەویش وتی: ئەگەر ئەو کاتە.لەبەر زاڵبوونی فەساد، زیاتر پێویستی بە (دین) دەکرد، ئەوە خاوەن (دین)ەکە پێش دەخرێت، بەڵام ئەگەر لەبەر ونبوونی زانیاری، زیاتر پێویستی بە زانیاری دەکرد، ئەوە خاوەن زانستەکە وە پێش دەخرێت. بەڵام لەم لایشەوە لەبەر ناچاری‌و پێویستی جائیزە پیاوێکی ناشایستە بکرێتە لێپرسراو، ئەگەر ئەو لەو کاتەدا چاکترین بوو، وە لەو کاتەشدا کە خەڵکی شایستە نیەو خەڵکی ناشایستە بوەتە شوان‌و لێپرسراو، دەبێ ئەوپەڕی هەوڵبدرێت بۆ چاکسازیکردنی ئیش‌و کار، واتە: نابێت هەر چاوەڕوان بکرێت، بەڵکو دەبێت بۆ چاکسازیکردن‌و پەیداکردنی پیاوی لێهاتوو شایستە هەردەم تێکۆشان بکرێت، هەروەك چۆن کەسێك قەرزارەو ناتوانێت قەرزەکەی بداتەوە، ئەگەرچی لەو کاتەدا کە بێ توانایە داوای لێ ناکرێت، پێویستە تێ بکۆشێت بۆ دانەوەی قەرزەکەی، وە هەروەك چۆن - با کاتی جەنگیش نەبێت- خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد واجبە، چونکە وەك بنچینەکە دەڵێت: (ما لا يتم الواجب الا به فهو واجب)[1]

---

[1] شێخی ئیسلام -ئیبن تەیمیە- (رەحمەتی خوای لێ بێت) لێرەدا مەبەستی ئەوەیە: ئەگەر کابرایەکی ناشایستە لێپرسراوی موسوڵمانان بوو، ئەوە نابێت دەستەوسان موسوڵمانان دانیشن‌و چاوەڕوان بکەن، بەڵکو دەبێ ئیش بکەن‌و تێبکۆشن بۆ چاکسازیکردن‌و پەیداکردنی خەڵکی شایستە. وەرگێڕ.

# فەصلی چوارەم

# هونەری ناسینو دەستنیشان کردنی خەڵکی شایستە

گرنگترین بڕگەی ئەم بابەتە بریتییە لە چۆنیەتی ناسینی ئەو کەسەی کە شایستەترە، واتە: چۆن بناسرێت؟! ئەمەش بە دوو شت فەراهەم دێت:

یەکەم: ناسینو زانینی مەبەستی لێپرسراوێتی!

دووەم: زانینی ڕێگەی گەیشتن بەو مەبەستە!

چونکە ئەگەر مەبەستەکانو هۆکارەکان تاوتوێ کران، ئەوە کارەکە کامڵو سەرکەوتوو مسۆگەرە.

بەڵام لەبەرئەوەی زۆربەی دەستەڵاتدارو بەرپرسەکان مەبەستی دونیاداری – نەك (دین)– زاڵبووە بەسەریاندا، بۆیە دەبینی لە ئیشو کارەکاندا خەڵکانێك پێشدەخەن کە هەردەم لەسەر ئەو ئاواتو مەبەستانەیان یارمەتیدەریان بن!!

چونکە هەرکەسێك تاکە مەبەستی بەرزبونەوەی خۆی بێت، هەردەم کەسێك پێش دەخات کە ئەو بەرز بکاتەوە، واتە: کەسێك ناکاتە لێپرسراو کە دژی هیواو ئارەزوەکانی ئەو بوەستێت..

وە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە: ئەو کەسانەی نوێژی (جومعە)و (جەماعەت) دەکەنو وتار بۆ موسوڵمانان دەخوێننەوە، دەبێ فەرماندەی شەڕەکان بن، ئەوانەی کە جێگری سوڵتانی موسوڵمانانن بەسەر سەربازەکانەوە، هەر بۆیەش دەبینین لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکری لە نوێژدا خستە پێشەوە، موسوڵمانانیش تێکڕا بۆ فەرماندەیی جەنگ پێشیان خست!!

وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر فەرماندەیەکی بۆ جەنگ بناردبایە، فەرمانیشی پێدەکرد کە هەر ئەو نوێژ بۆ هاوڕێیانی بکات، وە هەروەها ئەگەر لە شاری (مەدینە) پیاوێکی بە جێگری خۆی دانابایە، هەر نوێژیشی بۆ

بڕواداران دەكرد! وە بەهەمان پێودان جێنشینەكانیشی لە پاش خۆیو هەندێك لە پادشاكانی (ئەمەوی)و (عەباسی)یەكانیش هەروەك پێغەمبەریان ﷺ كردوە، ئەمەش لەبەرئەوەیە كە: گرنگترینی فەرمانەكانی (دین) بریتییە لە (نوێژ)و (جیهاد) بۆیە دەبینین زۆرێك لە فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ لەمەڕ فەزڵی نوێژو جیهاد هاتوون، وە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سەردانی نەخۆشێكی بكردایە دەیفەرموو: (اللهم إشف عبدك، يشهد لك صلاة، وينكأ لك عدوا) رواه أبوداود وأحمد. واتە: (خوایە شیفای بەندەكەت بدە، چونكە ئامادەی نوێژ دەبێ و، وە دوژمنت لە خوێندا بۆ دەگەوزێنێ!!) وە پێغەمبەر ﷺ لەو دەمەدا كە (معازی كوڕی جەبەل)ی نارد بۆ وڵاتی (یەمەن) فەرمووی: (یا معاذ ان أهم أمرك عندي الصلاة) (ئەی "موعاز" بەڕاستی گرنگترین كاری تۆ لەلای من-نوێژە-) وە هەروەها (عومەری كوڕی خەتاب)، خوای لێ ڕازی بێ، هەمیشە بۆ نێردراوەكانی خۆی دەینووسی: (گرنگترینی ئیشەكانی ئێوە لەلای من نوێژە، هەركەسێك بیپارێزێو لەسەری بەردەوام بێت، ئەوە دینەكەی پاراستوە، وە هەركەسێك بیفەوتێنێت ئەوە ئیشەكانی تری زیاترو زیاتر دەفەوتێنێت!!)

وە نوێژیش بۆیە ئەوەندە گرنگە، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الصلاة عماد الدين) رواه البيهقي. (نوێژ كۆڵەكەی دینە). -ئەم فەرمودەیە لە سەنەدەكەیدا قسەكراوە-، وە نوێژ بەرهەڵستی دەكات لە هەموو كردەوەیەكی پیسو ناپەسەندو خراپ، وە هەر نوێژە یارمەتیدەری خەڵكیە بۆ ئەنجامدانی كردەوە چاكەكانی تر كە گوێڕایەڵی خوای گەورەی تێدا بێت، وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێت: (وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ) (البقرة:٤٥) واتە: (بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، هەردەم پەنا بە ئارامگرتنو نوێژكردن ببەن، وە بەڕاستی نوێژ كارێكی گرانو ناڕەحەتە،

تەنها لەسەر ملکەچان بۆ فەرمانی خوا ئاسانە[1]) وە دەفەرموێت: (أَيُهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (البقره:١٥٣) واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە: یارمەتی لە ئارامگرتنو نوێژ بخوازن، بەڕاستی خوا لەگەڵ ئارامگراندایە). وە بە فروستادەکەی خۆی دەفەرموێت: (وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاَةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لاَ نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى) (طه:١٣٢) (فەرمان بەماڵو منداڵەکەت بکە بە نوێژکردن، وە هەردەم لەسەری ئارامبگرە، ئێمە داوای ئەوەت لێ ناکەین بۆ پەیداکردنی ڕۆزی خۆت سەخڵەت بکەیت، بەڵکو خۆمان ڕۆزیت دەدەینێ، وە بەڕاستی دواڕۆژ هەر بۆ پارێزکارییە)[2].

مەبەستی سەرەکی -کە فەرزە- لە لێپرسراوێتیدا بریتیە لە دوو شت:

یەکەم/ چاککردنی دینی خەڵکی، ئەو دینەی کە هەرکات لە دەستیان چوو توشی خەسارۆمەندی دەبن!! وە سود لە هیچ نیعمەتێکی تری دونیا نابینن!!

دووەم/ چاککردنی ئیشو کاری دونیای خەڵکی، ئەو ئیشو کارانەی کە دینەکەش بەوەوە، وەستاوە، ئەمەشیان دوو جۆرە:

١) دابەشکردنی پارە لە نێوان ئەوانەی کە شایستەنی.

٢) سزادانی دەستدرێژی کاران.

بۆیە ئیمامی (عومەری کوڕی خەتاب) -خوای لێ ڕازی بێ- دەیفەرموو: (من نێردراوەکانی خۆم تەنها بۆ ئەوە دەنێرم بۆ لاتان کە: کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرتان ﷺ فێر بکەن،و "فەیئە"کەتان لەنێوانتاندا بۆ دابەش بکەن).

---

[1] مختصر ابن كثير م١ ص ٦٠-٦١

تێبینی: وشەی (الخاشعين) بەچەند جۆرێك لێكدراوەتەوە لەوانە: ١- الخاضعين. ٢-الخائفين. ٣-المصدقين بما انزل الله. ٤-المؤمنين حقاً. ٥- المتواضعين. هەمان سەرچاوە. وەرگێڕ.

[2] مختصر تفسير إبن كثير م٢ ص٤٩٩-٥٠٠. وەرگێڕ.

بەڵام -بە ئەسەفەوە- لەبەرئەوەی "قواعد" لە چەند ڕوویەکەوە گۆڕانو "قیادە"ش لە چەند ڕوویەکەوە، بۆیە ئیشو کارەکان هەڵوەشێندرانەوە، جا ئەگەر فەرماندەی موسوڵمانان -بەگوێرەی بۆ گونجان- تێبکۆشێت بۆ چاککردنی دینو ژینی بڕواداران، ئەوە لە چاکترینی ئەهلی چەرخی خۆیەتی، وە لە گەورەترینو بەرزترینی تێکۆشەرانی ڕێگەی خوایە، چونکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (یوم من إمام عادل أفضل من عبادة ستین سنة) رواه البیهقي والطبراني[1] (تاکە ڕۆژێکی پێشەوایەکی دادپەروەر لە خوا پەرستی شەست ساڵ چاکترە)! وە لە موسنەدی ئیمامی "احمد"دا هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (أحب الخلق الى الله إمام عادل، وأبغضهم الیه امام جائر) رواه احمد. (خۆشەویسترینی خەڵکی لای خوا، پێشەوایەکی دادپەروەرە، وە بوغزاوترینیان لەلای پێشەوایەکی ستەمکارە). وە لە "صحیحین"دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (سبعة یظلم الله في ظله یوم لاظل إلا ظلهُ: إمام عادلٌ، وشابٌ نشأ في طاعة الله، ورجل قلبه معلق بالمسجد اذا خرج منه حتی یعود الیه، ورجلان تحابا في الله، إجتمعا علی ذلك وتفرقا علیه، ورجل ذکر الله خالیا ففاضت عیناهُ، ورجل دعته امرأة ذات منصب وجمال فقال: إني أخاف الله رب العالمین، ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتی لاتعلم شماله ما تنفق یمینهُ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (حەوت دەستە پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەر نیە تەنها سێبەری ئەو نەبێت:

[1] ئیمامی (هیثمي) لە پەڕاوی (المجمع الزوائد)دا سەبارەت بە سەنەدی ئەم فەرموودە دەفەرموێت: (سەعیدی ئەبوغەیلانی شەیبانی تێدایە کە نایناسم، بەڵام پیاوەکانیتر هەموویان متمانە پێکراون) م٥ ص٢٠٠. وەرگێڕ.

پێشەوایەکی دادپەروەر، لاوێك کە لە فەرمانبەریکردن بۆ خوادا پێ بگات، وە پیاوێك دڵی بە مزگەوتەوە بەسترا بێت کاتێك کە دەچێت هەتاکو دەگەڕێتەوە، وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت، لەسەر ئەوە کۆ ببنەوەو هەر لەسەر ئەویش جیا ببنەوە، وە پیاوێك بە پەنهان یادی خوا بکاتو دەرەنجام چاوەکانی لەترسی خوا پڕ بێت لە ئەسرین، وە پیاوێك ئافرەتێکی خاوەن پلەو جوانی بۆ بەدڕەوشتی بانگی بکات، بەڵام ئەو بڵێ: من لە پەروەردگار جیهانیان دەترسێم، وە پیاوێك شتێك ببەخشێتو بیشارێتەوە، تەنانەت چەپی پێی نەزانێت بەوەی کە ڕاستی دەیبەخشێت!!!)

وە لە صەحیحی "مسلم"دا لە (عیازی کوڕی حمار)ەوە هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (أهل الجنة ثلاثة: ذو سلطان مقسط، ورجل رقيق القلب بكل ذي قربى ومسلم، ورجل غني عفيف متصدق) رواه مسلم. (بەهەشتییەکان سێ کۆمەڵن: خاوەن دەسەڵاتێکی دادپەروەر، پیاوێکی میهرەبانی دڵ نەرم بۆ هەموو خزمو موسوڵمانێك، وە پیاوێکی دەوڵەمەندی پاکی بەخشەر).

کەواتە: مەزنترین مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە دین هەر هەمووی تەنها بۆ خوا بێت وەتەنهاو تەنها وشەی خوا سەرکەوتوو بێت، وشەی خواش: ناوێکی کۆکراوەیە بۆ دوا بەیەکی ئەو وشانەی کە لە "قورئانی پیرۆز"دا هاتووە!! خوای گەورەش دەفەرموێت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمْ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ) (الحديد:٢٥) واتە: (ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان بە گەلێ بەڵگەو نیشانەی ڕوونەوە ناردووە، وە لەگەڵیشیاندا کتێبو پڕۆگراموتەرازومان دابەزاندوە، بۆئەوەی خەڵکی بەدادپەروەریی بەڕێوەبچن)

کەواتە: مەبەست لە ناردنی پێغەمبەرانو دابەزاندنی کتێبە ئاسمانییەکان، بریتیە لەوەی کە: خەڵك لە مافەکانی خواو دروستکراوەکانیدا هەردەم دادپەروەریی بەرپا بکەن! پاشان دەفەرموێت: (وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ

شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ) (الحديد:٢٥) (وه ئاسنیشمان ناردۆته خوارەوە، که هێزێکی توندی تێدایەو سودی بۆ خەڵکی هەیە. بۆ ئەوەی خوا بزانێت کێ به پەنهان خواو پێغەمبەر ﷺەکەی سەردەخات؟!)

بۆیه هەرکەس لەبەرنامەی خوا لایداو یاخی ببێ، ئەوه دەبێ به ئاسن ڕاست بکرێتەوە، وه بەرپاکردن‌و مانەوەی ئەم دینەش تەنها به (قورئانی پیرۆز) و (شمشێر)ە، چونکه (جابری کوڕی عبدالله) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (أمرنا رسول الله ﷺ أن نضرب بهذا -يعني السيف- من عدل عن هذا -يعني المصحف-) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین به شمشێر بدەین لەوەی که له "قورئان" لادەدات)

کەواته: ئەگەر مەبەست له لێپرسراوێتی ئەمه بێت، واته: (چاککردنی دینی خەڵکی + چاککردنی دونیای خەڵکی + دینی هەمووی بۆ خوا بێت) ئەوه کێ زیاترو زیاتر ئەو ئامانجه (إستراتيج)یەی پێ وەدەست دەهێنرێت دەبێ بەو بسپێردرێ، جا بۆیه سەیری ئەو پیاوه دەکرێت: کامیان زیاتر له وەدەست خستنی مەبەستەکەوه نزیکتر بێت ئەوه دەکرێتە بەرپرس! جا ئەگەر لێپرسراوێتییەکه تەنها بەرنوێژی کردن بوون، ئەوه دەبێ ئەوەیان پێش بخرێت که پێغەمبەر ﷺ وه پێشی خستووه وەك دەفەرموێت: (يؤم القوم أقرؤهم لكتاب الله، فاءن كانوا في القراءة سواءً، فأعلمهم بالسنة فاءن كانوا في السنة سواءً، فأقدمهم هجرةً، فاءن كانوا في الهجرة سواء، فأقدمهم سناً، ولا يؤمن الرجل الرجل في سلطانه، ولا يجلس في بيته على تكرمته إلا بأذنه) رواه مسلم. واته: (پێشنوێژی کۆمەڵێك با شارەزاترینیان له کتێبی خوا بیکات، ئەگەر له خوێندنەوەی قورئاندا وەك یەك بوون، ئەوه شارەزاترینیان له سوننەتی پێغەمبەرﷺ ئەگەر له سوننەتیشدا وەك یەك بن، ئەوه با ئەوەیان له کۆچدا پێشکەوتووه، ئەگەر له کۆچیشدا وەك یەك بوون، ئەوه با به

تەمەنترینیان، وە نابێت پیاوێك لەنێو دەسەڵاتی پیاوێکی دیدا پێشنوێژی بۆ خاوەن دەسەڵات بکات، وە لەنێو ماڵەکەیشیدا با لەسەر میوانداریەکەوە دانەنیشێت، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی نەبێت).

بەڵام لە حاڵێکدا دوو پیاو وەك یەك بوونو نەزانرا کامیان چاکترە؟!! ئەوە قورعەیان بۆ دەکرێت، وەك دەگێڕنەوە کە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) – لە قادسیەدا– کە بینی خەڵکەکە لەسەر بانگدان ئاڵۆزیان تێکەوتووە، ئەویش یەکسەر بۆ بانگدانەکە قورعەی لەنێواندا کردن، ئەمەش وەك (إقتداء) بوو بەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (لو يعلم الناس ما في النداء والصف الأول، ثم لم يجدوا إلا ان يستهموا عليه لأستهموا) رواه مسلم. (ئەگەر خەڵکی بیانزانیبا لە بانگدانو ڕیزی یەکەمی نوێژدا چ پاداشتێك هەیە! پاشان بە قورعەکردن نەبێت بۆیان وەدەست نەدەخرا، ئەوە قورعەیان لەسەر دەکرد)!!.

جا ئەگەر لێپرسراوی موسوڵمانان بە گوێرەی تەرازووی دادی خوایی –نەك ئارەزوو– خەڵکی خستە پێشەوە، یان ئەگەر حاڵەتەکە ڕوون نەبوو، دەرەنجام قورعەی کرد، ئەوە ئیتر ئەمانەتی بەرپرسایەتی گێڕاوەتەوە بۆ خاوەنەکەی.

# بەندی دووەم ( الأموال – دارایی )

ئەم بەندەش شەش فەصڵی لە خۆ گرتووە:

دووەمیان: لە گێڕانەوەی ئەمانەت (الأموال)ە. واتە: دابەشكردن‌و گێڕانەوەی بۆ خاوەنەكەی، وەك پەروەردگار سەبارەت بە گێڕانەوەی قەرزەكان دەفەرموێت: (فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ) (البقرة:٢٨٣) واتە: (ئەگەر هەندێكتان لە قەرزدا متمانەتان بەوی ترتان هەبوو، ئەوە پێویست ناكات بینوسن‌و شاهێدی بۆ بگرن، بەڵام ئەوەی كە بەخاوەن ئەمانەت دانراوە با بە ڕێكی ئەمانەتەكەی بگێڕێتەوەو لەوەشدا با پارێز لە خوا بكات) مختصر تفسير إبن كثير ج١/ص٢٥٦

## شایەنی باسە ئەم چەند جۆرە دەچنە نێو ئەم بەشەوە:

## ١) قەرزە تایبەتی و گشتییەکان.

## وەك: گێڕانەوەی ڕاسپاردەکان –الودائع[1]

---

[1] (ودائع)کۆی (ودیعة)یە واتە: ئەو شتەی کە پیاوێك لەلای پیاوێکیتر دایدەنێت، تا بۆی بپارێزێت، (شەریکایەتی: بریتیە لەوەی کە دوو پیاو هەریەکە ئەندازەیەك پارە بهێنن و تیکەڵاوی بکەن، پاشان ئیشی پێبکەن و قازانج و زەرەر لەسەر هەردوکیانە، (موکل) ئەو کەسەیە کە یەکێك دەکات بە وەکیلی خۆی لە ئیشێکدا، بۆ نمونە: کڕینی شتێك یان فرۆشتنی یان هەر شتێکی تر، جا دەبێت ئەوەی کە گیراوە بە وەکیل، هەر کاتێك خاوەنەکەی داوای ئەمانەتەکەی لێکردەوە خێرا بیگێڕێتەوە (المضارب) واتە: ئەو کەسەی ئەندازەیەك پارەی دیاریکراو دەدات بە یەکێکی تر بۆ ئەوەی کە ئیشی پێ بکات و قازانجەکەیان بە شەریکی بێت، جا هەر کاتێك کابرای پارەدەر ویستی پارەکەی لێبسەنێتەوە ئەوە دەبێ بۆی بگێڕێتەوە.

تێبینی: خوێنەری بەڕێزئەم پێناسانەی کە کران بۆ ئەم چەند زاراوەیە ئەوە زۆر بە کورتی و (مجمل) بوو، بۆ زیاتر درێژە پێدان سەیری پەڕاوەکانی (فقه) بکە. وەرگێڕ.

١) (قەرزە تایبەتی و گشتییەکان) وەك: گێڕانەوەی ڕاسپاردەکان (الودائع) یان پارەی -شریك- یان -الموكل- وەکیل گر، یان -المضارب- پارەدەر بۆ قازانج بە شەراکەت، یان پارەی هەتیو. (گێڕانەوەو وەفابوون بەم قەرزانە): پارەی شتی کڕدراو، واتە: ئەو کەسەی شتێکی بە قەرزکڕیوە پارەکەی بۆ بگێڕێتەوە-، گێڕانەوەی بڕی قەرز، مارەیی ئافرەتان، کرێی سودلێبنراو، وەك: کرێ سەیارە، کرێ خانوو، هەر هۆکارێکی تری شەرعی، ئەمانەو چەندین جۆری تر، وەك پەروەردگار لە وەصفی بڕواداراندا دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ هُمْ لأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ) (المعارج:٣٢) واتە: (ئەو بڕوادارانەی کە پارێزگاری دەکەن بەهەر ئەمانەتێك کە پێیان بدرێ و هەر پەیمان و بەڵێنێك بیدەن) وە دەفەرموێت: (إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلاَ تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا) (النساء:١٠٥) وە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دەفەرموێت: (أد الأمانة الى من أئتمنك، ولا تخن من خانك) رواه أبوداود والترمذي وقال: حديث حسن غريب. واتە: (ئەمانەت بۆ ئەوەی کە پێت دەدات بیگێڕەوەو ناپاکی لەگەڵ ئەوەدا مەکە کە ناپاکیت لەتەك دەکات)!! وە هەم دەفەرموێت: (المؤمن من أمنه المسلمون على دمائهم وأموالهم، والمسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده، والمهاجر من هجر ما نهي الله عنه، والمجاهد من جاهد نفسه في ذات الله) رواه البخاري ومسلم. (بڕوادار ئەوەیە کە موسوڵمانان بەسەر خوێن و داراییانەوە بە ئەمینی دانێن. وە موسوڵمان ئەوەیە کە بڕواداران لە زوبانی و دەستی پارێزراو بن، کۆچەریش ئەوەیە واز لەوە بێنێ کە خوا قەدەغەی کردووە، موجاهیدیش ئەوەیە کە لە پێناو خوادا جیهادی دەروونی خۆی بکات)!! لە شوێنێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (من أخذ أموال الناس يريد أداءها، أداها الله عنه، ومن أخذها يريد إتلافها، أتلفه الله) رواه البخاري. (هەرکەس ماڵ لە خەڵکی وەرگرێ و مەبەستی دانەوەی هەبێت، ئەوە خوا بۆی دەداتەوە، وە هەرکەس وەری

**بگریٚو بیەویٚت بیفەوتێنێ. ئەوە خوا دەیفەوتێنێ[1]) کەواتە: ئەگەر لە حەلێکدا گێڕانەوەی ئەمانەت فەرز بێت، ئەوە وریاکردنەوەیەکە بۆ ئەوەی کە: شتی داگیر -زەوت- کراو وە یان دزراو، یان ناپاکی، یان هەر جۆرە ستەمێکی دیکە، ئەوە حەوت جار حەوت جار گێڕانەوەیان واجبە.[2]**

**شایانی باسە ئەم بەشەیان -لە گێڕانەوەی ئەمانەت- بەگشتی هەموو موسوڵمانان -بە قیادەو قەواعیدەوە- دەگرێتەوە.[3]**

**وە هەریەکە لە قیادەو قەواعید لەسەریانە ماف واجبی یەکتری بگێڕنەوە، بۆ نمونە: لێپرسراوان و خاوەن دەسەڵاتان لەسەریان فەرزە ماف هەموو خاوەن مافێك بگێڕنەوە، وە هەروەها ئەوانەی کە هەردەم دەچن پارە کۆدەکەنەوە، وەك: زەکات و، سەرانەو، غەنیمەت و، ئەوانی دی. لەسەریان فەرزە -ئەوەی کە پێویستە- بیگێڕنەوە بۆ لێپرسراوی موسوڵمانان!! وە هەر موسوڵمانێك ئەگەر بزانێت شایستە نیە بۆی نیە داوای پارە لە لێپرسراو بکات، یان ئەو پارەیە ماف شەرعی خۆی نەبوو، چونکە ئەگەر وا بکات، ئەوە ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە، (وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ) (التوبه:٥٨) واتە: (ئەی محمد (ﷺ) هەندێ لە دووڕووەکان لە چۆنێتی دابەشکردنی زەکات عەیب و عارت لێدەنێن بەجۆرێك**

---

[1] ئەم فەرمودەیە بە مانای دوعاش هاتووە، واتە: بەو مانایەش هاتووە کە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە، هەر کەسێك بیەوێت پارەکە بگێڕێتەوە ئەوە خوا بۆی بگێڕێتەوە، وەهەرکەس بیەوێت بیفەوتێنێت خوا بیفەوتێنێ. وەرگێڕ.

[2] مەبەست ئەوەیە کە: من ئەگەر لە حەلێکدا بە ویستی خۆم پارەیەك لەلای یەکێکیتر دابنێم، ئەوە فەرز بێت بیگێڕێتەوە بۆم، دەی ئەگەر لە کاتێکدا بە زۆرە ملێ لێم زەوت بکات یان لێم بدزێت ئەوە حەوت جار حەوت جار فەرزترە. وەرگێڕ.

[3] لێرەدا مەبەست ئەوەیە: بەشی یەکەم لە گێڕانەوەی ئەمانەت کە لێپرسراوێتی بوو، تەنها پەیوەندی بە لێپرسراوەوە هەبوو، بەڵام بەشی دووەم لە گێڕانەوەی ئەمانەت کە داراییە پەیوەندی بە هەردوو لاوە هەیە. وەرگێڕ.

ئەگەر لەو زەکاتە بەشیان بدرێت ئەوە خۆشحاڵو ڕازین، بەڵام ئەگەر بەشیان نەدرێت ئەوە یەکسەر ڕقیان هەڵدەسێو قەڵس دەبن)[1]

وە ئەم حەقو مافانەی کە فەرزە بدرێن لە لێپرسراوی موسوڵمانان هیچ بڕواداڕێك بۆی نیە نەیداتێو لێی مەنع بکات، ئەگەرچی زاڵمیش بێت!! هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووەو دەفەرموێت: (أدوا اليهم الذي لهم، فإن الله سائلهم عمّا استرعاهم) رواه البخاري ومسلم. واتە: (ئەوەی کە بۆ ئەوانە لە مافەکانیان ئێوە پێیان بدەن، جا خواش سەبارەت بە موسوڵمانان لێپرسینەوە لەوان دەکات!!) ئەمە لەو دەمەدا بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی خراپەی لێپرسراوانی کرد پاشان ئەمەی فەرموو. دەفەرموێت: (كانت بنوإسرائيل تسوسهم الأنبياء، كلّما هلك نبي خلفهُ نبيٌّ، وإنه لا نبي بعدي، وسيكون خلفاء ويكثرون، قالوا فما تأمرنا؟! فقال: أوفوا ببيعة الأول فالأول، ثم أعطوهم حقهم، فإنّ الله سائلهم عما استرعاهم) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (بەنوئیسرائیلییەکان هەردەم پێغەمبەرەکانیان –عليهم السلام– کاروباری ژیانیان بۆ دەبردن بەڕێوە، هەرکاتێك پێغەمبەرێك تیا بچوایەو وەفاتی بکردبا پێغەمبەرێکی دیکە جێگەی دەگرتەوە، بەڵام ئاگادارین لەپاش من هیچ پێغەمبەرێك نیە، وە ماوەیەکی دیکە چەند جێنشینێك دێنو گەلێك زۆریشن، وتیان: لەو دەمەدا فەرمانت بە چیە؟! ئەویش فەرمووی: یەك بەیەك پەیمانیان لەگەڵ بەرنە سەر.. پاشان مافەکانی خۆیانیان بدەنێ، خوای گەورەش سەبارەت بە موسوڵمانان پرسیار لەوان دەکات!!) وە (عبدالله ی کوڕی مسعود) –خوای لێ ڕازی بێت– دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إنكم سترون بعدي أثرةً وأموراً ننكرنها، قالوا: فما تأمرنا به يا

---

[1] تفسير القرآن العظيم. إبن كثير م٢ ص٣٤٨. وەرگێڕ.

رسول الله؟ قال: أدوا إليهم حقهم، واسألوا الله حقكقم) رواه البخاري ومسلم.
واته: ئەی موسوڵمانان ئێوە لە پاش من لەلایەن لێپرسراوەکانتانەوە هەندێ کاروبار دەبینن کە پێتان ناخۆشەو ماف خۆشتان پێ نادرێ! وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ فەرمانت بەچیە بۆ ئەو حاڵەتە؟! فەرمووی: ماف خۆیان بدەنێ و داوای ماف خۆیشتان لە خوا بکەن!!)

وە بۆ لێپرسراوانیش نیە بەگوێرەی ئارەزووی خۆیان -وەك خاوەن ماڵ- پارەی موسوڵمانان دابەش بکەن، چونکە ئەوان تەنها (وەکیل)ن نەك خاوەن موڵك؟! وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (إني والله لاأعطي أحداً، ولا أمنع أحداً، وإنما أنا قاسم أضع حيث أمرت) رواه البخاري. واتە: (سوێند بە خوا من بە ئارەزووی خۆم پارە بە کەس نادەمو بە ئارەزووی خۆشم لەکەس مەنعی ناکەم، وە من تەنها دابەشکەرم، لە کوێدا فەرمانم پێکراوە لەوێدا دایدەنێم!).

جا سەرنجدە ئەمە پێغەمبەری خوایەو نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانەو رایدەگەیەنێت کە بەخشین و برین بە ویستو ئارەزووی ئەو نیە، وەك بابای خاوەن ماڵ کە بۆی حەڵاڵە ئیش لە ماڵەکەیدا بکات...

یان وەك پادشاکان کە هەر کەسێکیان خۆش بوێت پێی دەدەن و، رقیان لەهەر کەسێکیش بێت شەلم کوێرم لێی دەبڕن! بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاشکرای دەکات کە تەنها بەندەی خوایەو بەفەرمانی ئەو پارە دابەش دەکاتو هەر شوێنێك خوا فەرمانی پێبکات لەوێدا صەرف دەکات!! وەك دەڵێن: جارێکیان پیاوێك بە (عومەری کوڕی خەتتاب)ی -خوای لێ ڕازی بێت- وت: ئەی ئەمیری بڕواداران بەڵکو لە (بيت المال) کەمێك موچەکەت زیاد بکەیت!! ئیمامی عومەریش -خوای لێ ڕازی بێت- پێی فەرموو: ئایا دەزانی من و ئەو خەڵکە وەك چی واین؟ نمونەمان وەك کۆمەڵە خەڵکێك وایە کە لەسەفەرێکدا بن و پارەیەك کۆبکەنەوەو لەنێو خۆیاندا بیدەن بەیەکێکیان

**که بۆیان سەرف بکات، ئایا بۆ ئەو پیاوە حەڵاڵە لە پارەی ئەوانیتر بۆ خۆی زیاد بکات؟!**

**وە جارێکیان پارەیەکی زۆریان لە (غەنیمەت) هێنایە بەردەستی (عومەری کوڕی خەتتاب) -خوای لێ ڕازی بێت- ئەویش هەر کە غەنیمەتەکەی بینی کە بەبێ ناپاکی تێداکردنی هاتۆتەوە بەردەستی فەرمووی: بەڕاستی ئەم دەستە بەپاکی ئەمانەتەکەی گێڕاوەتەوە بۆ خاوەنەکەی!! یەکێك لە ئامادەبووان وتی: تۆ ئەمانەتەکەت گێڕاوەتەوە بۆ خوا، بۆیە ئەوانیش ئەمانەتەکەیان گێڕاوەتەوە بۆ تۆ!! ئەگەر جەنابت شەپ‌و گوپت کردبایە، ئەوانیش شەپ‌و گوپیان دەکرد: واتە: ئەگەر تۆ لەگەڵ خوادا ناپاك بویتایە، حەتمەن ئەوانیش لەتەك تۆدا ناپاك دەردەچوون، وە پێویستە بزانرێت کە: لێپرسراوی موسوڵمانان وەك بازاڕ وایە، بەجۆرێ چی تێدا ببەخشرێ‌و بفرۆشرێ هەرهەمان شتی بۆ دەگەڕێتەوەو (عومەری کوڕی عبدالعزیز)یش هەروا دەفەرموێت: ئەگەر ڕاستگۆیی‌و چاکەو دادپەروەریی‌و دەستپاکی تێدا ڕەنگ بداتەوە، ئەوە هەرهەمان ماددەی بۆ دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر درۆو خراپەو جەورو ناپاکی تێدا بەدی بکرێت، ئەوە هەر هەمووی بۆ دەگەڕێتەوە، کورتەی قسان ئەوەیە کە: لێپرسراو دەبێ پارە لە خەزێنەکەی هەڵگرێ‌و لە شوێنی شایستەی خۆیدا دایبنێت! بەجۆرێ ئەگەر موسوڵمانێك شایستەی بوو لێی مەنع نەکات، بۆیە دەبینی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) -خوای لێ ڕازی بێت- ئەگەر پێی بگەیشتایە کە هەندێك لە (والی)یەکانی ستەمێکیان کردووە، دەیفەرموو: خوایە گیان من فەرمانم پێنەکردوون کە ستەم لە دروستکراوەکانی تۆ بکەن... وە واز لە ئەداکردنی مافەکانی تۆ بێنن!!**

# فەصڵی دووەم

## جۆرەکانی الأموال السلطانية[1]

ئەو داراییەی کە دێتەوە بەردەستی سوڵتانی موسوڵمانان –الأموال السلطانية– لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کراون بە سێ بەشی سەرەکییەوە: (الغنيمة) و (الصدقة) و (الفيء).

---

[1] واتە: ئەو داراییەی کە دێتەوە بەردەستی لێپرسراوی موسوڵمانان و ئەو بەو شێوە کە خوا فەرمانی کردووە دابەشی دەکات. وەرگێڕ.

## (الغنيمة-تالانى)

غەنیمەت: بریتیە لەو ماڵەی کە بەهۆی جەنگەوە لە بێبڕوایان دەسێنرێ. خوای گەورە لە سورەتی (الأنفال)دا باسی کردووەو بە (أنفال–زیادە–) ناوی بردووە، چونکە زیادەیەکە لە ماڵی موسوڵمانان کە پەروەردگاری پێیان دەبەخشێت!

## بەڵگەکانی –حەڵاڵ- بوونی غەنیمەت

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ قُلْ الأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ) (الأنفال: ١) واتە: (ئەی محمد (ﷺ) لە مەڕ غەنیمەتدا پرسیارت لێدەکەن، تۆش بڵێ: غەنیمەت بۆ خواو پێغەمبەر(ﷺ)ە).

وە دەفەرموێت: (فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلاَلاً طَيِّبًا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ)(الأنفال:٦٩) واتە: (لەو کەلو پەلەی کە بە غەنیمەت دەیگرن بخۆن، لە کاتێکدا بۆتان حەڵاڵەو پاکە، وە پارێز لە خوا بکەن، بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە). وە لە صەحیحی (بوخاری)و (موسلیم)دا هاتووە لە (جابری کوڕی عبدالله)وە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (أعطيت خمساً لم يعطهن نبي قبلي: نصرت بالرعب مسيرة شهر، وجعلت لي الأرض مسجداً وطهوراً، فأيما رجل من أمتي أدركته الصلاة فليصل، وأحلت لي الغنائم ولم تحل لأحد قبلي، وأعطيت الشفاعة، وكان النبي يبعث الى قومه خاصة، وبعثت الى الناس عامة) رواه البخاري ومسلم. واتە: (من پێنج شتم پێبەخشراوە بەهیچ پێغەمبەرێکی دیکە نەبەخشراون: من خوای گەورە سەریخستووم بەسەر دوژمندا بەجۆرێ دوژمن یەك مانگە ڕێ لێم دەترسێ[1]، وە هەموو زەویم بۆ

---

[1] بێگومان ئەو بەخشینە تایبەت نیە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەڵکو بۆ هەموو ئوممەتەکەیەتی ئەگەر لەگەڵ دینی خوادا ڕاست بکەن، ئەوەی خوای گەورە لە دووری مانگە ڕێیەك ترس دەخاتە

کراوە بە مزگەوت، وە بۆشم پاکۆکەرەوەیە، هەر پیاوێك لە ئوممەتەکەم لەهەر شوێنێکدا بوو کاتی نوێژ هات با نوێژ بکات، وە غەنیمەت بۆ من حەڵاڵ کراوە لەکاتێکدا بۆ هیچ کەسێك پێش من حەڵاڵ نەبووە، وە شەفاعەتم پێ بەخشراوە[١].

وە هەموو پێغەمبەرێك بۆ لای گەلەکەی خۆی نێردراوە، بەلام من بەگشتی بۆ لای هەموو خەڵکی نێردراوم!) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: (بعثت بالسيف بين يدي الساعة، حتى يعبدالله وحده لاشريك له، وجعل رزقي تحت ظل رمحي، وجعل الذل والصغار على من خالف أمري، ومن تشبه بقومٍ فهو منهم) رواه احمد والبخاري معلقاً. واتە: (من نێردراوم بە شمشێرەوە لەبەر دەستی قیامەتدا، هەتاوەکو تەنها خوا بپەرسترێ‌و هیچ هاوەڵی بۆ بڕیار نەدرێ، وە ڕۆزیم لە ژێر سێبەری شمشێرەکەمدایە، وە زەلیلی‌و سوکی بۆ ئەوەیە کە پێچەوانەی فەرمانی من ڕەفتار دەکات، وە هەرکەس خۆی بەگەلێکیتر بچوێنێت ئەوە لەوانە[٢]

---

دڵی بێبڕوایانەوە، بەڵام ئەگەر وانەبوون ئەوە بەپێچەوانەوە، ئێمە لە دووری مانگەڕێیەکەوە لە دوژمن دەترسین. وەرگێڕ.

[١] مەبەست بەم شەفاعەتە کە تەنها بەم دراوە، شەفاعەتی گەورەیە (الشفاعه العظمی) ئەمەش لەکاتێکدا دەبێت کە خەڵکی لە دەشتی مەحشەرداندو هەموو چاوەڕوان دەکەن بۆ حیساب بۆیە دەچنە لای چەند پێغەمبەرێك –علیهم السلام– بەڵام کەسیان ئەو شەفاعەتەیان پێناکرێت، بەڵکو تەنها تایبەتە بە پێغەمبەری خۆمانەوە (ﷺ). ئەم باسەش لە (بوخاری‌و موسلم)دا هاتووە. وەرگێڕ.

[٢] ئەمە چەند بەڵگەیەك بوو لە قورئان‌و فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەلالەت دەکەن لەسەر حەڵاڵ بوونی غەنیمەت، بەڵگەی تریش هەن، بەڵام ئەوەندە بەسە. وەرگێڕ.

# دابەشكردنی غەنیمەت

ئەو كەلوپەلەی كە بە غەنیمەت گیراوە فەرز كە بكرێت بە پێنج بەشەوە، جا بەشێكی بدرێتە ئەوانەی كە خوای گەورە لە ئایەتەكەدا ئاماژەی بۆ كردوون و ئەوە چوار بەشەكەی دی بۆ جەنگاوەرانە[1] ئیمامی (عومەر) –خوا لێی ڕازی بێ– دەفەرموێت: (غەنیمەت بۆ ئەو كەسەیە كە ئامادەی شەڕەكە بێت، ئیتر بكەونە شەڕەوە یان نەكەونە شەڕەوە وەك یەك وایە[2]).

---

[1] بۆ نمونە: ئەگەر پێنج صەد دینار بوو، ئەوە دەبێ صەد دیناری بدرێ بەو شەش كۆمەڵەی كە خوای دادگەر لە ئایەتەكەدا باسی كردون، ئەو چوار صەد دینارەكەی تری دەدرێت بە موجاهیدین. شەش كۆمەڵەكەش ئەمانەن– واتە ئەوانەی كە بەشێكیان پێدەدرێ لەو پێنج بەشە: یەكەم/خوای گەورە. دووەم/ پێغەمبەری خوا (ﷺ). سێیەم/ خزمە نزیكەكانی پێغەمبەر (ﷺ). چوارەم/ هەتیوەكان. پێنجەم/ هەژاروكەم دەستەكان. شەشەم/ ڕێبواران. وەك خوای گەورە ئاماژەی بۆ كردوون و دەفەرموێت: (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ) (الأنفال:٤١) واتە: (بزانن هەرشتێك بە غەنیمەت دەیگرن، ئەوە پێنج یەكی بۆ خواو پێغەمبەرو خزمەكانی پێغەمبەرو هەتیوان و هەژارو نەداران و ڕێبوارانە).

تێبینی: ئەو بەشەیان كە بۆ خواو پێغەمبەرە (ﷺ) تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی لە ژیاندا بووە ئەوە بۆخۆی بووە، بەڵام لە دوای خۆیان زانایان دەفەرمون: بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان بەكاردەهێنرێ. وەك: كڕینی پێداویستییەكانی شەڕ، پڕكردنەوەی سەنگەرەكان بە پیاوان و هەر بەرژوەندییەكی تر. كیفایة الأخیار م٢ ص١٣١. فقه السنة م٣ ص٧٨. وەرگێڕ.

[2] واتە مەرج نیە غەنیمەت تەنها بەوانە بدرێت كە كوشتار دەكەن، بەڵكو بە هەموو جەیشەكە دەدرێت. بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە (ﷺ): (عبادەی كوڕی صامت) دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) دەرچووم و ئامادەی شەڕی بەدر بووم، هەردولا گەیشتن بەیەكترو خوای گەورە دوژمنی شكاند، كۆمەڵێك لە موسڵمانان كەوتنە دوایان، دەیانفڕاندن و دەیانكوشتن. كۆمەڵێكیشیان كەوتن بەسەر غەنیمەتەكانداو كۆیان دەكردەوەو دەیان پاراست، وە دەستەیەكیشیان پەرژینیان بە چوار دەوری پێغەمبەردا (ﷺ) دروستكرد هەتاكو دوژمن لەناكاودا لێی نەدەن، تاكو شەو داهات و هەمویان گەڕانەوە بۆ لای یەكتر. جا ئەوانەی كە غەنیمەتەكەیان كۆكردبویەوە وتیان: ئێمە ئەم غەنیمەتەمان پاراستووەو كۆمان كردۆتەوە. بۆیە

وەدەبێت لێپرسراوی مۆسڵمانان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لەنێوانیاندا دابەشی بکاتو بەشی هیچ کەس زیاتر نەکات!

نە لەبەر گەورەیەتی... یان لەبەر نەسەبی.... یان هەر شتێکی دیکە، بەڵکو دەبێ وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ)و جێنشینە بەڕێزەکانی غەنیمەتیان دابەشکرد ئەویش هەروا بکاتو بە موو لەو جۆرە دابەشکردنە لانەدا!!

چونکە لە صەحیحی ئیمام (بوخاری)دا هاتووە دەڵێ: (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) وایدەزانی فەزڵێکی زیاتری هەیە بەسەر ئەوەی کە لەشەڕدا لەو لاوازترە، بۆیە پێغەمبەری دادپەروەرو حەق ویست پێی فەرموو: (هل تنصرون وترزقون إلاّ بضعفائكم)!!! رواه البخاري. واتە: (ئایا ئێوە بەهۆی خەڵکە فەقیرو لاوازەکانتانەوە نەبێت سەردەخرێنو ڕۆزیتان دەدرێت؟!) وە هەم (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) دەفەرموێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیاوی وا هەیە پارێزەری کۆمەڵێکە -لە ئازایەتیدا-، ئایا بەشی ئەوو غەیری ئەو وەك یەکە؟! فەرمووی: دایکت شینت بۆ بکات -یان لەبار دایکت بچیت- ئەی سەعد ئایا ئێوە مەگەر بەهۆی خەڵکە لاوازو فەقیرەکەتانەوە نەبێت سەردەخرێنو ڕۆزیتان دەدرێت؟!! رواه أحمد.

---

بەشی کەسی پێوە نیە، ئەوانەشیان کە بەدوای دوژمندا دەرچووبوون وتیان: ئێوە لە ئێمە شایستەترنین، چونکە ئێمە پەرژینمان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دروستکردو ترساین دوژمن لەناکاودا لێیدەن، بۆیە بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) سەرقاڵ بووین. ئیتر لەو کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی: (يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ قُلْ الأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ) بۆیە پێغەمبەری خواش(ﷺ) بەشێوەیەکی خێرا غەنیمەتەکەی لەنێوان بروادارانیدا دابەشکرد.

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە دەڵێ: بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوماندا دابەشیکرد. رواه أحمد واخرجه الطبراني. ئەم فەرمودەیە شەوکانی کردویەتی بەبەڵگە لەسەر ئەوەی دەبێت سەهم بەهەموان بدرێت- شەڕکەرانو ئەوانەشی کە توشی شەڕ نایەن- بەمەرجێك بەشدارو ئامادەبن. والله اعلم. نیل الأوطار م٧ ص٣٠٨-٣٠٩. وەرگێڕ.

بەڵام ئیمام بۆی جائیزە پیاوێك زیاد لە سەهمەکەی خۆی شتێکی زیاتر پێبدات، ئەویش ئەگەر هاتوو ئەو پیاوە زیانێکی زۆرتری بەدوژمن گەیاندبوو، وەك: مەفرەزەیەك خاوەن چالاکی باش، یان پیاوێك هەڵبکوتێتە سەر قەڵایەكو بیگرێت، یان بڕوات مەردانە پێش لە دوژمن بگرێتو گەورەکەیان بکوژێت، سەرئەنجام ئەوەیش ببێتە هۆی شکانی دوژمن... یان هەر زەرەرێکی دیکە بگەیەنێت بە دوژمن! چونکە پێغەمبەرو (ﷺ) جێنشینە ئازیزەکانیشی بۆ کارێکی کەلە موجاهیدێکەوە وەشابێتەوە بەشی زیادەیان بۆ داناوە، ئەم زیادەیەش پێی دەوترێت (النَّفل) واتە: زیادە یان بەخشینی ئیمام!.

بەڵام ئەوەندەیە زانایان ڕاجیاییان هەیە کە: ئایا ئەو (نفل-زیادە-)یە ئیمام لە چ بەشێکی غەنیمەتەکە دەری دەکات؟

ئەمەش سێ بۆچوونی لەسەرە:

یەکەم: ئەو زیادەیە لە (خمس)ەکەیە- واتە: پێنج یەکەکە، ئەوەی کە بۆ شەش کۆمەڵەکە دانرابوو، وەك پێشتر باسکرا -ئەمەش بۆچونی ئیمام (مالك)ە.

دووەم: ئەو زیادەیە لە (خومسی خومسەکە)یە- واتە: پێنج یەکی پێنج یەکەکە- ئەمەش لەبەرئەوەی غەنیمەت پێدراوەکان هەندێکیان زیاد لەوی تریان نەبەن. شایانی باسە ئەمەش بۆچوونی ئیمام (شافعی)یە.

سێیەم: ئەو (نفل)ەیە لە خودی غەنیمەتەکە دەردەکرێت. واتە: أربعة أخماس -چوار بەشەکە- ئەمەشیان بۆچوونی ئیمام (أحمدو ئەبوحەنیفە)یە.

بەڵام ڕای پەسەندیان ئەوەیە کە لە خودی غەنیمەتەکە بێت- واتە: چوار بەشەکە کە بەشی موجاهیدینە- وەك پێغەمبەر (ﷺ) زێدەجار ئەمەی

کردووه[1]، ئیتر ئەگەرچی ئەمەشی تێدابێت کە فەزڵی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا زۆرتربێت، بەڵام ئەوەندەیە دەبێت ئەو زێدە بەخشینە لەبەر ڕەچاوگرتنی بەرژەوەندییەکی دینی بێت نەك هەواو هەوەس!!
وە (ئیمام) بۆی هەیە بڵێت: هەر کەس هەرچیەکی گرت ئەوە بۆ خۆی، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) لە غەزای (بەدر)دا بەو شێوەی فەرمووە. رواه مسلم.
ئەمەش ئەگەر هاتوو هەستی دەکرد کە لەوەدا بەرژەوەندییەکی پەسەندتر هەیە بەسەر زیانێکدا، یان دەتوانێت بڵێتِ: هەرکەس چۆنێتی گرتن یان ڕێگەی ئەو قەڵایەم پیشان بدات ئەوە فلان شتی بۆ هەیە، یان هەرکەس سەری فلان کەس بێنێت ئەوە ئەمەو ئەوەی پێدەبەخشرێت.

---

[1] وەك دەڵێ: جارێکیان (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع) پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێنج سەهمی پێدا، واتە: هەم سەهمی پیادەو هەم سەهمی سوارەش. لەبەرئەوەی لەو شەڕەدا دەوری زۆرتری بینی. رواه مسلم واحمد. فقه السنة م٣ ص٨١، نیل الأوطار م٧ ص٣١١. وەرگێڕ.

## ( -الغلول- شاردنەوەو دزیکردن لە ماڵی غەنیمەتدا )

ئەگەر لە حەلێکدا ئیمام خۆی غەنیمەتەکەی کۆدەکردەوەو دابەشی دەکرد، ئەوە بۆ هیچ کەس جائیز نیە تۆسقاڵێك لەو غەنیمەتە بشارێتەوەو بیدزێت، خوای گەورەش لەو بارەوە دەفەرموێت: (وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)(ال عمران:١٦١) واتە: (ئەو کەسەی لە ماڵی موسڵماناندا دزی بکات، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەخۆیو ئەو شتەوە کە دزیویەتی دێت بۆ حیساب)[١] چونکە لە ڕاستیدا شاردنەوەو دزینی غەنیمەت ناپاکییە، وە هەر وەك دزینی غەنیمەت جائیز نیە فڕاندنیشی هەروەها، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرگری لێکردووە.

بەڵام ئەگەر ئیمام خۆی وازی لە کۆکردنەوەو دابەشکردنی غەنیمەت هێناو مۆڵەتیشیدا بە موسڵمانان بە هەڵگرتنی –واتە: هەریەکە بۆ خۆی–، بۆیە هەرکەس ئەگەر بەبێ دەستدرێژیو زێدەڕەوی شتێکی هەڵگرت، ئەوە لەپاش ئەوەی کە غەنیمەتەکە کرا بە پێنج بەشەوە بۆی حەڵاڵ دەبێت، بەڵام ئەگەر ئیمام مۆڵەتی نەدا بەوەو ڕازی نەبوو، ئەوە هەر بۆی جائیزە بە ئەندازەی

---

[١] وەك پێغەمبەر (ﷺ) لە چەندین فەرمودەدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە: پیاوی وا هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا کە دەیهێنن بۆ حیساب، حوشترێکی بە کۆڵەوەیە یان ئەسپێك یان مەڕو بزنو کۆمەڵە پێستەی وا بە کۆڵەوە –ئیتر هەر شتێکی لە غەنیمەت یان هەر ماڵێکی تری موسڵمانان دزی بێت ئەوە ئەو شتە وا بە کۆڵیەوە دێت بۆ حیساب– هاوار دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) بێت بە هاواریەوە بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەڵێت: (لا املك لك من الله شيئاً قد بلغتك) واتە: لەلای خوا هیچ شتێکم پێ ناکرێت بۆت، چونکە پێم ڕاگەیاندیت) ئەم فەرمودانەش لە چەند ڕێگەیەکەوە هاتونو ڕیوایەت کراون، وەك: ئیمام احمد، ابوداود و زۆر لە فەرمودەکانیش صەحیحن. تفسير إبن كثير م١ ص٣٩٨-٣٩٩. وەرگێڕ.

**بەشی شەرعی خۆی هەڵبگرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوپەڕی ڕەچاوکردنی دادپەروەریدا[1] .**

**جا شایانی باسیشە دابەشکردنی دادپەروەرانە بەم شێوەیە دەبێت –واتە: چواربەشەکە–: بۆ پیادە یەك (سەهم) پشكو بۆ سوارەش سێ (سەهم) جا ئەوە سەهمێکیان بۆ خۆیەتیو دوانەکەی دیکەش بۆ وڵاخەکەیەتی، پێغەمبەری خوا (ﷺ)یش لە شەڕی خەیبەردا بەم شێوە غەنیمەتەکەی دابەشکرد.**

---

[1] خوێنەری خۆشەویست چەندین فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە کە هەریەکەیان بەشێوەیەکی جیا بەڵگەیە لەسەر قەدەغە (حەڕام)بونی (غلول– دزیکردن لە غەنیمەت) بۆیە زانایان بە گشتی دەفەرموون (غلول) لە گوناهە گەورەکانە (الکبائر) لەو فەرمودانەش: (عوبادەی کوڕی صامت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تغلوا فإن الغلول نار وعار على أصحابه في الدنيا والآخرة) رواه احمد. واتە: هیچ شتێك لە غەنیمەت مەشارنەوە، وە بەدزی مەیبەن، چونکە دزینی غەنیمەت سزای ئاگرو شەرمەزارییە بۆ خاوەنەکەی لە دونیاو دواڕۆژدا. وە ئیمام بوخاری لە (عبداللەی کوڕی عومەرە) وە دەگێڕێتەوە کە: پیاوێك هەبوو بەسەر کەلوپەلەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێیان دەوت (کِر کِرە) لەشەڕێکدا مرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (کرکرە) لەنێو ئاگردایە، ئەوانیش ڕۆشتن بە مردویی سەیریان کردو بینیان عابایەکی شاردۆتەوەو دزیویەتی– واتە: بەهۆی ئەوەوە چووە جەهەنەم، هەرچەندە هاوڕێی رسول الله بوو(ﷺ)، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەسەر کابرایەکەوە نەکرد کە لەشەڕی (خەیبەر)دا کوژرا بەهۆی ئەوەوە کە موورویەکی یەهودی دزی بوو نەگەیشتە ئەندازەی دوو درهەمیش. رواه ابوداود. وەرگێڕ.

تێبینی: بەڵام ئەگەر لەنێو غەنیمەتەکەدا خواردەمەنی هەبوو ئەوە (موجاهیدان) بۆیان هەیە پێش دابەشکردن لێی بخۆن ئەوە ناکەوێتە نێو حوکمی (غلول)ـەوە. وەك: سەربڕینی ئاژەڵو خواردنی گۆشتەکەی. بەڵگەشمان لەسەر ئەمە ئەم فەرمودەیە: عن عبدالله بن ابي اوفي قال: اصبنا طعاما يوم خيبر فكان الرجل يجيء فيأخذ منه قدر ما يكفيه. اخرجه ابوداود. واتە: عبدالله فەرمووی لەشەڕی خەیبەردا خواردنمان بە غەنیمەت گرت، پیاوی واهەبوو بە ئەندازەی خۆی لە خواردەمەنییەکەی دەبرد. وە ئیمام بوخاری لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: ئێمە لە شەڕکاندا هەنگوینمان دەگرت بە غەنیمەتو لێمان دەخوارد. ئەمە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانیویەتیو بەرگریشی لێ نەکردون، بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) لە ناهەق بێ دەنگ نابێت. وەرگێڕ.

بەڵام لە شەرعزانان هەیە کە دەڵێ: سوارە تەنها دوو سەهمی پێدەدرێت[1].
ئیدی بۆچونی یەکەمیان سوننەتی صەحیحی پێغەمبەر (ﷺ)ی لەسەرە. وە لەبەر ئەوەش: وڵاخ هەمیشە پێویستی بە خواردەمەنیو کرێ دەکات هەم بۆ خۆیو هەم بۆ ئەوەشی کە بەڕێوەی دەبات- واتە: پێویستی بە ئالیكو ناڵکردنو کۆپان کڕینو شتی تریش هەیە، هەروەك سەیارەی ئێستا پێویستی بە گازو ئامێرەکانی تر دەکات- وە بێگومان سودو قازانجی سوارەکانیش لە پیادەکان زۆرترە.
بەڵام لێرەدا تێبینییەك هەیە پێویستە لێی بە ئاگا بن: ئەگەر لە حەلێکدا ئەو غەنیمەتەی کە گیراوە دەرکەوت کە پێشتر ماڵی موسڵمانێك بووەو کافران داگیریان کردووە، ئەوە بەیەك دەنگی تێکڕای زانایان دەبێ بدرێتەوە بە خاوەنە موسڵمانەکەی[2].
وە لقوفەرعەکانی غەنیمەتو حوکمی هەریەکەیان چەندین قسەو بەڵگەی لەسەرە، زانایان لە هەندێکیاندا یەك دەنگنو لە هەندێکیشیاندا جیاوازن،

---

[1] ئەمە بۆچونی ئیمام ئەبو حەنیفەیە-خوای لێ ڕازی بێت- بەڵام سەید سابق لە (فقه السنة)دا دەفەرموێت: ئەمە بۆچونی ئیمام ئەبو حەنیفە پێچەوانەی سوننەتی ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ). فقة السنة م٣ ص٨٠. وەرگێڕ.

[2] بەڵگەش لەسەر ئەمە: عن إبن عمر: انه ذهب فرس له، فأخذه العدو، فظهر عليهم المسلمون، فرد عليه في زمن رسول الله (ﷺ) وابق عبد له فلحق الروم، وظهر عليهم الموسلمون فرده عليه خالد بن الوليد بعد النبي (ﷺ) رواه البخاري وابوداود وإبن ماجة. واتە: ئیبن عومەر -خوای لێ ڕازی بێت- وڵاخێکی هەبوو ڕۆشت، ڕایکرد، دوژمن دەستی بەسەردا گرت، پاشان موسڵمانان سەرکەوتن بەسەر ئەو دوژمنانەدا، لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) وڵاخەکەی گێڕدرایەوە بۆی، وە بەندەیەکیشی هەبوو-واتە ئیبن عومەر- بەندەکەی ڕایکرد، تەرەبوو-و گەیشت بە مەملەکەتی ڕۆم پاشان موسڵمانان سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکاندا، خالیدی کوڕی وەلید بەندەکەی بۆ گێڕایەوە لەدوای سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم فەرمودەیەی تریش هەیە لەسەری بەڵام پێویستی نەکرد هەموی بێنین. نيل الأوطار م٧ ص٣٣٢-٣٣٤. فقه السنة م٣ ص٨٥. وەرگێڕ.

بەڵام ئێرە شوێنی باسکردنی هەمووی نیەو لێرەدا مەبەست تەنها هێنانی چەند بابەتێکی کۆکەرەوە بوو.

(خوێنەری بەڕێزو سەنگین: إبن تيمية -خوا لێی خۆش بێت- لێرەداو لەباسی غەنیمەتدا هەموو وردە بابەتەکانی باس نەکردوون- وەك خۆیشی ئاماژەی بۆ کرد- جا لەبەر زیاترو قوڵتر حاڵیبوون پێم خۆش بوو بەشێوەیەکی کورت چەند خاڵێك بخەمە ڕوو، کەم تا زۆریش لە پەراوێزەکەدا هەندێ وردەشتی ترم باسکردوون:

خاڵی یەکەم: ئەو کەسانەی کە لە غەنیمەتەکەدا بەشێکی دیاریکراویان هەیە -کە پێی دەگوترێت "سهم"- دەبێ چەند مەرجێك هەیە تێیاندا بێت، ئەو مەرجانەش ئەمانەن:

١. (الإسلام): واتە: دەبێ موسڵمان بێت، بەڵام ئەگەر بێبڕوایەك بوو یان موشریکێك موسڵمانان هێنابویان لەگەڵ خۆیاندا ئەوە سەهمی تایبەتی نیە- وەك لە دواییدا ئاماژەی بۆ دەکەین-.

٢. (البلوغ): باڵغ بێتو تەمەنی پازدەساڵان بێت.

٣. (العقل): عاقڵو خاوەن هۆش بێت.

٤. (الحرية): ئازاد بێت.

٥. (الذكورة): نێر بێت.

جا بۆیە منداڵو کۆیلەو ئافرەت -ئەگەر بەشدارییان کرد- ئەوە (رضخ)یان لەبۆ هەیە، واتە: پێشەوای موسڵمانان ئەندازەیەکی کەمیان بەش دەدات، چونکە ئەمانە جیهادیان لەسەر فەرز نیە، سەهمیش بۆ ئەوانە دانراوە کە جیهادیان لەسەر فەرزە، وەك ئەوانەی کە ئەو پێنج مەرجەی سەرەوەیان تێدابێت.

بەڵگەشمان ئەم فەرمودانەیە:

(إبن عباس) -خوای لێ ڕازی بێت- دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) جەنگی بە ئافرەتان دەکرد، کە دەهاتن تیماری بریندارەکانیان دەکرد، وە لە غەنیمەت بەشیان دەدرا، بەڵام سەهمی بۆ دانەناون) رواه أحمد ومسلم.

وە (إبن عباس) لەوەڵامی پرسیارێکی (نجدة الحروري)دا کە پرسیاری ئافرەتو کۆیلەی لێکردبوو ئەگەر بێنە جەنگەوە سەهمی دیاریکراویان هەیە؟ لەوەڵامدا فەرمووی: (سەهمێکی دیاریکراویان نیە، بەڵام لە غەنیمەت بەشیان دەدرێت) رواه مسلم وأحمد. وەبێگومان (إبن عباس)یش -خوا لێی ڕازی بێ- پێچەوانەی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) قسە ناکات.

وە (ئەوزاعی) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشەڕی خەیبەردا بەشی بۆ منداڵان داناوە) الترمذي. ئەم فەرمودەیە هەرچەندە (مورسەلە) واتە: صەحابییەکە لە سەنەدەکەیدا نەماوە، بەڵام زانایان کردوویانە بەبەڵگە.

وە (سەعیدی کوڕی موسەییەب) کە تابعییە دەفەرموێت: (لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دا منداڵو کۆیلەکان بەشیان دەدرا) جا زانایان دەفەرمون: ئەم بەشەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دایناوە (رضخ) بووە[1].

تێبینی: سەبارەت بەوانەی کە بێبڕوایان یان موشریکن، ئەگەر هاتن بۆ شەڕو یارمەتی موسڵمانانیاندا، ئەوە ئیمامی (شافیعی) -خوا لێی خۆش بێت- دەربارەیان بۆچوونێکی جوانی هەیە، کە دەفەرموێت: ئەگەر پێشەوای موسڵمانان مۆڵەتی پێدابوون، ئەوە (رضخ)یان پێدەدرێت، بەڵام سەهمیان پێنادرێت، وە ئەگەر هەر لە خۆوەو بەبێ مۆڵەتی پێشەوا هاتبوون ئەوە هیچیان پێنادرێت. بەڵگەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای کۆمەکی

[1] نیل الأوطار م٧ ص٣١٨-٣٢١. فقه السنة م٣ ص٨١-٨٥. كفاية الأخيار م٢ ص١٣٠-١٣١. وەرگێڕ.

لەبەرەی (قینقاع) کردو -رضخ-ی پێداون، بەڵام سەهمی پێنەداون[1]. والله أعلم.

خاڵی دووەم: ئەو موجاهیدەی کە پێشەوای موسڵمانان دەینێرێت بۆ ئیشێك، یان لە شوێنێکیتردا دایدەنێت، وەك: بینێرێت بۆ جاسوسیو هەواڵ هێنان دەربارەی دوژمن، جا بەهۆیەوە ئامادەی جیهادەکە نەبێت، ئەوە وەك موجاهیدێکی جەنگاوەر سەهمی خۆی پێدەدرێت، بەڵگەشمان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە (ﷺ): (وعن إبن عمر قال: لمّا تغيب عثمان عن بدرٍ فإنه كان تحته بنت رسول الله (ﷺ) وكانت مريضةً، فقال لَهُ النبي (ﷺ): إنّ لك أجر رجل وسهمهُ) رواه أحمد والبخاري. واتە: (کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان نەهات بۆ شەڕی بەدر چونکە کچەکەی پێغەمبەر (ﷺ) خێزانی بوو لەو کاتەدا نەخۆش بوو، جا پێغەمبەر (ﷺ) بە عوسمانی وت: تۆ پاداشتو سەهمی پیاوێکی بەشداربووت هەیە).

تێبینی: ئەو موجاهیدە دەبێ بە فەرمانی پێشەوای موسڵمانان ئامادەنەبێت، نەك بە ئارەزووی خۆی، چونکە عوسمانی کوڕی عەففان بەفەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری مەدینەدا مایەوە[2] والله أعلم.

خاڵی سێیەم: هەر موجاهیدێك لە گەرمەی شەڕدا بەدەستی خۆی بێبڕوایەك بکوژێت، ئەوە کەلوپەلی ئەو کوژراوە -کە پێی دەڵێن (السَّلب)- دەدرێتە خۆی، وە ئەو کەلوپەلە ناڕواتە نێو سەهمە تایبەتییەکەی خۆیەوە، واتە:

---

[1] ئەم فەرمودەیە لە سەنەدەکەیدا قسەی لەسەرە، بەڵام زۆر لەزانایان ئەو بۆچونەی ئیمام شافعییان هەیە. وەك: ئەبوحەنیفەو ئیمامی شەوکانیش ئەم بۆچونەی پێ پەسەندە- واتە: ئەوەیان کە دەڵێ -رضخ- یان پێدەدرێت. نیل الأوطار م٧ ص٣٢٠، كفاية الأخيار م٢ ص١٣١، فقه السنة م٣ ص٨٢-٨٣. وەرگێڕ.

[2] نيل الأوطار م٧ ص٣٢٤-٣٢٥، فقه السنة م٣ ص٧٩-٨٠. وەرگێڕ.

سەهمەکەی خۆی وەك هەموو موجاهیدان پێدەدرێ‌و وەك زیادە فەزڵێکیش –سەلەبە–کەی پێدەبەخشرێت، بەڵگەشمان ئەم فەرمودانەیە:–

عن أنس أن النبي (ﷺ) قال يوم حنين: من قتل رجلاً فلهُ سلبهُ، فقتل أبوطلحة عشرين رجلاً وأخذ أسلابهم) رواه أحمد وابوداود ورجال إسناده رجال صحيح. وفي لفظ: (من تفرد بدم رجلٍ فقتله فلَهُ سَلَبَهُ، قال: فجاء أبوطلحة بسلب أحدٍ وعشرين رجُلاً) رواه أحمد. واته: (ئەنەسی کوڕی مالیك) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی حونەیندا فەرمووی: هەرکەس پیاوێك بکوژێت، ئەوە کەل‌وپەلەکەی بۆ خۆی، جا باوکی تەڵحە بیست پیاوی کوشت‌و کەل‌وپەلی هەرهەمووشیانی وەرگرت بۆ خۆی) لە گێڕانەوەیەکیتردا دەفەرموێت: (هەرکەس خۆی تەنها خوێنی پیاوێك بڕێژێ‌و بیکوژێت ئەوە کەل‌و پەلەکەی بۆ خۆی، ئەنەس دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە باوکی تەڵحە کەل‌وپەلی بیست‌و یەك پیاوی هێنا).

(وعن عوف وخالد أن النبي (ﷺ) لم يخمس السلب) رواه احمد وابوداود وأخرجه إبن حبان والطبراني. واته: (عەوفی کوڕی مالیك‌و خالیدی کوڕی وەلید دەگێڕنەوە کە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەل‌وپەلی کوژراوی نەکردووە بە پێنج بەشەکەوە. واتە: نەیخستۆتە نێو غەنیمەتەوە بۆ دابەشکردن، بەڵکو یەکسەر داوێتی بە بکوژەکە!!)

چەند تێبینییەك/

١. سەلەب: جل‌و بەرگ‌و تفەنگ‌و دەمانچەو سەیارەو –ئەگەر هی خۆی بێت– پارەو هەموو ئامرازەکانی تری شەڕ دەگرێتەوە، وەئەگەرچی زۆریش بێت هەر پێی دەدرێت، وەك لە فەرمودەکەدا دەردەکەوێت کە سەلەبی بیست کەس بە ئەبوتەڵحە دراوە.[1]

[1] فقه السنة م٣ ص٨١، كفاية الأخيار م٢ ص ١٣٠. وەرگێڕ.

٢. دەبێ شایەتی هەبێت کە خۆی کوشتویەتی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (من قتل قتیلا له علیه بینة فله سلبه) متفق علیه. واتە: (هەرکەس کوژراوێك بکوژێت و شایەتی لەسەری هەبێت، ئەوە کەل و پەلەکەی بۆ خۆی).

٣. دەبێ تەنها خۆی بیکوژێت، بۆیە ئەگەر دوو پیاو کوشتیان ئەوە بۆ هەردووکیانە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (من تفرد بدم رجُل فله سَلَبه) رواه احمد. سەیردەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (من تفرد بدم رجلٍ) واتە: (هەرکەس خۆی تەنها خوێنی پیاوێك برێژێت)[1].

٤. ئەمیری موسڵمانان فەرمان دەردەکات یان نا ئەو بکوژە (سەلەب)ەکەی شەرعەن هەر پێدەدرێت، چونکە ئەوە مافێکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاریکردووەو دایناوە، وە زێدە هاندەرێکیشە بۆ کافر کوشتن[2] والله أعلم.

خاڵی چوارەم: ئەو سەهمەی کە لە غەنیمەتدا بۆ بەرژەوەندییەکان دانراوە — وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا– یان هەر لە خودی چوار بەشەکەیتر کە بۆ (موجاهیدین)ە، پێشەوای موسڵمانان مافی ئەوەی هەیە بەشی ئەو کەسانەی لێبدات کە نوێ موسڵمانن و ئیمانێکی لاوازیان هەیە، یان گومان لە ئەصڵی بڕوا هێنانەکەیاندا هەیە، بۆ ئەوەی دڵیان ڕاگرێ و ئیسلامەکەیان لا شیرین و خۆشەویست بکات، بەڵگەشمان ئەم فەرمودانەیە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت: (کاتێك شاری مەککە فەتح کرا، پێغەمبەر (ﷺ) غەنیمەتەکانی بەنێو قوڕەیشتییەکاندا دابەشکرد، جا ئەنصارەکان وتیان: بەڕاستی ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە!! چونکە جارێ شمشێرەکانی ئێمە خوێنی ئەوانی لێدەتکێ، کەچی غەنیمەتەکانی ئێمە دەگێڕدرێتەوە بۆیان!! ئەم قسانە

---

[1] نیل الأوطار م٧ ص٣٠٢، کفایة الأخیار م٢ ص١٣٠. وەرگێڕ.

[2] کفایة الأخیار م٢ ص١٢٩. وەرگێڕ.

گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) کۆی کردنەوەو فەرمووی: ئەوە چییە دەربارەی ئێوە پێم گەیشتووە؟! وتیان: هەرهەمان هەواڵە کە پێت وتراوە، چونکە ئەوان درۆیان نەدەکرد، ئەویش فەرموی: ئایا ئێوە ڕازی نابن خەڵکی بە ماڵی دونیاوە بگەڕێنەوە بۆ نێو ماڵەکانی خۆیان کەچی ئێوە بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بگەڕێنەوە؟!

وتیان: بەڵێ ڕازین. ئەویش فەرمووی: ئەگەر هەموو خەڵکی دۆڵێك یان چەمێك بگرنەبەرو ئەنصارەکانیش دۆڵو چەمێکیتر، ئەوە من دۆڵو چەمی ئەنصارییەکان دەگرمەبەر) متفق علیه.

وە (عبداللّەی کوڕی مسعود) دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دابەشکردنی غەنیمەتەکەدا کۆمەڵێ خەڵکی پێشخست، بەجۆرێ صەد حوشتری دا بە (ئەقرەعی کوڕی حابس)، وە نمونەی ئەوەشیدا بە (عویەینە)، وە کۆمەڵێك لە پیاوە گەورەکانی عەرەبی لە دابەشکردنەکەدا پێشتر خست، لەو کاتەدا پیاوێك وتی: سوێند بەخوا ئەمە دابەشکردنێکە هیچ دادپەروەری تێدا نەکراوەو مەبەستیش پێی خوا نەبووە!! منیش وتم: سوێند بەخوا دەبێ ئەم هەواڵە بگەیەنمە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جا هاتم بۆ لای پێغەمبەرو (ﷺ) هەواڵەکەم پێوت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: جا ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی دادپەروەری نەکەن ئیتر کێ دادپەروەری دەکات؟!! پاشان فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە (موسا)بێت زیاتر لەمە ئەزیەتدراو ئارامیشی گرت) متفق علیه.

(شەوکانی) دەفەرموێت: ئەم فەرمودانە تێکڕا بەڵگەن لەسەرئەوەی کە بۆ ئەمیری موسڵمانان جائیزە هەرکەسێك لە شوێنکەوتوانی کە زیاتر لایداوە بەلای دونیادا لە دابەشکردنی غەنیمەتدا پێشیان بخات، لەوانەی کە بڕوایان

بەهێزەو هەردەم دواڕۆژیان وە پێش دونیای فانی خستووە، ئەمەش بۆ زێدە دڵڕاگرتنیانە[1] والله اعلم.

خاڵی پێنجەم: غەنیمەت دوو لەسەر سێی پاداشتی موجاهید کەم دەکاتەوە، ئەگەرچی نیازیشی هەر خوا بێت.. چونکە ئەو غەنیمەتە وەك پێشکەوتنی هەندێ لە پاداشتەکەیەتی لە دونیادا.

بەڵگەشمان بریتیە لەم فەرمودەیە:

(عن عبدالله بن عمرو بن العاص عن النبي (ﷺ) قال مامن غازية تعزو في سبيل الله فيصيبون الغنيمة إلاّ تعجلوا ثلثي اجرهم من الآخرة ويبقى لهم الثلث، وإن لم يصيبوا غنيمة تم لهم أجرهم) رواه مسلم.

واتە: (عەمری کوڕی عاص دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر کۆمەڵە موجاهیدێك لە پێناوی خوادا جەنگ بکەن و غەنیمەت بگرن، ئەوە دوو لەسەر سێی پاداشتەکەیان لە دونیادا بۆ پێش دەکەوێت و یەك لەسەر سێیان بۆ دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر غەنیمەتیان دەست نەکەوێت ئەوە پاداشتەکەیان بەتەواوی پێدەدرێتەوە).

واتە: لە حەلێکدا ئەگەر صەد چاکەیان بۆ بنوسرێت ئەوە شەست و شەش چاکەیان بەهۆی بردنی غەنیمەتەکەوە کەم دەبێتەوە و سی وچوار چاکەیان بۆ دەمێنێتەوە[2]. لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە مرۆڤی موسڵمان بە تایبەتی و موسڵمانان بەگشتی گوێ نەدەنە غەنیمەت و پشتگوێی بخەن، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە نابێ زۆر چاوی تێبڕدرێ و مرۆڤی موسڵمان هەموو هیواو ئاواتێکی لە جیهادەکەیدا نەبێتە وەدەستخستنی غەنیمەت[3] والله أعلم.

---

[1] نيل الأوطار م٧ ص٣٢٠-٣٣٢. وەرگێڕ.

[2] بۆ زیاترو قوڵ حاڵیبوون لەم بابەتە سەیری ئەم پەڕاوانە بکە: ١. صحيح مسلم بشرح النووي م١٣ ص٥٢-٥٣. ٢. العمدة في اعداد العدة للجهاد في سبيل الله ص١٦-١٨. وەرگێڕ.

[3] وەرگێڕ.

# ( فەصلی سێیەم )

# ( جۆرەکانی – الأموال السلطانية- )

# ( الصدقات- زەکات- [1] )

زەکاتیش بەو کەسانە دەدرێت کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هێناون، چونکە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ڕیوایەت کراوە کە جارێکیان پیاوێك سەبارەت بە زەکات پرسیاری لێکرد کە ئایا بۆ کێ یە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (إن الله لم يرض في الصدقة بقسم نبي ولا غيره، ولكن جَزأَها ثمانية أجزاء، فإن كنت من تلك الأجزاء أعطيتك) رواه ابو داود.

واتە: (خوا لە دابەشکردنی زەکاتدا بە دابەشکردنی هیچ پێغەمبەرێك و غیری ئەویش ڕازی نابێت، بەڵکو خۆی کردویەتی بە هەشت بەشەوە، ئەگەر تۆ یەکێك بوی لەوانە ئەوە پێت دەدەم[2].)

ئەو هەشت دەستەیەش ئەمانەن:- (فقراو ومساكين –هەژاران و گەدایان–): ئەمانەش هەردوکیان مانای پێویستی کۆیان دەکاتەوە، چونکە زەکات بۆ دەوڵەمەندو خاوەن توانایەکی کاسب حەڵاڵ نیە.

---

[1] شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە لێرەدا و لەباسی زەکاتدا تەنها باسی ئەوەی کردووە کە زەکات بەکێ دەدرێت ئیتر – تفاصيل–ی باس نەکردووە. وەرگێڕ

[2] ئەم فەرموودە ئاماژەیە بۆ ئەوانەی کە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا باسی کردوون، واتە: ئەوانەی کەزەکاتیان پێ دەشێ ئایەتەکەش ئەمەیە: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)التوبة: ٥٩–٦٠. واتە: ( زەکات دانراوە تەنها بدرێتە هەژاران و گەدایان و کرێکارانی زەکات و نوێ مسوڵمانان و–دڵڕاگیراوان– کۆیلەو قەرزداران و، جەنگاوەرانی ڕێگەی خواو، ڕێبواران

تێبینی:- فقیر- پلەیەکی خوارتر لە- مسکین- چونکە- مسکین- ئەگەر سەد دیناری پێویست بێت ئەوا تەنها حەفتا دیناری هەیە، بەڵام- فقیر- تەنها سێ دیناری دەست دەکەوێت، بۆیە لەئایەتەکەشدا- فقیر- پێش- مسکین- خراوە.

وه (العالمين عليها– كرێكارانی سەرزەكات–) :ئەوانەن كە زەكاتەكەی كۆدەكەنەوە... دەیپارێزن و... دەینوسن... یان هەركارێكی تری زەكاتەكە.
وه (المؤلفة قلوبهم– نویٚ مسوڵمان یان دڵ ڕاگیراوان–) : ئەوانەش إنشاءالله لەباسی (فيء)دا باسیان دەكەین.
وه (في الرقاب–كۆیلە ئازادكردن–):یارمەتیدانی كۆیلەی (المكاتب) دەگرێتەوە بەهەمان شێوەش ڕزگاركردنی ئەسیرەكان و كڕینەوەیان لەدوژمن ئازادكردنی بەندەكانیش دەگرێتەوە[1] ئەمەش بەهێزترین وتەی زانایانە تێیدا.
و (الغارمين– قەرزارن–) :ئەوانەن كە قەرزیان بەسەرەوەیەو ناتوانن قەرزەكەیان بدەنەوە، بۆیە ئەوەندەیان پیٚ دەرێت كە قەرزەكەیان بگێڕنەوە ئەگەرچی قەرزەكەشیان زۆربێت، بەڵام ئەگەر لەسەرپێچی خوادا قەرزەكەیان كردبوو، ئەوە هەتاوەكو تەوبەیەكی تەواو و ڕاست نەكەن قەرزەكەیان بۆ نادرێتەوە.
وه(في سبيل الله–موجاهیدان) : ئەوانەی كە ئەوەندە پارەیان نی یە بەشی جیهادەكەیان بكات، بۆیە لە (زەكات) ئەوەندەیان بەش دەدرێت كەجەنگ و جیهادەكەی پیٚ بكەن، وەك: كڕینی وڵاخ و سیلاح بۆیان و كریٚ پێدانیان. وه (الحج–سەردانی ماڵی خوا–) : ئەمەش دەكەوێتە ژێر بڕگەی (في سبيل الله)وە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی[2].
وه(إبن السبيل–ڕێبوار) بریتیە لەو كەسەی كەلە وڵاتێكەوە یان شارێكەوە دەكوازرێتەوە بۆ وڵاتێكی تر و لەبەر بیٚ پارەیی پەكی دەكەویٚ.

---

[1] لێرەدا دووجار باسی كۆیلەی كردووە كە بڕیٚ لەو زەكاتەیان بۆ دانراوە جا مەبەست بە كۆیلەی (المكاتب) ئەوەیە كە لەگەڵ خاوەنەكەیدا عقدێكی كردووە كە خۆی بكڕێتەوە بۆیە خاوەنەكەی مۆڵەتی پێدەدات كە بڕوات پارە بدات، بەڵام (رقاب) هەركۆیلەو هیچی تر. وەرگێڕ.
[2] ئەم فەرموودەیە ئیمام احمد ڕیوایەتی كردووە بەڵام متنەكەی نەهێناوە.وەرگێڕ.

# فەصلی چوارەم

## ( جۆرەكانی-الأموال السلطانية- )

## ( الفيء- دەستكەوت )

بەڵگەی حەلاڵبونی (فيء) ئەم ئایەتە پیرۆزەیە كە خوای بەخشەر دوابەدوای جەنگی (بەرەی نەضیر)دا ناردیە خوارەوە: (مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ) الحشر: ٦-٧

واتە: (ئەو ماڵو دارایيەی (بەرەی نضیر) كە خوا دەستی پێغەمبەری (ﷺ) خست-گێڕایەوە بۆی- ئێوە نە ئەسپ و نە حوشترتان بۆ تاو نەدابو- واتە: بەبێ جەنگ وەدەستتان كەوت- بەلاَم خوا بەسەر هەركەسێكدا خۆی بیەوێت پێغەمبەرانی خۆی زاڵدەكات، بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە. وەهەرماڵێك لەدانیشتوانی ئەم گوندانە خوا وەدەستی پێغەمبەری دەخات – بە فيء- بۆ خواو پێغەمبەرەو، خزمانی پێغەمبەرو هەتیوانو هەژارانو نەدارانو ڕێبوارانە، هەتاوەكو ئەو پارەیە تەنها لەنێو دەوڵەمەندەكانتاندا نەسوڕێتەوەو هەژارانو نەداران هیچ سودێكی لێ نەبینن، وەهەرچی كە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون – دەتان داتێ- وەری گرن و هەرچیشی ئەو پێشگیریتان دەكات لێ ی وازی لێ بێنن، وە پارێز لە خوابكەن بەڕاستی خوا تۆڵە و سزای توندە.)[1]

مانای ئەو ئایەتەی كە دەفەرمووێت: (فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ) ئەمەیە: بۆ وەدەست خستنی ئەو كەل و پەلە نە ئەسپ و نە حوشترتان تاو

---

[1] مختصر تفسير إبن كثير م٣ ص٤٧٢ – ٤٧٣. وەرگێڕ

نەداوە هەربۆیە(فقهاء) لە پێناسەی (فيء)دا فەرموویانە: (إن الفيء هو ماأخذ من الكفار بغير قتال، لأنَّ إيجاف الخيل والركاب هو معنى القتال)[1]. واتە: (فيء) دەست کەوت ئەو ماڵ و داراییە یە کە بەبێ هیچ شەڕێك لە کافران دەسەندرێت، چونکە مەبەست بەتاودانی ئەسپو حوشتر لەئایەتەکەدا جەنگە. وە بۆیەش ناویشی نراوە(فيء- گەڕاوە) : چونکە خوای گەورە لە بێبڕوایانەوە بۆ مسوڵمانانی گێڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە لە بنچینەدا خوای گەورە ماڵ و دارایی تەنها بۆ ئەوە دروستکردووە کەببێتە یارمەتی دەری خۆی، وە دروستکراوەکانیشی هەر بۆ پەرستنی خۆی دروستکردووە.بۆیە ئەوانەی کەبێ بێبڕوان بەخوا، ئەو نەفسەی کە خوایان پێ نەپەرستووەو ئەو ماڵ و داراییەی کەنەیان کردۆتە یارمەتی دەرێك بۆ بەندایەتی خوا، خوای گەورە هەردووکیانی بۆ بەندە بڕوادارەکانی حەڵاڵ کردووە!.

جا نمونەی ماڵی(فيء)یش وەك: ئەو (جزية- سەرانە)یەی کەبەسەر جولەکەو دیانەکانەوە دانراوە، یان ئەو ماڵەی کەلەسەری صوڵح لەگەڵ دوژمن دەکرێت، یان بەخشین کە بۆ ئەمیری مسوڵمانانی دەنێرن، یان ئەو دەیەکەی (العشر) کە لەبازرگانەکانی بێبڕوایان وەردەگیرێت -ئەگەر لەنێوان مسوڵماناندا بازرگانیان کرد-، یان ئەو نیودەیەکیەی (نصف العشر) کەلە پەیمان لەئەستۆکان -أهل الذمة- وەردەگیرێت هەرکات بازرگانبان لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدا کرد، یان ئەو پارەیەی کە وەردەگیرێت لەوانەیان کە هەردەم پەیمان هەڵدەوەشێننەوە، یان (خەراج) کە لەئەسڵدا لەسەر ئەوان دانراوە یان ئەو ماڵو داراییانەی کە خاوەنێکی دیاری کراویان نی یە، وەك: مسوڵمانێك بمرێو میراتگری نەبێت یان شتی زەوتکراو ئەمانەتو خوازراو

---

[1] ئەم پێناسەیە بۆ (فيء) پێناسەی هەرچوار مەزهەبەکەو هەموو زانایانی ئیسلامە .وەرگێڕ.

که خاوەنەکەیان نەناسرێتەوە، یان هەرماڵێکی تری موسڵمانان. ئەمانە هەرهەموویان (فيء)ن و دەخرێنە(بيت المال)ەوە.

وە بۆیە لە قورئانی پیرۆزیشدا تەنها ئاماژە بە (فيء) کراوە، لەبەر ئەوە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) هەرکەس بمردایە مەگەرچی ئەگین میرات گری هەبووە، چونکە لەنێو هاوەڵاندا ڕێچکەو ڕەچەڵەك زۆر ئاشکرا بووە. تەنانەت جارێکیان لە هۆزێك پیاوێك مرد، پێغەمبەر (ﷺ) میراتەکەی دا بە گەورەترین پیاوی ئەو هۆزە، واتە: نزیکترینیان لە باوانیانەوە.[1] وە پیاوێکیش وەفاتی کردوو لەپاش خۆی تەنها کۆیلەیەکی ئازادکراو نەبێت کەسی بەجێ نەهێشت بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) میراتەکەی گێڕایەوە بۆ کۆیلە ئازادکراوەکەی، وە جارێکیان میراتی پیاوێکی دا بە پیاوێکی خەڵکی گوندەکەی.[2]

وە لەسەردەمی پێغەمبەرو(ﷺ) ئەبوبەکری صدیق دا دیوانێکی کۆکەرەوە نەبو بۆ ئەو پارە وەرگیراو دابەشکراوانە، بەڵکو پارە کەم کەم دابەش دەکرا. بەڵام لە سەردەمی (عمری کوڕی خەتاب)دا لەبەر ئەوە پارە زۆرتر بو، وەخەڵکیش زۆرتر بوو، وە ولاتانی مسوڵمانانیش بەرفراوانتربو، بۆیە ئیمامی عمر- خوای لێ ڕازی بێت- هاتوو دیوانی بۆ جەیش و موجاهیدان دانا، ئەو دێوانەش گرنگترین دیوانەکان بو، وە بەهەمان شێوەش هەموو شارو ولاتەکان بۆ کۆکردنەوەی (حەج)و (فيء) و هەموو ئەو ماڵ و داراییانەی کە وەردەگیرێن هەریەك دیوانی خۆی هەبوو.

---

[1] دیارە ئەم کابرایە هیچ میراتگرێکی تری نەبووە.وەرگێڕ.

[2] مەبەستی شێخی ئیسلام ئیبن تەمییە ئەوەیە کە :(ماڵی (فيء) تەنهای ئەوەنیە لە بێبڕوا وەردەگیرێ بەبێ شەڕ، بەڵکو چەندین جۆری تریش دەگرێتەوە، وەك خۆی ئاماژەی پێ کرد. ئەمەیش کە ئەو دەیڵێت بۆچونی خۆی نیە، بەڵکو بۆچونی زۆربەی زانایانی ئیسلامە .وەرگێڕ.

وه پێغەمبەر و(ﷺ) جێنشینەکانی لەسەر کۆکردنەوەی زەکات و (فيء) و غەیری ئەمانەش محاسەبەی کرێکارەکانیان دەکرد،-مەبەست لەوەیە ئەگەر پیاوێکیان بناردبا بۆ کۆکردنەوەی زەکات یان هەر شتێکی دیکە ئەوا بەردەوام لێ پرسینەوەی هەبوو.

کەواتە: لەم سەردەمەو پێش ئەم سەردەمەشدا هەموو ماڵ و داراییەکان سێ جۆرن:-

جۆرێکیان بەبەڵگەی قورئانو سوننەتو ئیجماع بۆ ئیمام شایستەیە کە وەریگرێت- وەك ئەوانەی باسکران- غەنیمة-فيء-صدقة-، وەجۆرێکیشیان بە ئیجماع بۆی قەدەغەیە وەریگرێت، وەك:- کەسێك حەدێکی شەرعی کەوتۆتە گەردنیەوە پارە دەدات بۆ ئەوەی لەسەری بکەوێت و ئیمامیش پارەکەی لێ وەرگرێ و حەددەکەی لێ دەرنەکات، یان وەك گومرگ دانان کە بەئیتفاقی زانایان دانانی جائیز نیە[1].

وەجۆرێکیشیان (ئیتیفاق)ی لەسەر نیە بەڵکو شوێنی(ئیجتیهاد) وکێشەو جیاوازی زانایانە-کە ئێستە شوێنی باسکردنی نی یە-.

---

[1] ئەو گومرگە کە جائزنیە ماڵێکە کە بەزۆر بەبێ هیچ بەرامبەرێكو بەبێ پاساوی شەرعی لە خەڵکی دەستێنرێ، ئەگەرنا(ئیبن تەیمیە) هەرخۆشی لە شوێنی دیکە باسی کردووە کە جاری واهەیە (باج وەرگرتن) فەرزیش ئەبێت بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەك. م علی باپیر.

# فەصلی پێنجەم

## ستەمکردن هەم لەبەرپرسان هەم لە چینی خوارەوەشدا دەپشکوێتەوە

زۆرجار زوڵم لە لێپرسراوانو چینی خوارەوەش (قیادەو قەواعید)دا ڕوودەدات، دەبینی چینی خوارەوە شتێك حەڵاڵ نیە کەچی وەری دەگرن، وە چینی سەرەوەش زۆرجار شتێك کە فەرزە مەنعی دەکەن، وەجاری واهەیە لێ پرسراوان هەندێ لە موڵکی خوا دەشارنەوەو کۆی دەکەنەوە لەکاتێکدا کە ئەو ماڵە کۆکردنەوەی و شاردنەوەی حەڵاڵ نیە،-واتە: ماڵەکە بۆئیشی پێویستی خۆی بەکاری ناهێنێت-، وە بەهەمان شێوە سزادان بۆ گێڕانەوەی موڵك و ماڵ، زۆر جار لێپرسراوان واز لەهەندێکی دینێ لەکاتێکدا کردنیشی حەڵاڵن یان واجبە، زۆرجاریش کردەوەی سەیری وای لێ دەوەشێتەوە کە بە موو حەڵاڵ نیە!.

ئەصڵیش لەمەدا ئەوەیە: هەرکەسێك ماڵێکی بەسەرەوە بو، ئەوا واجبە بیگێڕێتەوە، وەك پیاوێك ڕاسپاردەیەکی لەلابێت، یان پارەی قازانج بەشەراکەت، یان پارەی شەریکی، یاخودماڵی هەتیو، یان ماڵی وەقف، یان ماڵی بیت المال، یان قەرزێکی لەلایەو دەشتوانێ بیداتەوە، جائەگەر ئەو مافە واجبەی لەسەریەتی نەیگێڕایەوە، وە زانراش کە دەتوانێت بیگەڕێنێتەوە ئەوە لەوکاتەدا شایستەی سزادانە هەتاوەکو پارەکەدەردەخات، یاخود بڵێ لەفڵانە شوێندایە، جائەگەر پارەکەی ئاشکراکردو لەنێو بەندینخانەدا ئارامی گرت، ئەوا ئەو پارەیە ئەومافەی کەلەسەریەتی وەریدەگیرێتەوەو پێویست بەلێدانی ناکات. بەڵام ئەگەر پارەکەی دەرنەخست و مافەکەشی نەگێڕایەوە، ئەوە لێی دەدرێت، هەتاوەکو مافەکە بگێڕێتەوە.

یان ئەگەر نەفەقەیك كەواجبە لەسەری بیداو دەیشیتوانی بیدات، بەڵام هەرنەیدا، ئەوا بەهەمان شێوە شایستەی سزادانە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لي الواجد يحل عرضه وعقوبته) رواه أهل السنن.

واتە: (دواخستنی دانەوەی قەرز بۆ كەسێك كەهەشیەتی بیداتەوە ئەوە ناموس و سزای حەڵاڵ دەكات)[1].

وە دەفەرموێت (مطل الغني ظلمٌ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (قەرز دواخستنی –قەرزكوێری– دەوڵەمەند ستەمە). دەی كەسێك كە ستەمكاربێت ئەوە بێگومان شایستەی سزادان و سەرزەنشت كردنیشە.

ئەوەش بنچینەیەكە زانایانی لەسەر ڕێكەوتون كە: هەركەسێك كردەوەیەكی قەدەغەكراو ئەنجام بدات،یان واجبێك بچوێنێ، ئەوە ئیتر شایستەی سزادانە، جائەگەر ئەوسزایە بەقورئانو سوننەت دیاری نەكرابو، ئەوا سەرزەنشت دەكرێت، سەرزەنشتەكەش لێپرسراو خۆی ئیجتیهادی تێدا دەكات،– چی پێ باشە بۆ ئەو كاتە ئەوە دەكات– بۆنمونە: سزای بابای دەوڵەمەندی قەرزكوێر بەبەندكردنیەتی جائەگەر هەرپێی داگرت لەسەرنەدانەوەی قەرزەكە ئەوە لێی دەدرێت و تاوەكو مافەكەی بداتەوە،ئەمەش كەباسكرا (فقهاء) لە شوێن كەوتوانی(ئیمامی شافعی) و (مالیك) و (احمد) و غەیری ئەوانیش باسیان كردووەو نابینم هیچ جیاوازییەكی تێدابێت:

چونكە ئیمام بوخاری–خوا لێی خۆش بێت– لە(ابن عمر)ەوە دەگێڕێتەوە: كاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) صوڵحی كرد لەگەڵ جولەكەی خەیبەردا لەسەر تەسلیم كردنی زەرد و سپی– ئاڵتون و زیو– و سیلاح، لەودەمەدا پرسیاری لە (سوعیە)ی مامی (حویەی كوڕی ئەختەب)كرد سەبارەت بەشوێنی قاسەی پارەو

---

[1] زانایان دەفەرموون: عرضه: واتە باسكردنی، (عقوبته) واتە: سجن كردنی. وەرگێڕ.

پولەکەی(حویە)ی[1]، ئەویش وتی: پارەو پولەکەی (حویەی کوڕی ئەختەب؛ بەهۆی شەڕو پێداویستیەکانیەوە هەمووی فەوتا، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: سەردەمی شەڕەکە نزیکەو پارەو پولەکەش زۆرترە لەوەی ئەو شەڕە تەواوی بکات!! بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) سوعیەیدا بەدەست (زوبەیر)ەوە، جا زوبەیریش ماوەیەك سزای سوعیەیدا، بۆیە سوعیەش شوێنی پارەو پولەکەی ئاشکراکرد[2]

وە ئەو پارەو پولەی کە نێردراوانی لێ پرسراولە (بیت المال)ی مسوڵمانان بەبێ حەق وەریدەگرن بۆ خۆیان، وەك ئەو بەخشینەی کەبەهۆی کارەکانیانەوە وەریدەگرن، ئەوە بۆ لێپرسراوی دادپەروەر هەیە کە لێیان وەرگرێتەوە. (ئەبو سعیدی خودری) -خوا لێی ڕازی بێ- دەفەرموێت: (هدایا العمال غُلُول) [3]

واتە: (ئەو بەخشینەی کەدەدرێت بەنێردراوان ئەگەر وەریگرن بۆ خۆیان، ئەوە دزییە) وە (ئیبن عباس)-خوای لێی ڕازیبێت- دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هدایا الأمراء غُلُول) رواه الطبراني في الأوسط. واتە: (ئەو بەخشینەی کە دەدرێت بەلێپرسراوان ئەگەر تایبەتی بکەن بە خۆیانەوە ئەوا دزییە)

لە صحیحی (بوخاریو موسلیم)دا هاتووە (ئەبی حومەیدی ساعدی) دەفەرموێت: ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی لە بنەماڵەی (الازد) نارد بۆ

---

[1] حویەی کوڕی ئەختەب سەرکردەی جولەکەی -بنی نضیر -بوکەویستیان پێغەمبەر(ﷺ) بکوژن. الرحیق المختوم ص٢٦٨-٢٨٩.وەرگێر.

[2] ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەو بنچینەیەی کە پێشتر باسی کرد.وەرگێڕ.

[3] ئەمە وتەی صەحابەیەو پێی دەوترێت: فەرموودەی (موقوف)، جا ئەگەر لەباسی حەرام و حەلاڵ و حوکمی شەرعیدا بو ئەوە وەك فەرموودەی(مرفوع) وایە، واتە وتەی پێغەمبەر (ﷺ) تیسیر مصطلح الحدیث ص١٣١ وەرگێڕ

کۆکردنەوەی صدقە، جا ئەو پیاوە کاتێك گەڕایەوە وتی: ئەمە بۆ ئێوەیەو ئەمەشیان پێشکەشی خۆم کراوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە چی یە پیاوی وا هەیە لە ئیشێکدا کە خوا پێی سپاردوین کە دایدەنێین، دێتو دەڵێ: ئەمە بۆ ئێوەو ئەمەش پێشکەشی خۆم کراوە؟!! جابۆناچێت لەماڵی بابو دایکی دانیشێتو بزانێت ئەو شتەی پێ دەبەخشرێت یا نا؟!! بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە هەر شتێك لەوەی کۆی کردۆتەوە هەڵیگرێ بۆخۆی، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتتدا کە دێت بۆ حیساب وابە سەر نەڕرەی شانیەوە، جا ئەگەر حوشتر بێت دەهوشێنێ و، ئەگەر مانگا بێ دەبۆڕێنێو ئەگەر مەڕبێت دەباڕێنێ! پاشان پێغەمبەر(ﷺ) هەردو دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: خوایە گەیاندم؟ خوایە گەیاندم؟ خوایە گەیاندم؟.

بەهەمان شێوە لە کڕین و فرۆشتندا یان لە قازانج بەشەراکەتتدا یان لەباخەوانیدا یان هەر سەودایەکیتر ئەگەر بەهۆی بەرپرسیاریەتیەکەیانەوە خاتریان گیرا ئەوە وەك جۆرێك لە بەخشین وایە. هەربۆیە( عومەری کوڕی خەتاب)– خوا لێی ڕازی بێت– هەریەکە لە نێردراوەکانی خۆی ئەگەر بەهۆی لێپرسراویەتیەکەیانەوە لە سودایەکدا تایبەت بکرابایە ئەم لەگەڵیدا دەیکردە نیو بە نیو!!.لەڕاستیشدا ئەو جۆرە کارانە مەگەر پیاوانی وەك (عومەر) بوەشێتەوە... چونکە ئیمامی(عومەر) –خوا لێ ڕازیبێت– پێشەواو پێشڕەوی داد پەروەری بوو.

بەڵام لەحەلێکدا ئەگەر لێپرسراو ئەو ماڵ و موڵکەی کەلە نێردراوەکانی دەسەندەوە دەیەویست هەڵیگرێتەوە بۆ خۆی و تایبەتی کات بەخۆیەوە ئەوە نابێت لەو کاتەدا یارمەتیو کۆمەکی هیچ کامیان بکرێت چونکە هەردوکیان لەوکاتەدا زاڵمن هەروەك دزێك وایە دزی لە دزێکی تر بکات یان وەك ئەو دووکۆمەڵەی کەلەسەر دەمارگیری بەشەڕدێن، ئەصڵیش لەمەدا دەگەڕێتەوە

بۆ ئەوەی کە بۆ هیچ کەس حەڵاڵ نیە لە زوڵم دا یارمەتی هیچ کەسێکی دیکە بدات، چونکە یارمەتیدان دوو جۆرە:-

جۆری یەکەم/یارمەتی دان لەسەر چاکەو پارێزکاری وەك: جیهاد،بەرپاکردنی حەددەکان گێڕانەوەی مافی مافداران بەخشین بەخەڵکانی شایستە جائەمە خواو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیان پێ کردووە بۆیە هەرکەس وازی لێ بێنێو بچێ خۆی لێ قوتاربکات بەبیانوی ئەوەی نەبێتە یاریدەدەری ستەمکاران ئەوە فەرزێکی عەینی چواندوەو بەگومانی خۆیشی خۆی پاراستووە چونکە زۆرن ترسنۆکی و (وەرع) تێکەڵ بەیەکتر دەکەن، -وەك کورد دەڵێ: دومەڵ بەبەز تێگەیشتون-!!.

جۆری دووەم/ یارمەتی دان لەسەر تاوان‌و دەستدرێژی: وەك: یارمەتی دانی کەسێك لەسەر ڕشتنی خوێنی کەسێکی بێتاوان... یان پارەسەندن لە پیاوێکی بێ تاوان یان لێدانی کەسێك کە شایستەی لێدان نەبێت... ئەمەشیان خواو پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەیان کردووە.

بەڵێ بەلام ئەگەر ئەو پارەو پولە بەشێوەیەکی ناحەقانە لە کۆمەڵێك وەرگیرابوو بەس نەدەتوانرا بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەکانی ئەوە لەو کاتەدا یارمەتی دان و تێکۆشان بۆ بەکارهێنانی ئەو پارەوپولە لەبۆ بەرژەوندی مسوڵمانان، وەك: گرتن و پڕکردنەوەی سەرنگەرەکان..نەفەقەی موجاهیدان و ... هتد، لەیارمەتی دانە لەسەر چاکە و پارێزکاری. چونکە ئەو جۆرە پارەو پولەی کەبەشێوەیەکی ناحەق وەرگیراوەو ناش گونجێت خاوەنەکەی بناسرێتەوەو بۆی بگێڕدرێتەوە لێپرسراوی مسوڵمانان فەرزە لەسەری بەکاری بهێنێ و سەرفی بکات بۆ بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان. ئەمەش قسەی (جمهوری) زانایانە وەك: (ئیمامی مالیك)و(ابوحنیفە)و(احمدی کوڕی حەنبەل). وەزۆرێك لەهاوەڵەکانی پێغەمبەریش ئەم بۆ چونەیان لێوە نەقڵ کراوەو بەڵگەی شەرعیش هەر لەسەر ئەمەیە.

# فەصڵی شەشەم

## دابەشکردنی -فيء- دەستکەوت

بۆ سەرفکردنی- فيء-دەبێ لەکاتی دابەش کردنەکەیدالەسەرەتاوە دەست بکرێت بەگرنگترین بەرژەوەندیە گشتیەکانی موسڵمانان، بۆنمونە: بدرێت بەوانەی کە بەهۆیەوە سودێکی گشتی بە موسڵمانان بگەیەنێت، جا یەکێك لەوانەی کە شایستەن(موجاهیدان)ن کە شایستەترین خەڵکن بەماڵی (فيء) چونکە ماڵی (فيء) تەنها بەڕەنجی ئەوان وەدەست دەکەوێت، تەنانەت (شەرعزانان) جیاوازن کە: ئایا ماڵی (فيء) تایبەتە بەموجاهیدانەوە یان بەهەموو بەرژەوەندیەکانەوە؟ وەیەکێکی تر لەوانەی کە شایستەن: (ئەوانەن کە کاریان پێ سپێردراوە) وەك: (لێپرسراوان-قازیەکان-زانایان-ئەوانەی کە ئیمام دەیاننێرێت بۆ کۆکردنەوەی پارەو(صەدەقات)و پاراستنیو دابەشکردنی- وەئیشەکانی تریش، تەنانەت بەرنوێژی کەران و بانگدەرانیش دەگرێتەوە.

وەهەم دیسان دەبێت سەرف بکرێت بۆ ئەو بەرژەوەندیانەی کە سودەکەیان گشتییە وەك: پڕکردنەوەی سەنگەرو سنورەکان بە وڵاخو سەیارەو سیلاح، یان وەك: ئاوەدان کردنەوەی ڕێگەو بانی خەڵکی ئەوانەیان کە پێویستیان بە ئاوەدان کردنەوە هەیە، وەك: ڕێگاکانی ئاو وەك:ڕوبارەکان و شتی تریش.

یەکێکیتر لەو کۆمەڵانەی کە شایستەن: (خاوەنی پێویستیو موحتاجەکان): چونکە (شەرعزانان) جیاوازن: ئایا لەغەیری (زەکاتیشدا) وەك (فيء) پێشی خەڵکی تر دەکەون؟ دووقسەیان لەسەری هەیە:

کۆمەڵێکیان دەڵێن: پێش دەکەون. کۆمەڵێکیان دەڵێن: وەك یەکن. بەڵام ڕای ڕاستو پەسەند ئەوەیە کە دەبێ پێش بکەون چونکە پێغەمبەر (ﷺ)

**هەمیشەو هەردەم موحتاجەکانی پێش دەخست هەروەك دەبینین لە ماڵ و مولْکی (بنی نضیر)یەکاندا کە (فيء) بوو پێشی خستن[1].**

**ئیمامی (عومەر) خوا لێی ڕازی بێ دەی فەرموو: (بەڕاستی لەم ماڵی( فيء )دا هیچ کەس نەکەسی تر شایستەتر نیە، بە گوێرەی پیاوو پێشکەوتنی لە ئیسلامدا، وە پیاوو ئیش‌وسودی[2]، وە پیاوو دەوربینینی‌و پەرێزی لە ئیسلامداوە پیاو ئەندازەی پێویستیەکەی حیسابی بۆ دەکرێت).[3] رواه أحمد أخرجه البیهقي.**

**ئەگەر تێڕامێنین دەبینین ئیمامی (عومەر)- خوای لێ ڕازیبێت- لەمەڕ ماڵی(فيء)دا موسڵمانانی کرد بەچوار بەشەوە:**

**یەکەم: پێش کەوتوان ئەوانەی کەبەهۆی پێش کەوتنی ئەوانەوە لە ئیسلامدا ئەو پارەو مولْکە وەدەستکەوتوە.**

**دووەم: ئەوانەی کە هەمیشە لە ئیشەکەیاندا سود بە موسڵمانان دەگەیەنن، وەك: فەرماندەو لێپرسراوان و، زانایان ئەوانەی کە هەمیشەو هەردەم سودی دین و دونیا بە موسڵمانان دەگەیەنن.**

**سێیەم: ئەوانەی کە لە پێناو قوتارکردنی موسڵمانان لەزەرەرو زیان دوچاری تاقیکردنەوەو ناڕەحەتی دەبن،وەك: موجاهیدانی ڕێگەی خواو نمونەی ئەوان.**

**چوارەم: ئەوانەی خاوەنی پێویستیەکانن.**

---

[1] ئەمە لەکاتێکدا بوو خوای گەورە ماڵ و مولْکێکی زۆری (بنونضیر)یەکانی وەدەست موسڵمانان خست، زانایان دەڵێن: تەنها سیلاح نزیکەی (٥٠)زرێ‌و، (٥٠)کەوان‌و،(٣٤٠)شمشێربوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر کۆچکەرەکان (المهاجرین)دا دابەشیکرد بەڵام لەبەر هەژاری‌و نەداری بەشی دووان لەیاریدەدەرەکانیشیدا کە (ابو دجانە) و (سهل بن حنیف) بوون. الرحیق المختوم ص٢٧٠-٢٧١. وەرگێڕ

[2] شەوکانی دەفەرموێت: مەبەست لەم بڕگەیەیان ئەوەیە کە: پیاوێك ئەگەر هەڵدەستا بە ئیشێك ئەو ئیشەش بەو نەبێت بەکەس نەدەکرا ئەوە شایستەی زیادە پێ بەخشینە.نیل الاوطار م٨ ص٨٥. وەرگێڕ

[3] نیل الاوطار م٨ ص٨٤-٨٥. وەرگێڕ.

جا لەپاش ئەوەی زانیت بەخشین بەگوێرەی سودی ئەو پیاوەو پێویستیەتی، کەواتە: زیاد لە پێویستیەکەی شایستەی نیە و پێی نادرێت مەگەر وەك هاو چەشنانی خۆی وەبەهیچ شێوەیەك بۆئەمیری موسڵمانان جائیز نیە کەسێك کە شایستەنیە بەڵام تەنها لەبەر ئارەزوی خۆی پارەی پێ بدات وەك: خزمایەتی نێوانیان یان خۆشەویستیەکی تایبەت و..هتد.

بەڵام ئەگەر کەسێك پێویست بوو دڵی ڕاگیرێت ئەوە جائیزە-بەڵکو فەرزیشە- بۆ دڵ ڕاگرتنی پارەی پێ ببەخشرێت، وەك دەبینین خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا حەڵاڵی کرووە کە لەپارەی زەکات بدرێت بە نەو موسڵمانان-دڵ ڕاگیراوان- یان پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەمیشە لەپارەی (فيء) ی دەدا بەنەو موسڵمانان و دڵ ڕاگیراون- المؤلفة القلوب- بەتایبەت ئەوانەیان کەسەرکردەو لەنێو هۆزەکانیاندا گوێڕایەڵی بۆکراو بوون، وەك ئەمانەی لای خوارەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ دڵ ڕاگرتنیان پارەی پێداون:-

١. (ئەقرەی کوڕی حابس) گەورەی هۆزی بەنی (تەمیم).

٢. (عویەینەی کوڕی حصن)گەورەی هۆزی(فەزارە).

٣. (زیدی خەیدی طائی)گەورەی هۆزی (نەبهان).

٤. (عەلقەمەی کوڕی غولاسەی عامری) گەورەی هۆزی (کیلاب). یان پیاوە گەورەکانی قورەیش لەئازاد کراوەکان، وەك:-

٥. (صەفوانی کوڕی ئومەیە).

٦. (عەکرەمەی کوڕی ئەبی جەهل).

٧. (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب).

٨. (سوهەیلی کوڕی عەمر).

٩. (حارسی کوڕی هیشام).

١٠. وەژمارەیەکی زۆری دیکە.

له صەحیحی (بوخاریو موسلم)دا هاتووە کە (ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێت: (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)-خوای لێ ڕازی بێت- لەکاتێکدا کە لەولاتی (یەمەن) بوو لە نێو تورەکەیەکدا ئەندازەیەك ئاڵتونی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەریش(ﷺ) لەنێو ئەم چوار کەسەدا بەشیکرد: (ئەقرەی کوڕی حابسی حەنزەلی)و (عویەینەی کوڕی حصن فەززاری)و (عەلقەمەی کوڕی غولاسەی عامری)و (زیدی طائی)جا ئەبو سعید دەفەرموێت: موسڵمانە قوڕەیشیەکانو ئەنصارەکان توڕەبوونو وتیان: پێغەمبەری خوا بە پیاوە زلهێزەکانی (نەجد) دەبەخشێو واز لەئێمە دێنێ!! پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: من تەنها بۆ دڵڕاگرتنیان ئەوەم کرد)!!

وە (ڕافیعی کوڕی خودەیج) - خوالێی ڕازی بێ- دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەریەکە لەئەبو سوفیانی کوڕی حەرب)و (صەفوانی ئومەیە)و (عویەینەی کوڕی حصن)و (ئەقرەی کوڕی حابس) صەد حوشتری پێدان- هەریەکە سەد حوشتر!!- بەلام لەوان کەمتری دابوبە(عەباسی کوڕی مەرداس)، بۆیە (عەباس)یش ئەم شیعرەی وت:

**اتجعل نهبي ونهب العبيد بين عيينة والأقرع**

**وما كان حصن ولا حابس يفوقان مرداس في المجمع**

**وما طالما كنت دون امريء منهم. ومن يخفض اليوم لا يرفع**

(ئەبو سەعید) دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (عەباس)یشی کردبە (صەد حوشتر) رواه مسلم.

دڵ ڕاگیراوانیش -المؤلفة القلوب- دوو جۆرن:

یەکەم/ موسڵمانان.

دووەم/ بێبڕوایان.

بێبڕواکه ئەگەر هیوای پێ ئەکرا بەهۆیەوە سودێکی هەبێت، وەك: موسڵمان بوونی یان زەرەرو زیانی دوور بخرێتەوە، ئەگەر بەوە نەبێت دوور نەئەخرایەوە . موسڵمانەکەش بەهۆی ئەو بەخشینەوە سودێکی هەبێت، وەك: باشتر موسڵمان بونی، یان موسڵمان بوونی خەڵکانی تر و هاوچەشنانی ئەو.

وەشایەنی باسە ئەم جۆرە بەخشینەیان، ئەگەرچی ڕووکەشەکەی بەخشینی سەرکردەکان و لەبیر کردنی هەژار و لاوازەکانە- وەك ڕەفتاری پادشاو زلهێزەکان-، بەڵام پێوەری کردەوەکان نیازی دڵە، جائەگەر مەبەست بەو بەخشینە بەرژەوەندی دین و ئەهلی دین بێت ، ئەوە وەك بەخشینەکەی پێغەمبەرو (ﷺ) جێنشینەکانی وایە، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی خۆبەرز کردنەوەو خراپەکاری بێت ئەوە وەك بەخشینی فیرعەون وایە!!.

تەنها کەسێکیش بەرگری لەو شتە دەکاتو پێی ناخۆشە-دڵڕاگرتنی نوێ موسڵمانان- کە خاوەنی دینێکی فاسد بێت، فەرموودەکەی پێغەمبەریش (ﷺ) کە دەفەرموێت: (إنما الأعمال بالنيات) رواه البخاري ومسلم. وشەیەکی کۆکەرەوەی تەواوە، چونکە نیەت بۆ کردەوە وەك ڕوح وایە بۆ لاشە.

ئەوەتا سەیر دەکەی: هەریەکە لەوەی کە کڕنوشی بۆ خوا بردووەو ئەوەیش بۆ خۆرومانگ هەر نێوچاوی خستۆتە سەرزەوی و شێوەی ڕەفتارەکەیان یەکێکە... بەڵام یەکەمیان نزیکترین خەڵکە لە خواوەو دوومیشیان دورترین خەڵکە لە خواوە!!.

# پۆلێنکردنی خەڵك لە تورەبووندا

لەمبارەوە خەڵکی بەگشتی سێ بەشن:-

کۆمەڵێکیان هەم بۆ خۆشیان و هەم بۆ پەروەردگاریشیان تورەدەبن . کۆمەڵێکیشیان نەبۆ خۆیان نەبۆ خواش، کۆمەڵی سێیەم- کە ناوەندە- ئەوانەن کەتەنها بۆ خوا رقیان هەڵدەستێ نەك بۆ خۆیان. وەك لە صحیحی (بوخاری موسلم دا هاتوە کە (عائیشە)ی دایکی ئیمانداران دەفەرموێت: (ما ضرب رسول الله ﷺ بیده خادماً له، ولا إمرأة، ولا دابةً، ولا شیئاً قط، إلاّ أن یجاهد في سبیل الله، ولا نیل منه شيء فانتقم لنفسه قط، إلاّ أن تنتهك حرمات الله، فإذا انتهكت حرمات الله لم یقم لغضبه شيء حتی ینتقم لله) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ کات بەدەستی خۆی نەیداوە لەخزمەت کارێکی وەنەیداوە لەژن یان وڵاخ یان هەرشتێکی تر مەگەر لەپێناوی خوادا جیهادی بکردبا وەهیچ شتێکی لێ نەکراوە تۆڵەی بۆ خۆی کردبێتەوە مەگەر سنورە قەدەغەکراوەکانی خوا هەتك بکرابایا، جا هەرکات سنورەکانی خوا هەتك بکرابایا هیچ شتێك تورەیی پێغەمبەری (ﷺ) نەدەمرکاندەوە هەتا وەکو تۆڵەی بۆ خوا نەکردبایەوە!)

بەڵام ئەوەی کە بۆ خۆی رقی هەڵدەستێ نەك بۆ خوا یان هەردەم شت بۆ خۆی هەڵدەگرێو بەشی خەڵکانی تری لێ نادات ئەمانەش بەشی چوارەمن لە خەڵکی کە خراپترینی خەڵکن و نە دینیان پێ باش دەبێو نەدونیا.

بەڵام ئەوانەی کە پیاوچاكو صالحو خاوەنی سیاسەتێکی چروپرو تەواون ئەوانەن کە: فەرزەکان رادەپەرێنن... واز لەقەدەغەکراوەکان دێنن.. وەکەسێك کە سودی بۆ دین هەبێت هەردەم شتی پێ دەبەخشن وەشتێکیش کە پێیان حەڵاڵ نەبێ وەری ناگرن... وەئەگەر سنورەقەدەغەکراوەکانی خوا هەتك

بکرێت یەکسەرڕقیان هەڵدەستێ و توڕەدەبن... وەلەمافەکانی خۆیان خۆش دەبن و لێدەبورن... بێگومان ئەمانەش لە خوڕەوشتەکانی ئیسلام بونە کە کامڵترینی خوڕەوشتە.

جا مرۆڤی موسڵمان هەتا وەکو زیاتر لەم خوڕەوشتانەوە نزیکتربێت ئەوە باشترو کامڵتر دەبێت بۆیە پێویستە موسڵمان هەردەم تێبکۆشێت بۆ ئەوەی زیاترو زیاتر لێیان نزیکبێتەوە پاشان داوای لێ خۆشبونیش بکات لەخوای لێ بوردە بەرامبەر هەرکەمتەرخەمیەك ئەنجامی دابێت. ئەمەش هەمووی سەبارەت بەو ئایەتەی کەدەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا)(النساء:٥٨) [١].

[١] لەسەرەتاوە فەرمووی ئەم پەڕاوە کەناوی (سیاسەتی شەرعییە) لەسەر دوو ئایەت بنیاتنراوە (٥٨و ٥٩)ی سورەتی (نساء) جا هەتاکو ئێرە دەربارەی برگەی یەکەم لەئایەتی یەکەمدا ڕۆیشتووە، واتە: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا) پاشان لەمەودوا لەسەر برگەی دووەم دەڕوات کە ئایەتی (وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ) النساء:٥٨. وەرگێڕ.

# بەشی دووەم ( حەددە شەرعیەکان و مافەکان )

## ئەم بەشەشیان دوو بەندی لەخۆی گرتووە:

## ( بەندی یەکەم )

## حدود الله و حقوقە- سنورەکانی خواومافەکانی

## جا ئەم بەندی یەکەم بریتیە لە نۆ فەصڵ

## ( فەصڵی یەکەم )

## ( چەند نمونەیەك لەو ماف و حەددانەو ئەرکی لێپرسراو لەئاستیان )

پاشان لە بڕگەی دووەمی ئایەتەکەدا خوای دادگەر دەفەرموێت: (وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ اَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ) (النساء:٥٨).

واتە: (خوا فەرمانتان پیٚ دەکات ئەگەر حوکمتان لەنێو خەڵکی دا کرد ئەوە بەداد پەروەرانە حوکم بکەن).

حوکم کردنیش لەنێو خەڵکیدا دووجۆرە:-

یەکەم/لە (حەددە)کاندا – الحدود- (سنورە شەرعیەکان).

دووەم/ لەمافەکاندا – الحقوق-

ئەمانەش دوو بەشن:-

یەکەم: ئەوماف و حەددانەی کە سودەکەیان بۆ دەستەیەکی دیاری کراو نی یە بەڵکو سودەکەی بۆ تێکڕای موسڵمانانەو هەمووشیان پێویستیان پێیەتی جائەمانەش پێیان دەوترێت: (حدود الله، یان حقوق الله)[1] نمونەی ئەمانەش وەك: حەددی ڕێگەگرە -قطاع الطريق- یان دزەکان -السراق- یان داوێنپیس و زیناکەرەکان- الزناة-وجۆرەکانی تریش- یان وەك حوکمکردن لەو پارەو سامانەی کەهەردەم دێتە بەردەستی کاربەدەستی موسڵمانان (الأموال السلطانية).

---

[1] زانایان دەفەرموون: مافەکاندووجۆرن: یەکەم/ (حق الله) دووەم/ (حق العبد). دەڵێن: هەر حوکمێکی شەرعی بەرژەوەندیەکەی بۆ گشتی بێت ئەوە پێی دەوترێت (حق الله) وە هەر حوکمێکی شەرعی بەرژەوەندیەکەی بۆتاکەکەس بێت پێی دەوترێت(حق العبد) الوجيز فی اصول الفقه ص٨٢. وەرگێڕ.

جا بەڕاستی بەرپاکردنی ئەم یاسا شەرعیانە لەگرنگترینی ئەرکەکانی لێپرسراویەتیە لە ئیسلامدا هەر بۆیە ئیمامی (علی) -خوا لێی ڕازی بێت- فەرموویەتی: (خەڵکی هەردەبێت ئەمیریان هەبێت ئیتر ئەو ئەمیرە چاك بێت یان خراپەکار-فاجر-بێت لەو کاتەدا وترا: ئەی ئەمیری بڕواداران: ئەمیری چاك ئەوەدەزانین پێویستە بەڵام ئەی ئەمیری خراپ بۆچی؟ ئەویش فەرمووی: چونکە سنورە شەرعیەکانی پێ بەرپادەکرێ‌و، ڕێگاکانی پێ ئارام دەکرێ‌و لەگەڵ دوژمندا جەنگی پێ دەکرێ‌و ماڵی-فیء- دەستکەوتیشی پێ دابەش دەکرێت.)

بەڵێ ئەم بەشەیان کە-(حق الله)یەو بەرژەوەندیەکەی گشتیە لەسەر لێپرسراوان. فەرزە لێی بکۆڵنەوەو هەردەم بگەڕێن بەدوایدا، وە بەرپاکردنیشیان پێویستی بە(دەعوا)ی هیچ کەسێك نین ئەگەرچی زانایان سەبارەت بەدەستی دز جیاوازن کە: ئایا پێویست بەوەدەکات بابای دزی لێکراو داوای ماڵەکەی بکاتەوە؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان یەك دەنگن کە پێویست ناکا کە بابای دزیلێکراو داوای بەرپاکردنی (حەددە)ەکە بکات[1].

وەهەمدیسان ئەم بەشەیان- حق الله- دەبێ بەبێ جیاوازی بەسەر خەڵکانی بەڕێزو بێڕێزو بەهێزو بێ هێزەوە بەرپا بکرێت وەوازلێهێنان‌و تەرککردنیشی بەهیچ شێوەیەك دروست نیە، ئیتر بەهۆی تکاکردن (شەفاعەت)ەوە بێت یان بەخشین(هەددیە) وەیان هەرشتێکی دیکە. جاهەرکەس بەهۆی ئەمانەوە- تکاو بەخشین- تەرکی بکاو بەرپای نەکات- لەکاتێکدا توانای بەرپاکردنیشی هەبێت- ئەوە نەفرەتی خواو فریشتەکان‌و هەموو خەڵکی لەسەرە وەخوای دادگەر هیچ شتێکی لێ وەرناگرێت‌و لەوکەسانە دەژمێردرێت

---

[1] واتە: کابرای دزی لێکراو داوابکات‌و داوانەکات دەبێ هەردەستی ببڕدرێت چونکە بەرژەوەندی لەو حوکمە شەرعیەدا تەنها بۆ کابرای ماڵدزراو نیە بەڵکو گشتی یە. وەرگێڕ.

که ئایەتەکانی خوای بە پارەیەکی کەم فرۆشتووە. وەك عبداللەی کوڕی عومەر –خوا لێی ڕازی بێت– دەفەرموێت: پێغەمبەری‌خوا(ﷺ) فەرموویەتی: تکای هەرکەسێك ببێتە پەرچ لەبەردەم سنورێك لەسنورەکانی خوادا ئەوا دژایەتی خوای کردووە وەهەرکەس لەشتێکی ناحەقدا–بزانێت کە ناحەقە– دژایەتی یەکێکیتر بکات ئەوە بەردەوام خوای تۆڵەستێن لێی توڕەیە تاوکو واز بهێنێت وهەرکەسێکیش شتێك بەموسڵمانێك بڵێت‌و تێیدا نەبێت ئەوە لەنێو قوڕاوی تێکچوودا بەند دەکرێت هەتاوەکو پەشیمان بێتەوە لەوەی کە وتویەتی‌و وترا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) قوڕاوی تێکچوو چیە؟ فەرمووی: کێم‌و جەڕاحەتی جەهەنەمیەکان)ە.

وەلەصحیحی بوخاری‌و موسلیم‌دا هاتووە کە عائیشە – خوای لێ ڕازی بێت– دەفەرموێت: (ئافرەتێکی مەخزومی دزی کردبوو جا قوڕەیشیەکان بەلایانەوە شتێکی گران بوو کە (حد)ی لەسەر بەرپا بکرێت بۆیە وتیان کێ سەبارەت بەم ئافرەتە قسە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دەکات؟ وتیان: (ئوسامەی کوڕی زەید) نەبێت کەسی تر جورئەت ناکات، پێغەمبەری خواش (ﷺ) بە ئوسامەی فەرموو: ئەی ئوسامە ئایا لەسنورێك لەسنورەکانی خوادا تکادەکەیت؟! ئەوەی بەنوئیصرائیلیەکانی لەنێوبرد ئەوەبو ئەگەر لە نێوانیاندا بابایەکی بەڕێزو گەورە دزی بکردبا وازیان لێ دەهێنا بەڵام ئەگەر لاوازێك دزی بکردایە ئەوە (حد) یان لەسەر بەرپا دەکرد، دە بەو خوایەی کە گیانی محمدی بەدەستە ئەگەر فاتمەی کچی محمدیش دزی بکا دەستی، دەبڕم).

لەڕاستیشدا ئەم ڕووداوە پڕە لەپەند و ئامۆژگاری لەبەرئەوە:–

یەکەم/ چونکە بەڕێزترین هۆز لەنێو قوڕەیشدا (بەنو مخزوم‌و بەنو عبد المناف) بوون جا ئەو ئافرەتە لەوان بوو کەلەگەورەترینی هۆزەکان و بەئابڕوترینی ماڵەکان بوو.

دووەم/ ( ئوسامەی کوڕی زەید) تکای بۆ کرد کەئەوەندە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشەویست بوو پێیان دەووت: (حب رسول الله) بەڵام لەبەرئەوە دەست بڕینی ئەو ئافرەتە واجب بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردەستی بڕی‌و لەئوسامەش توره بوو وە ڕێگەشی لێ گرت کە تکا بکات لەشتێکدا کە خوای گەورە ڕێگەی لێ گرتبێت پاشان نمونەیشی بەبەڕێزترین‌و گەورترین ئافرەتی جیهان هێناوە- کە خوای گەورەش لەوجۆرە کارانە پاك ڕایگرتووە- وەفەرمووی: (لو ان فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها)!!

ئیمامی (مالك) لەکتێبی (الموطأ)دا دەگێڕێتەوە: جارێکیان کۆمەڵێك دزێکیان گرتبوو بۆ ئەوەی بیبەنە لای (عوسمانی کوڕی عەففان) جا لەڕێگادا (زوبەیر)یان پێگەیشت زوبەیریش کەوتە تکاکردن بۆ دزەکە ئەوانیش وتیان: با ببرێت بۆلای عوسمان جا لەوێ تکای بۆبکە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر حەددە شەرعیەکان هێنرانە لای سوڵتان ئەوە ئیتر خوا نەفرەتی لەتکاکەرو تکاوەرگریش کردووە.

وەجارێکیان (صەفوانی کوڕی ئومەییە) لەمزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر عەباکەی خەوتوبو لەوکاتەدا دزێك عەباکەی لێ دزی (صەفوانیش) دزەکەی گرت و هێنایە لای پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەریش فەرمانی بەبڕینی دەستی کرد صەفوانیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر عەباکەی من دەستی دەبڕی؟! ئەوا من دەیبەخشم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەی بۆ بەرلەوەی بیهێنیتە لای من پێت نەبەخشی؟!! پاشان دەستی دزەکەیان بڕی. مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەبو: تۆ ئەگەر بەرلەوەی بتهێنابایە بۆ لای من چاوپۆشیت لێ بکردبایە ئەوە دەبو بەڵام لەپاش هاتنی بۆ لای من ئیتر تەرك کردنی ئەو (حەدد) نە بە چاوپۆشی‌و... نە بە تکاکردن‌و.. نەبە بەخشین جائیز نیە!!.

جا بۆیە ئەوەندەی من بزانم زانایان یەك دەنگن لەسەرئەوەی: (ڕێگر)یان (دز)یان نمونەی ئەوان ئەگەر هێنرانەوە بۆلای لێپرسراو پاشان تۆبەیان کرد ئەوا (حەدد)ەکەیان لەسەر لا ناکەوێ بەڵکو ئەو حەددە واجبە هەربەرپا بکرێت ئەگەرچی تەوبەش بکات!

جائەگەر لەتەوبەکەیاندا ڕاست بکەن ئەوە بەرپاکردنی حەددەکە دەبێتە (کەفارەت) بۆیان.

وەك خوای بەخشەر لەو بارەوە دەفەرموێت: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلاَفٍ أَوْ يُنفَوْا مِنْ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ(٣٣)إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) المائدة: ٣٣-٣٤ واتە: (ئەوانەی کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن‌و، لەنێو زەویدا خراپە بڵاو دەکەنەوە، تەنها سزایان ئەوەیە کە: بکوژرێن، یان هەڵواسرێن، لە ڕاست‌و چەپەوە دەست‌و قاچەکانیان بقرتێنرێن، یان لە وڵات دەربکرێن، جا ئەمە لە دونیادا سەرشۆڕی‌و ڕیسواییەکە بۆیان، وە لە دواڕۆژیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە، تەنها ئەوانەیان نەبێت کە پێش ئەوەی بەردەستتان بکەون دەگەڕێنەوە‌و تەوبە دەکەن، جا بزانن بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە[1]).

سەیر دەکەی لە ئایەتەکەدا تەنها ئەوانەی جیا کردۆتەوە کە پێش دەست بەسەردا گرتنیان تەوبە دەکەن، بەڵام ئەوەی کە لەپاش دەست بەسەرداگرتنی تەوبە دەکات، ئەوە بەرپاکردنی (حەدد)ەکەی هەر بەسەرەوە دەمێنێت، ئەمەش لەبەر (مەفهوم)ی ئایەتەکە.

---

[1] مختصر تفسیر إبن کثیر م١ ص٥١٠-٥١٣. وەرگێڕ.

وە (عبدالله‌ی کوڕی عومەر) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لە سنورە شەرعییەکاندا لەنێوان خۆتاندا لەیەکتر ببورن، چونکە هەرچی (حەدد)ێك گەیشتە لای من، ئەوە ئەنجام دەدرێت) رواه أبوداود والنسائی. وە (ئەبوهورەیرە) –خوای لێ ڕازی بێت– لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (حد يعمل به في الأرض، خير لأهل الأرض من ان يمطروا أربعين صباحا) رواه النسائي وإبن ماجه. واتە: (ئەنجامدانی سنورێکی شەرعی لەنێو زەویدا، بۆ خەڵکی سەر زەوی چاکترە لەوەی چل بەیانیان بارانیان بۆ ببارێت!!) هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی: گوناهو سەرپێچییەکان تاکە هۆی کەمبونەوەی ڕۆزیو دروستبونی ترسە لە دوژمن، وەك (قورئان) و (سوننەت)یش لەسەر ئەو ڕاستیە بەڵگەن، بەڵام ئەگەر سنورە شەرعییەکان بەرپا کران، ئەوە گوێڕایەڵیکردن بۆ خوا وردە وردە زاڵ دەبێو دەردەکەوێ، وە لەم لاشەوە سەرپێچیکردنی خوا کەم دەبێتەوەو لاواز دەبێ، جا دەرئەنجام ئەگەر گوێڕایەڵی بۆ خوا پەرەی سەندو سەرپێچیش کەم بوویەوە، ئەوە ئیتر هەم ڕۆزی بەدەست دێو هەم سەرکەوتنیش مسۆگەر دەبێت.

# حوكمی وەرگرتنی پارە لەبری بەرپا نەكردنی سنوری شەرعی

جائیز نیە لە بابای (زینا)كەر.. یان (دز).. یان (عارەق خۆر).. یان نمونەی ئەمانە، پارە وەربگیریٚو بەهۆیەوە سنورە شەرعییەكان واز لیٚ بهیٚنریٚن!! ئیتر ئەو پارەیە بۆ -بیت المال-ە، یان بۆ غەیری ئەو وەك یەكە، وە ئەو پارەیەش كە وەردەگیریٚت لەبری تەرككردنی سنورە شەرعییەكان مالیٚكی (سحت) حەڕامو پیسە، جا ئەگەر ئەمیری موسوڵمانان ئەمەی كرد، ئەوە لە یەك كاتدا دوو خراپەی گەورەی لە خۆیدا كۆكردۆیەوە:

یەكەم/ ئەنجام نەدانو بەرپانەكردنی سنورە شەرعییەكان!

دووەم/ خواردنی ماڵی حەڕام (السحت)[1]!!

واتە: هەم فەرزیٚكی چواندووەو، هەم كاریٚكی قەدەغەكراویشی كردووە! وەك پەروەردگار سەبارەت بە جولەكەكان دەفەرمویٚت: (سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ) (المائدە:٤٢) واتە: (زۆر گویٚگری وتەی درۆو باتڵن، وە زۆریش بخۆری ماڵی حەڕامن -إبن مسعود دەفەرمویٚت: (سحت) ڕەشوەیە-)[2] وە بەهەمان پیٚودان لە ئایەتی (٦٣)شدا ئاماژەیان بۆ دەكات، چونكە جولەكەكان هەمیشە ڕەشوەیان دەخوارد ئەوەی كە ئیٚستا پیٚی ئەوتریٚت (البرطیل)، وە جاری واش هەیە ناوی بەخشین -هەدیە-ی لیٚدەنیٚن، جا هەر كات لیٚپرسراو (ڕەشوە)ی خوارد، ئەوە گویٚش لە قسەو شاهیدی درۆش دەگریٚت، (عبداللهی

[1] ماڵی (سحت) بریتییە: لە هار كاسپیو پارەیەك كە پیس بوبیٚت بەهۆی تیٚكەڵاو بوونی غەشەوە، وەك ڕەشوە -بەرتیل- وەك (راغیبی ئەصفهانی) دەفەرمویٚت: (سحت) بەهەڵكەندنی تویٚكڵو ڕیشكی دار دەوتریٚت، جا ئەو وشەیە بەكارهیٚنراوە بۆ ماڵی حەڕام كە بەهۆیەوە خاوەنەكەی توشی عار دەبیٚت، وەك ئەوە وایە: دینو پیاوەتی خۆی هەڵكەندبیٚت، هەر بۆیەش (ڕەشوە - بەرتیل) پیٚی دەوتریٚت (سحت) معجم مفردات ألفاظ القرآن ص٢٣١. وەرگیٚڕ.

[2] تفسیر القرآن العظیم م٢ ص٥٧. وەرگیٚڕ.

کوڕی عومەر)یش -خوای لێ ڕازی بێ- دەفەرموێت: (لعن رسول الله ﷺ الراشي والمرتشي والرائش الذي بينهما) رواه أبوداود والترمذي وإبن ماجة.
واتە: (پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لە ڕەشوە دەرو، ڕەشوە وەرگرو، ئەوەیشی کە لەنێوانیاندایە).
لە صەحیحی (بوخاری‌و موسلیم)دا هاتووە کە: (دوو پیاو کێشەیەکی خۆیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، یەکێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ بە کیتابی خوا حوکم لە نێوانماندا بکە، هاوڕێکەی تری کە لەو تێگەیشتوتر بوو، وتی: بەڵێ بە کیتابی خوا حوکم لە نێوانماندا بکە، بەڵام مۆڵەتیشم پێ بدە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمویَ: ئادەی بڵێ، ئەویش وتی: کوڕەکەی من لە نێو خێزانەکەی ئەم کابرایەدا کرێ گرتە بوە، جا (زینا)ی لەگەڵ ژنەکەیدا کردووە، بەڵام لە بریدا سەد مەڕو خزمەتکارێکی پێداوە، جا من پرسیارم لە چەند پیاوێکی زانا کردووەو ئەوان پێیان وتوم: کوڕەکەی من سەد جەڵدو یەك ساڵ دورخستنەوەی لەسەرە، وە ژنەکەی ئەمیش ڕەجمی لەسەرە.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، دەبێ منیش بە کتێبی خوا حوکمتان لەنێواندا بکەم، سەد مەڕو خزمەتکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ تۆ، وە کوڕەکەشت سەد جەڵدو دورخستنەوەی ساڵێکی لەسەرە، وە ئەی (ئەنەس) بڕۆ بۆ لای ژنی ئەم پیاوەو پرسیاری لێ بکە، جا ئەگەر دانی پێدا نا ئەوە ڕەجمی بکە، ئەنەسیش چوو پرسیاری لە ژنەکە کرد، ژنەکەش دانی پیانا کە زینای کردووە، بۆیە ئەنەسیش ڕەجمی کرد) بوخاری‌و موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە گێڕاویانەتەوە.
ئەم فەرموددیە ئەوەی تیایە: ئەو کابرایەی کە تاوانەکەی کردووەو پاشان ئەو برە پارەیەی داوە بۆ ئەوەی حەددەکەی لەسەر لابچێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە کە پارەکە بگێڕدرێتەوە، وە فەرمانیشی کردووە بە

بەرپاکردنی حەددە شەرعییەکەو نەچووە پارە وەرگیراوەکە بدات بە موجاهیدان‌و هەژاران.

وە زانایان بە گشتی لەسەر ئەوە کۆن کە:

یەکەم/ بەرپا نەکردنی سنوری شەرعی‌و واز لێهێنانی لەبری پارەو پولێك کە وەردەگیرێت جائیز نیە.

دووەم/ وە ئەو پارەیەی کە لە کابرای زیناکەر، یان دز، یان عارەق خۆر، یان رێگر وەردەگیرێت لەبری تەرك کردنی سنورە شەرعییەکەی، پارەیەکی حەرامی پیسە.

جا لە ڕاستیدا ئەو ژیانە تاڵ‌و ئاڵۆزەی کە ئێستا خەڵکی پێوەی گیرۆدەن، زۆربەی هەرە زۆری سوچی تەرککردنی سنورە شەرعییەکانە، ئەویش لەبەر وەرگرتنی پارەو پولێك یان ڕەچاوکردنی ڕێزو حورمەت، بەڕاستی ئەمەش تاکە هۆکاری پشێوی‌و ئاڵۆزی خەڵکی لادێ‌و شارەکانە، وەك: تورکەکان‌و ..کوردەکان[1]و ... دەشتەکییەکان.

وە لەم لایشەوە وەرگرتنی پارە بۆ ئەو جۆرە کارانە هۆی لە دەستدانی ڕێزو حورمەتی لێپرسراویشە، وە کەمبونەوەی وەزنی لەنێو دڵی خەڵکیدا، وە تاکە فاکتەری سوکی‌و دابەزینێتی.

جا ئەگەر لێپرسراوی موسوڵمانان لەبەرامبەر تەرککردنی سنورێکی شەرعییەوە ڕەشۆو بەرتیلی وەرگرت، ئەوە بۆ بەرپاکردنی سنورێکی تریش دەرونی لاواز دەبێت، دەرئەنجام بەو جۆرە ڕەفتارەش وەك جولەکە نەفرەت لێکراوەکانی لێ دێ‌و بەمەرەدی ئەوانیش دەڕوات، ئەم وشەی (بەرتیل)ەش: لە ئەصڵدا لەبەردی درێژەوە هاتووە، بۆیە بەکاریش هێنراوە بۆ ڕەشۆ

---

[1] وا دیارە ئەو سەردەمە کوردەکان وەك تورك‌و عەرەبە دەشتەکییەکان دەستی ڕێگریی‌و جەردەییان هەبووە، ڕەنگە کوردی ناوچەی (إبن تیمیە)ش وابووبن.

وەرگرتن، چونکە هەروەك بەردێك ئەگەر لەنێو دەمی کابرادا دابنرێت ئیتر توانای قسەکردنی نامێنێت، ئاوهاش ڕەشوە وەرگرەکە دەمی لە ئاست وتنی وشەی حەقدا دادەخرێت، وەك لە (اثر)ێکیشدا هاتووە دەڵێ: (إذا دخلت الرشوة من الباب، خرجت الأمانة من الكوة) واتە: (هەرکات ڕەشوە لە دەرگاوە خۆی کرد بە ژوردا، ئەوە ئەمانەت لە تاقەوە دەچێتەدەر).

ئەوەتا دەبینین دەشتەکییە خراپ کارەکان موڵك‌و ماڵ لە خەڵکی دەستێنن‌و داگیری دەکەن‌و، پاشان دێنە لای لێپرسراوو چەند ولاخێکی بەڕەشوە بۆ دێنن‌و ئەویش دەم‌و دەست لێیان دەبورێت، جا ئیتر خەڵکی چۆن تەماعیان بۆ خراپەکاری بەهێز نابێت؟! وە چۆن حورمەتی لێپرسراوێتی‌و سەڵتەنەت ناشکێت‌و سوك نابێت؟! وە چۆن گوزەرانی خەڵکی ئاڵۆز نابێ‌و تێکناچێت؟! یان دەبینی کابرای عارەق خۆر بگیرێت هەندێك پارە دەداو خۆی دەرباز دەکات، باشە ئیتر چۆن عارەق خۆرەکان تەماعیان زۆر نابێ‌و لەسەر عارەق خواردنەوەکەیان بەردەوام نابن؟!

چونکە بەو هیوایەوە عارەق دەخۆنەوە کە ئەگەر گیران بەهەندێك پارە خۆیان ڕزگار دەکەن!! کابرای بەرپرس پارەکە بەحەڕامی وەردەگرێ‌و تێناکەوێ‌و، دەرئەنجام ژیان‌و زیندەگیش هەر بە ئاڵۆزی دەمێنێتەوە!!

وە بەهەمان شێوە ئەوانەی کە خاوەنی ڕێزو هێزن، ئەگەر ببنە بەربەرست بۆ ئەوەی سنورێکی شەرعی لەسەر کەسێك بەرپا نەکرێت، ئەوە خراپە زۆر دەبێ‌و ژیانیش ئاڵۆز دەبێ، بۆ نمونە:

کابرایەك جەریمەیەك ئەنجام بدات‌و پاشان ڕوبکاتە گوندێك‌و لای سەرەك عەشیرەتەکە بمێنێتەوە، ئەویش بەرگری لێ بکاو بیپارێزێت، جا ئەو کەسەی کە داڵدەی دەداو پاراستویەتی، لەو کەسانەیە کە خواو پێغەمبەر ﷺ نەفرەتیان لێکردوە، وەك لە فەرمودەی ئیمام (موسلیم)دا هاتوە، چونکە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبێتی: (تکای هەرکەس ببێتە ڕێگر

لەبەردەم سنورێك لە سنورەكانی خوادا، ئەوە دژایەتی خوای كردووە) رواه أحمد بإسناد صحيح.

ئەی حوكمی ئەو كەسە چۆنە كە بەهێزو بازوی خۆی ڕێگریی لە حەددەكە بكاتو نەیەڵێت ئەنجام بدرێت؟!!

جا بە ڕاستی ئەو پارەیەی كە وەرگیراوە چ بۆ -بيت المال- بێت، یان بۆ گیرفانی لێپرسراو... بە ئاشكرا بێت یان بە پەنهان، وەك یەك وایەو، هەمویشی بە كۆڕا (إجماع)ی زانایان حەڕامە.

وە ئەو پارەیە كە بە ڕەشوە لەبری تەرككردنی سنورێكی شەرعی وەردەگیرێت، وەك ئەو پارەیە وایە كە ئافرەتێكی بەرەڵڵا لەسەر داوێن پیسی وەریدەگرێت!! یان وەك پارەی فاڵچی.. یان پارەی فرۆشتنی سەگ، یان وەك پارەی ئەو كەسە وایە كە بوەتە ئەڵقەی گەیەنەری دوو كەس بۆ كاری بەدو حەڕام، ئەوەش ئێستا پێی دەڵێن: (القواد-گەواد)! پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (ثمن الكلب خبيث، ومهر البغي خبيث، وحلوان الكاهن خبيث) رواه البخاري. واتە: (پارەی فرۆشتنی سەگ پیسە، وە مارەیی ئافرەتی بەرەڵڵا پیسە -واتە: ئەو پارەیەی كە لەسەر بەرەڵڵاییو داوێن پیسی وەریدەگرێ، وە شیرینی فاڵچیش پیسە -واتە: وەرگرتنی پارە لە خەڵك-)!

وە لێپرسراو ئەگەر لەبری وەرگرتنی پارەو پولێك وازی لە جڵەوگیری لەخراپەو بەرپاكردنی سنورە شەرعییەكان هێنا، ئەوە وەك كابرای (گەواد) وایە كە كرێیەك وەردەگرێت بۆ ئەوەی دوو نەفەر بەیەكتر بگەیەنێت بۆ داوێن پیسیو كاری ناپەسەند!! وە حاڵی ئەو لێپرسراوە وەك حاڵی ژنەكەی حەزرەتی (لوط) وایە كە خەڵكی فاجری دەهێنا بۆ ئەوەی كاری خراپو داوێن پیسی لەگەڵ میوانەكانی حەزرەتی (لوط)دا ئەنجام بدەن!! وەك خوای گەورە سەبارەت بەو ئافرەتە دەفەرموێت: (فَأَنجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنْ الْغَابِرِينَ) (الأعراف:٨٣) واتە: (-لوط-و منداڵەكانیمان ڕزگار كرد، تەنها

ژنەکەی نەبێت ڕزگارمان نەکردو لەوانە بو کە لە نێو شارەکەدا مانەوەو تیاچوون)[1].

وە لە شوێنێکی تردا دەربارەی دەفەرموێت: (إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ) (هود:٨١) واتە: (ئەو سزایەی کە دوچاری بێبڕواکانی گەلی (لوط) بوو، بەری ژنەکەشی کەوت)[2].

سەیر دەکەی خوای گەورە وەك چۆن سزای گەلی (لوط)ی دا بەهۆی ڕەفتاری ناپەسەندو نێر بازییەوە، ئاوەهاش سزای خێزانەکەی حەزرەتی (لوط)ی دا بەهۆی ئەوەوە خەڵکی دەهێنایە سەر میوانەکانی (لوط) –علیه السلام–!!

جا بۆیە وەرگرتنی ڕەشوەش بۆ لێپرسراو بەو شێوەیە، چونکە: وەرگرتنی ڕەشوە لە بری تەرککردنی (حەدد)ی شەرعی یارمەتیدانە بۆ گوناهو دەستدرێژی، لەم لاشەوە لێپرسراوی موسوڵمانان بۆیە دانراوە بۆ ئەوەی فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری خراپە بکات، هەر ئەمەش تاکە مەبەستی لێپرسراوێتییە لە ئیسلامدا، جا ئەگەر لێپرسراو بەهۆی پارە وەرگرتنەوە جڵەوگیری خراپە نەکات، ئەوە پێچەوانەی مەبەستی لێپرسراوێتی ئەنجام داوە، ئەو کاتە وەك ئەو کەسەی لێدێت کە داتناوە بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات بۆ دژایەتی دوژمنەکەت، بەڵام ئەو بڕوات بە پێچەوانەوە یارمەتی دوژمنەکەت بدات، یان لە شوێنی ئەو کەسەیە کە پارەیەك وەربگرێت بۆ ئەوەی لە پێناوی خوادا جیهادی پێ بکات، بەڵام بڕوات موسوڵمانانی پێ بکوژێتو بچەوسێنێتەوە.

[1] تفسير القاسمي. م٧ ص٢٠١. وەرگێڕ.

[2] تفسير القاسمي. م٧ ص٢٠١، لە ئیبن کەثیرەوە نەقڵی کردووە. وەرگێڕ.

بۆ زیادە ڕۆشنکردنەوە دەڵێم:

خۆشحاڵی بەندەکانی خوا فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپەیە، چونکە گوزەرانی خۆش بە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خواوەیە ﷺ، دەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەریش ﷺ بە فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە نەبێت دەستەبەر نابێت، وە هەر بەهۆی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەیەوە ئەم ئوممەتە بووەتە چاکترین ئوممەت. وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێت: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ) (آل عمران:١١٠) واتە: (ئێوە چاکترین ئوممەتێکن لەنێو خەڵکیدا، کە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە دەکەن). وە دەفەرموێت: (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ) (آل عمران:١٠٤) (با لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن بانگی خەڵکی بکەن بۆ لای خێر، وە فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لە خراپە بکەن) وە لەشوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ) (التوبة:٧١). واتە: پیاوانی بڕواداری ژنانی بڕوادار هەندێکیان خۆشەویست‌و پاڵپشتی هەندێکی تریانن، وە هەمووشیان فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە دەکەن).

وە خوای گەورە لەمەڕ سەرزەنشتکردنی (بەنو ئیسرائیل)یەکاندا دەفەرموێت: (كَانُوا لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَنْ مُنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ) (المائدة:٧٩). واتە: لەنێو خۆیاندا ئەگەر خراپەیەکیان بکردبا ڕێگرییان لە یەکتر نەدەکرد، بەڕاستی ئەو ڕەفتارەیان شتێکی خراپ بوو).

وە لە فەرمودەی صەحیحیشدا هاتوە کە (ئەبوبەکری صدیق) -خوای لێ ڕازی بێت- لەسەر دوانگەی پێغەمبەر ﷺ وتاریداو فەرمووی: (ئەی خەڵکینە: ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو لە شوێنی خۆیدا داینانێن: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا

عَلَيْكُمْ اَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) (المائدة:١٠٥) وه من له پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووه که فەرمویەتی: خەڵکی ئەگەر خراپەیەکیان بینیو نەیانگۆڕی، ئەوه نزیکه خوای دادگەر لەلایەن خۆیەوه بەگشتی سزایەکیان بۆ بنێرێت!)

وه ئەم بەشەش که باسمان کرد له –حقوق الله– گەورەترین مەبەست تێیدا فەرمان بەچاکەو ڕێگریی له خراپەیە، فەرمان به چاکه، وەك: نوێژ.. زەکات... ڕۆژوو... حەج... ڕاستگۆیی... دەستپاکی... چاکه لەگەڵ دایكو باوك... گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی... وه نمونەی ئەمانه. وه فەرزه لەسەر لێپرسراو هەموو ئەو کەسانەی فەرمانبەریی ئەو دەکەن، دەبێ هەردەم فەرمانیان پێ بکات به ڕاپەڕاندنی نوێژه فەرزەکان بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێکردووه، وه دەبێ سزای ئەوانەش بدات که ئەو نوێژانه دەچوێنێت، جا ئەگەر کۆمەڵێك بوون ئەوه به کۆڕا (إجماع)ی موسوڵمانان دەبێ بکوژرێن، وەك: مارەکردنی ئەو ئافرەتانەی که مەحرەمن، یان خراپەکردنو بڵاوکردنەوەی بەنێو زەویدا، وه هەر کۆمەڵێك یەکێك له یاسا ئاشکراکانی ئیسلام واز لێبێنێو ئیلتیزامی پێوه نەکات، ئەوه واجبه جیهادی دژ بکرێت، هەتاکو دین هەرهەمووی تەنها بۆ خوا بێت، ئەم بنچینەیەش زانایانی ئیسلام یەك دەنگن تێیدا.

بەڵام نوێژنەکەر ئەگەر یەك نەفەر بوو، ئەوه جەماوەری زانایان دەفەرموون: سەرەتا داوای تەوبەی لێدەکرێت، جا ئەگەر تەوبەی کردو دەستی کردەوه به نوێژکردن ئەوه باشه، بەڵام ئەگەر لەسەر نوێژ نەکردن بەردەوام بوو ئەوه دەکوژرێت، ئەمه هەمووی له کاتێکدایه ئەگەر دانی بەواجب بوونی نوێژدا هێنا، بەڵام ئەگەر بڕوای به واجبوونی نوێژ نەبوو، ئەوه به کۆڕا (إجماع)ی زانایان پێی کافر دەبێت.

وە شایەنی باسە: سزادان لەسەر تەرککردنی فەرزەکانو ئەنجامدانی قەدەغەکراوەکان تاکە مەبەستی جیهاد کردنە لە ڕێگەی خوادا، وە ئەمەش لەسەر ئوممەتی ئیسلام واجبە، هەروەك (قورئان)و (سوننەت)ی پێغەمبەریش ﷺ شاهێدی ئەم ڕاستییەن!

جیهادکردنیش لە گەورەترینی کردەوە صاڵحەکانە، چونکە جارێکیان پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ وت: (ئەی پێغەمبەری خواﷺ کردەوەیەکم پیشاندە: وەك جیهاد بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناتوانیت بیکەیت، پیاوەکە وتی: تۆ پێم بڵێ چیە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئەگەر موجاهیدەکە دەرچوو بۆ جیهاد، تۆ دەتوانیت لەو کاتەوە بەڕۆژوو بیو نەیشکێنی، وە نوێژو شەونوێژ بکەیو وازی لێ نەهێنی؟! وتی: دەی کێ تواناى ئەوەی هەیە؟! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: دەی تەنها ئەوە وەك جیهاد کردنە لەڕێگەی خوادا) رواه البخاری. وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إن في الجنة لمائة درجة، بين الدرجة الى الدرجة كما بين السماء والأرض، أعدها الله للمجاهدين في سبيله) رواه البخاري. واتە: (لەنێو بەهەشتدا سەد پلە هەن، نێوان هەر پلەیەکی بۆ ئەویتر وەك نێوانی ئاسمانو زەوی وایە، خوا بۆ موجاهیدانی ڕێگەی خۆی ئامادە کردووە!!) وە خوای پەنهانبین دەفەرموێت: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ)(الحجرات:١٥) واتە: (بڕوادارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە بەخواو پێغەمبەرەکەیو پاشان گومانیان لە بڕواکەیاندا نیە، وە بە دارایيو گیانیان جیهاد لە ڕێگەی خوادا دەکەن، بەڕاستی هەر ئەوانە ڕاستانن)[١].

---

[١] لێکدانەوەو کورتکردنەوەی وشەی (الصادقون) لە (ڕاستگۆیان)دا لێکدانەوەیەکی کرچو کاڵە، چونکە کەسێك لە قسەدا (ڕاست) بێت بەڵام لە هەڵوێستو کردەوەدا (درۆزن) بێت، ئەوە پێی ناوترێت (صادق). کەواتە: لێکدانەوەی وشەی (الصادقون) بەڕاستان قوڵترو ڕاسترە، چونکە (ڕاستان) دەگونجێ لە قسەدا ڕاست بن، هەم لەکردەوەو هەڵوێستدا، شایەنی باسە ئەم لێکدانەوەیەش جەنابی مامۆستا عەلی باپیر ئاماژەی پێکردوە. وەرگێڕ.

وه دەفەرموێت: (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ(١٩)الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَائِزُونَ(٢٠)يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ(٢١)خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ)(التوبة:١٩-٢٢) واته: (ئایا ئێوه ئاودان به حاجییەکانی ماڵی خواو ئاوەدانکردنەوەی (المسجد الحرام)تان داناوه وەکو ئەو کەسەی کە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هێناوەو لەڕێگەی خوادا جیهاد دەکات؟! ئەو دوانە لەلای خوا وەك یەك نین، بەڕاستی خوا ڕێنمایی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردوەو بەدارایی‌و گیانیان لەڕێگەی خوادا جیهادیان کردووه، لەلای خوا گەورەترین پلەیان هەیەو هەر ئەوانەش براوەن، پەروەردگاریان مژدەی ڕەحمەت‌و ڕەزامەندی خۆیان پێدەدات، بەچەند باغ‌و باخچەیەك کە چەندین نیعمەتی ئامادەکراویان تێدایە بۆیان، لەو بەهەشتەشدا بەهەمیشەیی‌و نەبڕاوەیی دەمێننەوە، بەڕاستی خودا پاداشتی گەورەی لایە).

# فەصلی دووەم:

## تۆڵەو سزای ڕێگرو چەتەکان -قطاع الطريق

یەکێکیتر لەوانەی کە پێی دەوترێت: (حقوق الله) سزادانی ڕێگرانە "قطاع الطريق" ئەوانەی کە هەردەم بەچەکەوە ڕێگە بە خەڵکی دەگرن بەمەبەستی داگیرکردنی ماڵەکەیان بە ئاشکرا. خوای تۆڵەستێنیش دەربارەیان دەفەرموێت: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنفَوْا مِنْ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (المائدة:٣٣)

واتە: (ئەوانەی کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن‌و لەنێو زەویدا خراپە بڵاو دەکەنەوە، سزایان تەنها ئەوەیە کە بکوژرێن. یان هەڵبواسرێن، یان لە ڕاست‌و چەپەوە دەست‌و قاچەکانیان بقرتێنرێت، یان لە وڵات دەربکرێن. دوور بخرێنەوە. جا ئەمە هەر لە دنیادا سەرشۆڕی‌و ڕیسواییە بۆیان، وە لە دوا ڕۆژیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە)[1]

---

[1] مختصر ابن كثير م١ ص٥١٠-٥١٣. ئەنەسی کوڕی مالیك -خوای لێ ڕازی بێت- دەگێڕێتەوە کە: کۆمەڵێك لە هۆزی (عضل) هەشت کەس بوون هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وە بەیعەتیان لەسەر ئیسلام پێدا، بەڵام پاش ماوەیەك نەخۆش کەوتن، بۆیە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکە شەکوای خۆیان هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بۆ لەگەڵ ئەم شوانەی ئێمەدا ناچن بۆ لای حوشترەکان‌و لە میزو شیری حوشترەکان بخۆنەوە، وتیان باشە، بۆیە ڕۆشتن‌و لە میزو شیری حوشترەکانیان خواردەوەو باش بوونەوە، بەڵام شوانەکەیان کوشت، ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ ئەویش یەکسەر ناردی بەدوایانداو گرتیانن‌و هێنایانن، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد دەست‌و قاچەکانیان ببڕن‌و چاویان کوێر کردن، پاشان بەو حاڵە فڕێیاندانە بەر خۆرەتاو هەتاکو مردن، ئیمام بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتەوە. مختصر ابن كثير م١ ص٥١٠. وەرگێڕ.

ئیمامی شافیعی له (مسند)ەکەی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە (ابن عباس) سەبارەت بە (ڕێگران) فەرمویەتی: (ئەگەر خەڵك بکوژن‌و ماڵەکەشیان بەرن ئەوە دەکوژرێنەوەو هەڵدەواسرێن‌و وە ئەگەر بیانکوژن‌و ماڵەکەیان نەبەن، ئەوە تەنها دەکوژرێن‌و هەڵناواسرێن، وە ئەگەر ماڵەکەیان دەبردن بەبێ کوشتن ئەوا لە ڕاست‌و چەپەوە دەست‌و قاچیان دەبڕدرێت، وە ئەگەر تەنها ڕێگەیان نائاسایی دەکردو خەڵکیان دەتۆقاند بەڵام ماڵیان لە خەڵك نەدەسەند، ئەوە لە وڵات وەدەردەخرێن، ئەمەش بۆچوونی زۆربەیَ زانایانە وەك (شافعی)و (احمد)و (ابو حنیفه) خوایان لێ ڕازی بێت.

وە هەندێ لە زانایان دەفەرموون: پێشەوای موسوڵمانان دەتوانێت ئیجتیهاد بکات‌و دەربارەیان بۆچوونی خۆی دەرببڕێت، بۆ نموونە: ئەگەر یەکێك لەوانە بەرژەوەندی لەوەدا بوو کە بکوژرێت چونکە سەرکردەیەکی گوێڕایەڵی بۆ کراو بوو لەو تاوانەدا، با بیکوژێت ئیتر ئەگەرچی خەڵکیشی نەدەکوشت، وە ئەگەر بینی یەکێکیان بەرژەوەندی لەوەدایە کە دەست‌و قاچی ببڕدرێت، ئەگەر کەسێکی خاوەن هێز بوو، بۆ ماڵ لە خەڵك زەوتکردن، با ببیڕێت، ئەگەرچی ماڵ لە خەڵکی نەسێنێت.

وە هەندێکیش لە زانایان دەڵێن، ئەگەر تەنها ماڵیش لە خەڵکی بسێنێنن، ئەوە هەر دەبێ بشکوژرێن‌و دەست‌و قاچیان ببڕدرێت، هەڵیش بواسرێن!! بەڵام قسەی یەکەمیان بۆچوونی زۆرینەی زانایانە.

وە ئەو ڕێگرانە کە دەکوژرێن، پێشەوای موسوڵمانان وەك (حەددێك) دەیانکوژێ‌و بەهیچ شێوەیەك نابێت چاو پۆشییان لێبکاو لێیان ببورێت، ئەمەش کۆڕا (اجماع)ی زانایانی لەسەرە.

وە ئەو ڕێگرانەی کە خەڵك دەکوژن، ئیش‌و کاری نادرێت بەدەست کەس‌وکاری کوژراوەکەوە، واتە: ئیمام هەر دەبێت بیانکوژێت، بەپێچەوانەی ئەوەی کە پیاوێك پیاوێکیتر لەبەر دوژمنایەتییەکی نێوانیان بکوژێت، یان

لەبەر ڕقەبەرایەتی، یان هەر هۆیەکی تری تایبەت، ئەوە لەو کاتەدا خوێنەکەی بۆ کەس‌وکاری کوژراوەکەیە، جا ئەگەر پێیان خۆشبوو ئەوە دەیکوژنەوە، یان لێی دەبوورن، وە ئەگەر بشیانەوێت خوێنەکەی وەردەگرن، چونکە لەبەر مەبەستێکی تایبەت کوشتویەتی، بەڵام ڕێگرو چەتەکان، تەنها لەبەر ئەوە دەکوژرێن کە ڕێگە بەخەڵکی دەگرن‌وماڵیان لێ زەوت دەکەن، کەواتە: زەردرو زیانەکەیان گشتییەو بۆ هەموو کۆمەڵگەیە، کوشتنەکەشیان حەددێکی خواییەو لێبوردنی نیە، ئەمەش (شەرعزانان) تێیدا یەك هەڵوێست‌و دەنگن.

بەڵام ئەگەر لە حەلێکدا ئەو ڕێگرانە دەستەیەك بوون، لەو دەستەیەش تەنها یەکێکیان ڕاستەوخۆ قەتلەکەی کردو ئەوانیتر وەك یاریدەرو پاڵ پشتێك بوون بۆی، ئەوە لەو دەمەدا هەندێك لە زانایان دەفەرموون: تەنها ئەوەیان کە ڕاستەوخۆ قەتڵەکەی ئەنجامداوە دەکوژرێت، بەڵام جەماوەری زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەرهەموویان دەکوژرێنەوە ئەگەر چی سەد کەسیش بن، چونکە ئەوەی کە ڕاستەوخۆ قەتلەکەی ئەنجام داوەو ئەوەیشی کە پاڵپشتی بووە، وەك یەك وان‌و هیچ جیاوازییان نیە، هەر ئەمەش لە جێنشینەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کراوە، ئەوەتا (عومەری کوڕی خەتتاب) -خوای لێ ڕازی بێت- تەنانەت چاودێری ڕێگرەکانیشی دەکوشت، واتە: ڕێگرەکان خویان وابوو لەسەر شوێنێك چاودێرێکیان دادەنا تا لەوێوە سەیر بکات‌و بزانێت ئاخۆ کێ دێ‌و کێ نایەت، جا (ئیمامی عومەر) -خوای لێ ڕازی بێت- ئەو چاودێرەشی دەکوشت، وە لەم لایشەوە کابرای (قاتل) تەنها بە هێزو پاڵپشتی یارمەتیدەرەکەی دەتوانێت قەتلەکە ئەنجام بدات!

بەڵام ئەگەر ڕێگرەکان تەنها ماڵیان لە خەڵکی دەسەندو نەیاندەکوشتن، وەك زۆرجار دەشتەکییەکان ئەمە پیشەیانە – ئەوە هەریەکەیان دەستی ڕاستی‌و

قاچی چەپی دەقرتێنرێت، ئەمەش بۆچوونی زۆربەی زانایانە. وەك (ئەبوحەنیفە) و (ئیمامی ئەحمەد)و زانایانی تریش.

ئەمەشیان ماناو لێکدانەوەی ئەم ئایەتەیە: (أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ) (المائدة:٣٣) چونکە دەبێت ئەو دەستەی کە پەلاماری پێداوەو ئەو قاچەشی کەلەسەری ڕۆیشتووە هەردوکیان ببڕدرێتو پاشان دەستو قاچە بڕاوەکەشی بەڕۆنو زەیتی سورەکراو داغ بکرێن، تاخوێنەکەی بوەستێتەوەو سەرنەکێشێت بۆ تیاچوونی هەمووی.

لە ڕاستیشدا ئەم جۆرە سزادانە زۆرجار لە کوشتن سەرزەنشتکەرترو کاریگەرترە، چونکە دەشتەکیو خراپەکارەکان هەر کاتێك لە نێو خۆیاندا بابای دەستو قاچ بڕاو دەبینن، یەکسەر خراپەی ئەو کابرایەیان دێتەوە یادو دەترسن، بە پێچەوانەی کوشتنەوە، چونکە زۆرجار لە یاد دەچێت، تەنانەت زۆرجار هەندێ خەڵك هەیە کوشتن هەڵدەبژێرێت بەسەربڕینی دەستو قاچیدا!! بەڵام ئەگەر ئەو ڕێگرانە تەنها تفەنگیان لە خەڵك ڕادەکێشا، بە جۆرێ نە خەڵکیان دەکوشت نەماڵیشیان لێدەسەندن– واتە: خەڵکیان دەتۆقاند– ئەوە لەو کاتەدا نەفی دەکرێن، نەفی کردنەکەشیان یان ڕاونانیانە، یان بەندکردنیان، یان ئەوەیە هەرچییەك ئەمیری موسوڵمانان خۆی پێی باشتربێت لەوانەی کە ئاماژەیان پێکرا.

کوشتنی شەرعیش: بریتییە لەوەی کە بە شمشێر یان نمونەی ئەو بدرێت لە گەردن، چونکە ئەمەیان ئاسانترینو خۆشترینی جۆرەکانی کوشتنە، تەنانەت لە حەیواناتیش هەرچییەکیان خوای گەورە کوشتنی حەلاڵ کردبێت هەر دەبێت وا سەر ببڕدرێت[1].

---

[1] ئەوە کاتی خۆی کە چەك تەنها شمشێرو ڕمو تیر بووە، بەڵام ئێستا بە فیشەك کە لەسەر بدرێ ئاسانتر دەکوژرێ، بەڵام بۆ سەربڕینی گیاندار ئەوا شتێکی دیکەیە.

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إن الله كتب الإحسان على كل شيء، فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة، وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة، وليحد أحدكم شفرته وليرح ذبيحته) رواه مسلم.

واتە: (بەڕاستی خوا لەبارەی هەموو شتێکەوە چاکەکاریی فەرزکردووە، کەواتە: ئەگەر کوشتتان ئەوە بە جوانی بیکوژن، وە ئەگەر حەیوانتان سەربڕی بەجوانی سەری ببڕن، با هەر یەك لە ئێوە چەقۆکەی تیژ بکاو سەر بڕاوەکەی بحەسێنێتەوە).

سەبارەت بەو هەڵواسینەی کە لە ئایەتەکەدا ئاماژەی پێکراوە: بریتییە لەوەی لەسەر شوێنێکی بڵند هەڵبواسرێن، بۆ ئەوەی خەڵکی بیانبینێ و بناسرێن، شایانی باسە ئەم هەڵواسینەش لەلای (جمهور)ی زانایان لەپاش کوشتنەکەیان دەبێت! وە هەندێکیش لە زانایان دەفەرموون: لە پێشدا هەڵدەواسرێن و پاشان بە هەڵواسراوی دەکوژرێن!

وە هەندێکیش لە زانایان بە جائیزیان داناوە کە بەبێ شمشێریش بکوژرێن، تەنانەت فەرموویانە: بەسەر ئەو شوێنە بڵندەوە وازیان لێ دەهێنرێت، هەتاوەکو خۆیان دەمرن، واتە: بەبێ کوشتن بەسەر ئەو شوێنە بڵندەوە وازیان لێ دەهێنرێت، هەتاوەکو خۆیان دەمرن. واتە: بەبێ کوشتن بۆ ئەوەی زیاتر ناڕەحەت بن!

بەڵام (تمثیل) –دەستکاریکردنی مردوو– لە کوشتندا بەشێوەی تۆڵەکردنەوە نەبێت دروست نیە، چونکە (عمرانی کوڕی حوصەین) –خوای لێ ڕازی بێت– دەفەرموێت: (پێغەمبەری خواﷺ هیچ وتارێکی بۆ نەداوین مەگەر تێیدا فەرمانی پێکردوین بە صەدەقەکردن، وە ڕێگریی (موثلە) (ناشیرینکردنی مردووی لێ نەکردین): تەنانەت ئەگەر کافرەکانیش بکوژین، ئەوە لە پاشدا لاشەکانیان دەستکاریو ناشیرین ناکەین، وە لوتو گوێیان نابڕین، وە

قورگیان هەڵنادڕین، مەگەر ئەوان وا لە مردووەکانی ئێمە بکەن، ئەوە لەو کاتەدا ئەوان چیان کردووە ئێمەش وایان پێدەکەین!

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وازهێنان لە دەستکاریکردنی مردوو هەر باشترە، وەك خوای لێبوردە دەفەرموێت: (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ) (النحل:١٢٦-١٢٧). واتە: (ئەگەر کافرەکان سزایەکیاندان، ئەوە ئێوەش بە گوێرەی ئەو سزایەی کە دراون تۆڵە بکەنەوە، خۆ ئەگەر ئارامیش بگرن ئەوە بۆ ئارامگران چاکترە).

هەندێك لە زانایان دەفەرموون: هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەبوو: کاتێك کە موشریکەکان دەستکاری تەرمی ئیمامی (حەمزە)و شەهیدەکانی تری (ئوحود)یان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەگەر خوای بالادەست سەریخستم بەسەریاندا، ئەوە ئەوان چەندی ئێمەیان دەستکاری کرد ئەوە من دوو ئەوەندەیان دەستکاری دەکەم، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە) ترمذی ڕیوایەتی کردووە.

وە لە صەحیحی ئیمام (مسلم)دا لە (بورەیدە)وە هاتووە کە فەرموویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات ئەمیرێکی بناردایە، وەسیەتی پێدەکرد بە ترسان لە خوا، وەسیەتی پێدەکرد تا بەچاکەو خەیر لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەی لەگەڵیدان بجوڵێتەوە، پاشان دەیفەرموو: بەناوی خواوە لە پێناوی خوادا غەزا بکەن، ئەوەی بێبڕوابوو بە خوا بیکوژن، وە دزی لە غەنیمەتدا مەکەن، وە غەدرو ناپاکی مەکەن، وە دەستکاری کوژراو مەکەنو منداڵ مەکوژن).

وە ڕێگرو چەتەکان ئەگەر لە نێو ماڵدا -نەك دەشتو دەرەوە- دەهاتنە سەر خەڵكو چەکیان لێڕادەکێشان بەمەبەستی ماڵو موڵك لێسەندن، ئەوە هەندێك لە زانایان دەفەرموون: ئەوانە ڕێگرنینو لە شوێنی ئەوانەن کە شت لە خەڵکی

دەشارنەوەو دەیفرێنن، چونکە ئەوەی چونەتە سەری ئەگەر هاوار لە خەڵکی دەرو دراوسێ بکات ئەوە دێن بە هانایەوە.

بەڵام زۆربەی زانایان، وەك (ئیمام مالیكو شافیعیو زۆربەی شوێنکەوتووانی ئیمامی ئەحمەدو هەندێکیش لە شوێنکەوتووانی ئەبوحەنیفە) دەفەرموون: حوکمی ئەو چەتەو جەردانە لە نێو ماڵو دەشتدا یەکێکە، بەڵکو ئەنجامدانی ئەو جۆرە ئیشانە لە نێو ماڵدا زیاتر شایستەی سزا دەبێت وەك لە دەرەوەی ماڵدا، چونکە:

یەکەم: ماڵ هەردەم جێگەی ئارامگرتنو دڵنیاییە، وە خەڵکی تێیدا یەکتر سەردەخەنو دەستبار بۆ یەکتر دەگرن، جا هێرشکردنە سەر خەڵکی زیاتر تێدا ترسناکترو زێدە پیسترە!!

دووەم: چونکە ئەگەر لەنێو ماڵدا بچنە سەری ئەوە دەست بەسەر تەواوی ماڵەکەیدا دەگرنو لێی زەوت دەکەن، بەڵام لە دەشتدا بابای موسافیر زۆرجار چمکێکی ماڵەکەی پێیە، نەك هەمووی!

ئەم بۆچونی دووەمەیان ڕاسترە چونکە (جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن: هەرکەسێك بەمەبەستی پارە لێسەندن شەڕ لەگەڵ خەڵکیدا بکات ئیتر بە هەر کام لە جۆرەکانی جەنگ بێت، ئەوە بە ڕێگر -چەتە- دادەنرێت، هەروەك چۆن کافرێك بەهەرجۆرێك لەگەڵ موسوڵماندا بجەنگێت ئەوە کافرێکی حەربییە، یان موسوڵمانێك ئەگەر بێبڕوایان بکوژێت ئیتر بە شمشێر بێت یان بە ڕم یان تیر یان بەرد یان گالۆك ئەوە جیاوازی نیەو موجاهیدی ڕێگەی خوایە!!

پرسیارێك: ئەگەر کابرای جەردە بە ئاشکرا ڕێگەی بە خەڵکی نەدەگرت بەڵکو بۆ ماڵ لێسەندن بە نهێنی خەڵکی دەکوشت، بۆ وێنە: کەسێك لەسەرە ڕێگەی ڕێبواران دابنیشێت هەرکامیانی بەردەست کەوت بیکوژێتو ماڵەکەی ببات یان بە ناوی ئیشێکەوە یەکێك بباتە ماڵەوەو بیکوژێت پاشان ماڵەکەی ببات،

جا ئەگەر ئەم کوشتنە بەمەبەستی بردنی پارەکە بوو، ئایا وەك ڕێگرەکان وایەو حوکمی ئەوانی هەیە! یان وەك هەموو قەتلێکی تر تۆڵەی خۆی هەیە؟؟!!

وەڵام: (شەرعزانان) دوو قسەیان لەسەر هەیە، یەکەم: بەڵێ، ئەوانەش حوکمیان وەك ڕێگران وایە چونکە قەتلی نهێنی وەك قەتلی ئاشکرا وایەو هەردوکیان مرۆڤ ناتوانێت خۆی لێ قوتار بکات. وەکو زێدە جار قەتلی پەنهان زیانەکەی زۆرترو توندترە، چونکە پیاو پێی نازانێتو لێی بێ ئاگایە.

دووەم: ڕێگر-قاطع الطريق- بریتیە لەوەی بە ئاشکرا خەڵکی دەکوژێت نەك بە پەنهان، بۆیە ئەوەی کە بەنهێنی خەڵك دەکوژێت بۆماڵەکەی دەدرێت بەدەستی خاوەنی کوژراوەکەوە.

بەڵام شایانی باسە بۆچوونی یەکەمیان زیاتر لەگەڵ بنچینەکانی بەرنامەی ئیسلامدا دەگونجێت، چونکە زۆرجار زیانی قەتلی نهێنی زۆرترو توندترە.

## فەصلی سێهەم

## ئەرکی موسوڵمانان لە کاتێکدا ئەگەر ڕێگرەکان خۆیان نەدا بە دەستەوە

ئەمەی کە باسمانکرد سەبارەت بە ڕێگرەکان هەمووی بۆ ئەو دەمەیە کە دەستیان بەسەردا گیرابێت، بەڵام ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان داوایکردو گەڕا بە دوایاندا بۆ ئەوەی (حەددە) شەرعییەکەیان بەسەردا بەرپا بکاتو ئەوانیش خۆیان نەدا بە دەستەوە، بەرگرییان کرد ئەوە لەو دەمەدا زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە لەسەر موسوڵمانان (واجب) دەبێت شەڕیان لەگەڵدا بکەن، بەڵکو دوا بەیەکیان دەستیان بەسەردا بگیرێت.

بەڵام ئەگەر لە حالێکدا خۆیان نەدا بە دەستەوە مەگەر بەشێوەیەکی وا کە سەری ئەکێشا بۆ کوشتنی هەموویان، ئەوا هەموویان دەبێ بکوژرێن، ئیتر هەموویان (قاتل) بن یان نا، وەك یەك وایە، وە هەر کەسێکیش بەرگریان لێ بکاتو بیانپارێزێ ئەوە ئەویش دەکوژرێ، چونکە لەو کاتەدا کوشتنی خۆیان بەرپاکردنی (حەدد)ەو کوشتنی یاریدەدەرانیشیان جەنگ لە دژکردنیانە، وە ئەوانەی کە یاخی دەبنو پەنا دەبەنە بەر قەلایەك یان سەر شاخێك یان ناو دۆڵو ئەشکەوتو هەر کەسێك بەلایاندا تێپەڕ بکات ڕێگەی پێدەگرنو ئەگەر ئەمیریش بنێرێت بە دوایانداو داوایان لێ بکات کە بێنە ژێر گوێڕایەڵی موسوڵمانانو بۆ ئەوەی (حەدد)ەکەیان بەسەردا بەرپا بکات، دەمو دەست بەرگری لە خۆیان دەکەنو دێنە شەڕ، ئەوا لەو کاتەدا دەبێ شەڕیان لە دژ بەرپا بکرێو بکوژرێن، بەڵام ئەگەر (کافر) نەبوون، ئەوا کوشتنو شەڕکردن لەگەڵیاندا وەك شەڕی (کافران) نیە، بۆیە سەروەتو سامانەکەیان لێ ناسەندرێت، مەگەر ئەوانەی سەروەتو سامانیان بەشێوەیەکی ناحەق لە خەڵکی سەندبێت، جا ئەگەر وابوو ئەوە لە ئەستۆیاندایەو ئەو ئەندازەیەی کە لە خەڵکیان زەوت کردووە لێیان دەسەندرێتەوە، پاشان دەگەڕێندرێتەوە

بۆ خاوەنەکانیان، جا ئەگەر خاوەنی ڕەسمی پارەکانیش نەناسرانەوە. نەدەتوانرا بگێڕدرێتەوە بۆیان ئەوە ئەو پارەیە بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفدەکرێت.

وەك ڕزق و ڕۆزی ئەو موجاهیدانەی کە دەچن لە دژیان دەجەنگن!

بەڵام ئەوەی شایستەی باسە: مەبەست بە شەڕکردن لەگەڵیاندا گرتن و دەست بەسەردا گرتنیانە تا (حەددە) شەرعییەکەیان بەسەردا بەرپا بکرێت، وەك خراپەکاری قوتار بکرێن، بۆیە ئەگەر یەکێکیان گەوزاو بە توندی بریندارکرا، ئەوە نابێت فەراموش بکرێت تاکو دەمرێت، مەگەر هەر بۆ خۆی کوشتنی (واجب) بوبێت، وە ئەگەر یەکێکیان ڕایکردو لە شەڕی دڵنیا بووین ئەوە بە دووی ناکەوین تا بیگرین، مەگەر لە حەلێکدا (حەدد)ێکی بەسەرەوە بێت، یان لە دواڕۆژی بترسین! وە هەر یەکێکیشیان لێ ئەسیر بکرێت ئەوە (حەدد)ی بەسەردا بەرپا دەکرێت.

وە هەندێك لە (شەرعزانان) یەکجار توندی کردۆتەوە لێیان، تەنانەت پێیان وایە دەبێت سەروەت و سامانیشیان بکرێتە غەنیمەت، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: سەروەت و سامانیان ناکرێتە غەنیمەت.

جا ئەو ڕێگرو چەتانە ئەگەر هاتوو چونە لای کۆمەڵێکی دەرچوو لە بەرنامەی ئیسلام و لە دژی موسوڵمانان پشتگیرییان کردن، ئەوە لەو دەمەدا وەك وان شەڕیان لەگەڵ دەکرێت و لەهەموو شتێکیشدا حیسابی ئەوانیان بۆ دەکرێت، ئەوانەش کە (باج) لەسەر ڕێبوارو... وڵاخ و.. بار و... ئەو جۆرە شتانەی تردا دەنێن، ئەوە پێیان ناوترێت ڕێگر (قاطع الطريق) بەڵکو ئەوانە گومرگ وەرگرەکانن و لە دونیادا تۆڵەی تایبەتی خۆیان بۆ دانراوەو لە ڕۆژی دوایشدا توندترین سزایان هەیە، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەو ئافرەتەی کە زینای کردبوو لە پاشدا (حەدد)ی لێدرا فەرمووی: (لقد تابت توبة لو تابها صاحب مكس، لغفر له) رواه مسلم.

واتە: (ئەو نافرەتە تەوبەیەکی کردووە ئەگەر خاوەنی گومرگیش -گومرگ وەرگر- ئەو تەوبەیە بکات، ئەوە خوا لێی دەبورێت)[1].

وە لێپرسراوی موسوڵمانان ئەگەر دەستی بەسەر رێگرەکاندا گرتو بینی وا پارەو سەرڕەتیان لە خەڵکی سەندووە، ئەوە لەسەری فەرزە پارەو سامانەکەیان لێ بسێنێتەوەو پاشان بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، وە لەم لایشەوە دەبێ (حەدد)ەکەش بەسەر جەستەیاندا جێبەجێ بکات.

جا ئەگەر دەرکەوت کە پارەیان لە خەڵکی سەندووەو کەچی بەرگریان دەکردو پارەکەیان نەدەگێڕایەوە، ئەوە دەبێ لێپرسراو تێیان هەڵداو بەندیان بکات، هەتاکو یان بیهێننەوە یان بڵێن لە فلان شوێندایە، چونکە سەیردەکەی خوای گەورە لە (قورئان)ی پیرۆزدا بۆ مێردی حەڵاڵ کردووە کە ئەگەر خێزانەکەی سەرپێچی ئەوی دەکرد لێی بدات هەتاکو بیگێڕێتەوە بۆ ژێر ئیتاعەی خۆی، جا ئەوانەش کە سامانی خەڵکی دەبەنو پاشان نایگێڕنەوەو حاشای لێدەکەن ئەوە حەوت جار حەوت جار شایستەترن بە سزادان، وە ئەگەر خاوەن ماڵ بیەوێتو پێی خۆش بێت دەتوانێت پارەکەیان پێشکەش بکات، یان (صوڵح)یان لەگەڵدا بکات، یان لێیان ببورێت، بەڵام بەپێچەوانەی بەرپاکردنی سنورە شەرعیەکەوە، بەڵکو هیچ بیانوو رێگەیەك بۆ لێخۆشبونو

[1] خوێنەری خۆشەویست وەرگرتنی گومرگ گومان لە حەرامبوونی نیەو گومان لەوەدا نیە کە گومرگ لەگەڵ عەدلی ئیسلامدا ناگونجێت، بەلام وەرگرتن بۆ حاڵەتی ناچاری (ضرورة) ئەوە زۆر لە زانایان باسیان کردووەو هەندێکیان لەبەر ناچاری رێگەیان پێدراوە، بەڵام بەندە حەز ناکەم ئەو باسە زۆر بەدرێژی لەسەری برۆمو توێژینەوەی لەسەر بکەم چونکە ئێرە شوێنی نیە.
بەڵام زۆر بە پێویستی دەزانم کە خوێنەر بەرێز حەواڵەی بەرگی دووەمی کتێبەکەی مامۆستا عەلی باپیر بکەم کە تێیدا زۆر بە جوانی باسی (باج) و (گومرگ) کراوەو ئەندازەی (٣٠) لاپەڕەی لەسەر رۆیشتووەو چاك تەتەڵەی کردووە. (موسڵمانی کامڵ-بەشی دووەم- بەرگی دووەم/ لا ١٧٤ بۆ ٢٢٠) وەرگێڕ

ئازادکردنی لەو نیە!! وە لە حەلێکدا ئەو سەروەت و سامانەی کە لە خەڵکییان سەندووە ئەگەر لایان نەمابوو، بەڵکو فەوتاندبوویان و خواردبوویان، ئەوا زانایان چەند ڕایەکیان هەیە:

ڕای یەکەم: دەڵێن: ئەو ماڵە هەر لە ئەستۆیاندایەو دەبێ بیبژێرن و بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی بەڵام ئەگەر لە دەستیاندا نەبوو ئەوە کاتێک دەوڵەمەند بوون و توانایان پەیدا کرد هەر لە ئەستۆیاندا دەمێنێت، ئەمەش بۆچونی (شافیعی)و (ئەحمەد)ە.

ڕای دووەم: دەڵێن: بژاردنی پارەکەو بڕینی دەست و قاچی لە یەک کاتدا کۆنابێتەوە- واتە: ماڵ و سەروەتەکەیان لێ ناسەندرێتەوە بەڵکو تەنها (حەدد)ەکەیان لێدەدرێت، ئەمەش بۆچونی (ئەبو حەنیفە)یە.

ڕای سێهەم: تەنها لەکاتی دەوڵەمەندی و دەست ڕۆشتندا لە ئەستۆیاندایە، دەبێ بیبژێرن، نەک لە وەختی نەبونیدا. ئەمەش بۆچوونی (مالك)ە.

# حوكمی وەرگرتنی پارە لە خاوەن ماڵەكە

لێپرسراوی موسوڵمانان بۆی حەڵاڵ نیە پارە وەربگرێت لە خاوەن ماڵەكان لەبری ئەوەی دەنێرێت بە دوای ڕێگرانداو (حەدد)یان بەسەردا بەرپا دەكاتو پارەو سەرودتی خەڵكیان لێ دەسێنێتەوە، ئەو پارەیە نە بۆ خۆیی‌و نە بۆ ئەو موجاهیدانەی دەیاننێرێت حەڵاڵ نیە، بەڵكو ناردنی بە شوێن ئەو ڕێگرانەدا یەكێكە لە جۆرەكانی جیهاد كردن لە ڕێگەی خوادا، بۆیە دەبێت چۆن لە (بیت المال) پارە بۆ غەزاكانی تر سەرف دەكات، ئاوەهاش بۆ ئەو كارانە لە (بیت المال)ەوە پارە سەرف بكات.

وە پێشەوای موسوڵمانان جائیز نیە كۆمەڵێك بنێرێ بە دوای ڕێگرەكاندا كە لاوازبن‌و توانای ڕووبەڕووبونەوەیان نەبێت، یان پارە لە ڕێبواران بسێنن، بەڵكو دەبێ هەردەم ئەوانە هەڵبژێرێتو بیاننێرێت كە هەم بە هێزو هەم دەستپاك‌و ئەمینیشن، مەگەر لە حەلێكدا كەسیتر دەست نەكەوێت، ئەوە لەو دەمەدا با چاكترین تا چاكتر بنێرێت.

وە هەر كەسێك پەنای ڕێگرێك یان دزێك، یان بكوژێك، یان كەسێك كە حەددێكی شەرعی لەسەرە، بداتو بەرگری لێ بكاتو نەهێڵێت سنورەكەیان بەسەردا بەرپا بكرێت، ئەوە لەو گوناهو تاوانەیاندا هامرای ئەوانە خواو پێغەمبەر ﷺ نەفرەتیان لێ كردووە، وەك ئیمام (مسلم) لە (ئیمامی عەلی)ـەوە -خوای لێ ڕازی بێت- دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لعن الله من أحدث حدثا أو آوى محدثا) واتە: خوا نەفرەتی لەوە كردووە كە كەتنێك دەكات، یان پەنای كەتنكەرێك دەدات).

وە ئەگەر ماڵێك، یان بابایەك، موسوڵمانان بەشێوەیەكی حەق دەگەڕان بەدویداو، كابرایەكیش شوێنەكەیانی دەزانی، ئەوە (واجب)ە لەسەر ئاشكرای بكاتو موسوڵمانانی لێ ئاگادار بكاتەوە، وە بەهیچ شێوەیەك بۆی

جائیز نیە بیشارێتەوە، چونکە ئەمە وەك یارمەتیدانە لەسەر چاکەو پارێزکاریی، بێگومان ئەمەش (واجبە)، بەڵام ئەگەر ئەو ماڵە یان ئەو بابایە بەشێوەیەکی (باطل) داوای دەکرا، ئەوە بۆی حەڵاڵ نیە خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە، بەڵکو واجبە بەرگری لێبکاو هەردەم خەڵکیشی لێ دوور بخاتەوە، چونکە یارمەتیدان‌و پشتگیریکردنی ستەم لێکراو (واجب)ە، ئەوەتا لە صەحیحی (بوخاری‌و مسلم)دا هاتووە (ئەنەسی کوڕی مالیك) خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺفەرمووی: (انصر أخاك ظالما أو مظلوما، قلت: یا رسول الله، انصره مظلوما، فکیف انصره ظالما؟! قال: تمنعه من الظلم فذالك نصرك إیاه) واتە: براکەت ستەمکار بێت یان ستەملێکراو تۆ سەری بخە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا کە ستەمی لێکرا سەری دەخەم، بەڵام چۆن لە کاتێکدا ستەمی کردووە یارمەتی بدەم؟! فەرمووی: ڕێگەی لێ بگرەو مەهێڵە ئەو ستەمە بکات، ئەوە سەرخستنی تۆیە بۆ ئەو)

وە هەر کەسێك یەکێك پەنای بۆ هێنا، ئەگەر ئەوەی پەناکەی هێناوە ستەملێکراو بوو ئەوە تەنها ئەوەی لەسەر کە یارمەتی بداو سەری بخات، بەڵام ئەگەر ستەملێکراو نەبوو ئەوە بۆی نیە یارمەتی بدات، وە تەنها بە قسەی خۆیشی جێگیر نابێت کە ستەملێکراوە، چونکە زۆرجار ئەوەی کە هاوار دەکات‌و شکاتی لێ بەرز دەبێتەوە دەبینی لە دوای لێکۆڵینەوە بە ستەمکار دەردەچێت.

بەڵام ئەگەر هەردولا ستەمکار بوون، یان هیچ کامیان ستەمکار نەبوون، بەڵکو تەنها خراپ حاڵی بونێك بوو لە نێوانیاندا، ئەوە لەو کاتەدا دەبێت (صوڵح) بکرێت لە نێوانیاندا، وەك خوای دادگەر دەفەرموێت: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ

اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(٩)إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) (الحجرات:٩-١٠). واته: (ئەگەر دوو کۆمەڵ لە بڕاداران لە نێو خۆیاندا بەشەڕهاتن، ئەوە چاکسازی لە نێوانیاندا بکەن، جا ئەگەر یەکێکیان دەستدرێژی زیاتری کردە سەر ئەوی تریان‌و ملی نەدا بۆ بەرنامەی خوا، ئەوە شەڕ لەگەڵ ئەو لایەنەدا بکەن کە لادەدات، هەتاکو بگەڕێتەوە بۆ لای فەرمانی خوا، جا ئەگەر گەڕایەوە ئەوە بەشێوەیەکی دروست‌و ڕاست چاکسازی لەنێوانیاندا بکەن‌و لە چاکسازییەکەشدا دادپەروەر بن، بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ، تەنها بڕواداران براو خوشکی ڕاستەقینەی یەکترن، جا چاکسازی بخەنە نێوان براکانتانەوە، وە لە خوا بترسن‌و پارێز بکەن، بەڵکو خوا ڕەحمتان پێ بکات).

وە ئەبوداود لە (سونەن)ەکەی خۆیدا لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە جارێکیان بە پێغەمبەری خوا وترا: ئایا ئەگەر پیاوێك گەلەکەی خۆی لە حەقدا سەربخات ئەوە دەمارگیرییە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نەخێر، بەڵام دەمارگیری ئەوەیە کە پیاوێك گەلەکەی خۆی لە شتێکی "باطل"دا سەر بخات) ئەبو داود گێڕاویەتیەوە. وە لە شوێنێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (چاکترینتان ئەوەیە کە بەرگری لە گەلەکەی خۆی دەکات، ئەگەر گوناهو تاوان نەکات) ئەبوداود گێڕاویەتیەوە. هەر شتێك لە بەرنامەی ئیسلام‌و قورئان دەرچێت بۆ شتێکیتر، ئیتر نەسەب بێت یان وڵات، یان (جنس) ڕەگەز یان ڕێڕەو یان بەرنامەو ڕێچکە ئەوە پێی دەوترێت (جاهلیەت) تەنانەت جارێکیان کۆچەرییەك‌و یاریدەدەرێك هەڵشاخان‌و لەیەکتری توڕەبون لەو کاتەدا پیاوە کۆچەرییەکە وتی: هاوار ئەی کۆچەرییەکان، یاریدەدەرەکەش وتی: هاوار ئەی یاریدەدەرەکان، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئایا ئێوە بانگەوازی نەفامی بەرز دەکەنەوە لە کاتێکدا منیش لەناوتاندام؟ وە زۆر بە توندی توڕەبوو!!!

# فەصلی چوارەم

## ( حەددی دزیکردن – السرقة )

بابای (دز) بەبەڵگەی (قورئان)و (سوننەت)و (ئیجماع) واجبە دەستی ببڕدرێت ئەوەتا خوای زاناو توانا فەرمویەتی: (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنْ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ(٣٨)فَمَنْ تَابَ مِنْ بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (المائدة:٣٨-٣٩).

واتە: پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن، ئەو دەست بڕینەشیان سزای تاوانی خۆیانە، وە تۆ لەو سزایە کە بەهۆیەوە هەم خۆیان واز بهێننو هەم ببیتە پەندو ئامۆژگاری بۆ خەڵکانی دیکەش، بەڕاستی خوا خاوەنی کاری بەجێیە، بەڵام هەرکەس لە دوای ئەنجامدانی کردەوەی خراپ تۆبە بکاتو بگەڕێتەوەو خۆی چاك بکات ئەوا خوداش تەوبەکەی لێ وەردەگرێت بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە.

وە هەرکات کابرای دز دەرکەوتو جێگیر بوو کە دزی کردووە ئیتر بە دان پێهێنانی خۆی بێ یان بە شایەت لەسەری ئەوە بەهیچ شێوەیەك دواخستنی (حەدد) لێدانەکەی جائیز نیە، نە بە (سجن)کردنیو نە پارەو پولێك کە بیدات بۆ دواخستنی، بەڵکو دەبێت لە گرنگترین کاتدا دەستی ببڕدرێت، چونکە (ئیقامە)ی سنوری شەرعی لە بەندایەتی کردنە بۆ خواو وەك جیهاد کردنە لە ڕێگەی خوادا.

وە پێویستە بزانرێت، بەرپاکردنی (حەدد)ە شەرعییەکان ڕەحمەتێکی خواییە بۆ گشت مرۆڤایەتی، کەواتە لێپرسراوی موسوڵمانان دەبێ لەبەرپاکردنیدا زۆر زرنگ بێو لە دینی خوادا بە قەد نوکە دەرزییەك نەرمی نەیگرێو وازی لێبێنێت، وە دەبێت لەبەرپاکردنیدا مەبەستی ڕەحمەت بێت بۆ خەڵکی بە دوور خستنەوەیان لە خراپەکاری، نەك شیفای ڕقو کینی خۆیو

خۆبەرزکردنەوە بەسەر خەڵکیدا، هەروەك باوکێك ئەگەر بیەوێت ئادابی منداڵەکەی بدات، جا ئەگەر ئەو باوکە واز لە ئەدەب دادانی منداڵەکەی بێنێ- هەروەك چۆن دایك بەهۆی ڕەحمو سۆزییەوە وای پێباشە- ئەوە زیانی بۆ منداڵەکەی دەبێ‌و منداڵەکەی خراپ دەبێت، جا مەبەستی باوك لە منداڵەکەیدا چاککردنێتی، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئاواتەو پێی خۆشە منداڵەکەی پێویستی بە ئامۆژگاری نەبێت!! یان وەك دکتۆرێك کە دەرمانێکی تاڵو ناڕەزا بە نەخۆشەکەی دەدات بەڵام مەبەستیشی (شیفا)یە نەك (سزا) یان هەر ناخۆشییەکی دیکە کە دوچاری مرۆڤ دەبێ‌و دەرەنجام بەرهەمەکەی ئاسودەبونیەتی!!

جا سنورە شەرعیەکانیش هەر بۆ ئەم مەبەستە دانراون، وە دەبێ بابای لێپرسراویش لە بەرپاکردنیدا مەبەستی هەمان شت بێت، چونکە لێپرسراو ئەگەر هاتوو مەبەستی چاکسازیکردنی ژێر دەستەکانی بێ‌و هەروەها بەرگریکردنیان لە خراپەکاری، ئەویش بۆ وەدەستخستنی سود بۆیان‌و دورخستنەوەی زیان لێیان...

وە لە تێکڕای ئەو کارانەشدا مەبەستی ڕازیکردنی خوای گەورەو ڕاپەڕاندنی فەرمانەکانی ئەو بێت، ئەوە خوای دادگەر دڵی خەڵکی بۆ نەرم دەکاتو هەموو ڕێگاکانی خێری بۆ مەیسەر دەکات، وە لە سزای کۆمەڵگەو مرۆڤایەتی قوتاری دەکات، بۆیە دەبینی زۆرجار بابای (حەدد) لێدراو خۆشحاڵو ڕەزامەندە!!

بەڵام بەپێچەوانەوە، ئەگەر لە بەرپاکردنی سنورە شەرعییەکاندا مەبەستی خۆ بەرز کرنەوەو هێزو سەڵتەنەتی خۆبێت، خەڵکی بەگەورەی بگرن‌و لێی بترسین، یان پارەو سامانی بدەنێ، ئەوە مەبەستەکانی لەسەری پێچەوانە دەبنەوەو ئاواتی نایەتەدی!!

دەگێڕنەوە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) -خوا لێی خۆش بێت- پێش بوونی بە خەلیفە، والی (وەلیدی کوڕی عبدالملك) دەبێ لە شاری مەدینە، جا ئەو کەڵەپیاوە بەشێوەیەکی زۆرباش ئیشەکەیان بەڕێوە دەبات، جارێکیان (حەجاجی کوڕی یوسف) لە عێراقەوە دێت بۆ مەدینەو سەبارەت بە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) پرسیار لە ئەهلی مەدینە دەکاتو دەڵێ: سامو هەیبەتی لەناوتاندا چۆنە؟

ئەوانیش دەڵێن: ئەوەندە هەیبەتی هەیە ناتوانین بە تەواوی سەیری بکەین، ئەویش دەڵێت: ئەی خۆشەویستیتان چۆنە بۆی؟

دەڵێن: لای ئێمە لە منداڵەکانمان خۆشەویستترە، ئەویش دەڵێت/ ئەی ئەدەبی لەناوتاندا چۆنە؟

دەڵێن: گەلێ گەلێ زۆرە، ئەویش دەڵێ ئەمە هەیبەتی بێتو ئەوەندەش خۆشەویست بێت، کەچی ئەوەش ئەدەبی بێت. بەڕاستی ئەمە کارێکی خوایی و جارێکی خواییە!!

وە پاش ئەوەی دەستی دزەکە بڕدرا دەبێ بە زەیت داخ بکرێت، تا خوێنەکەی نەڕوات. وە سوننەتیش وایە ببەسترێت لە ملیەوە، جا ئەگەر بۆ دووەم جار دزی کردەوە ئەوە قاچی چەپی دەبڕدرێت، وە ئەگەر بۆ سێهەم جارو چوارەم جار دزیکرد، ئەوە دوو قسەی لەسەرە:

یەکەمیان: لە جاری سێهەمو چوارەمدا دەستی چەپی و قاچی ڕاستی دەبڕدرێت، ئەمەش بۆچوونی ئەبوبەکری صدیقە -خوا لێی ڕازی بێت- وە ڕێڕەوی شافعی و ئەحمەدیش لە وتەیەکدا لەسەر ئەمەیە.

دووەمیان: لە جاری سێهەمو چوارەمدا بەند دەکرێت ئەمەش بۆچوونی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە -خوای لێ ڕازی بێت- وە کوفییەکانو (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)یش لە وتەیەکی تردا لەسەر ئەو ڕایەن.

# مەرجەكانی بڕینی دەستی دز

یەكەم مەرجی بڕینی دەستی دز ئەوەیە دەبێت ئەوەندە دزی بكات كە لەسەری دەستی ببڕدرێت، ئەو ئەندازەیەش لەلای (جمهور)ی زانایان، وەك: (شافعی)و (مالك)و (احمد) -خوا لێیان خۆش بێت- بریتیە لە (چارەكە دینارێكی ئاڵتوون، یان سێ درهەمی زیوو[1]).

جا هەر كەس ئەو ئەندازەیە دزی بكات، ئەوە بە (ئیتفاق)ی زانایان دەستی دەبڕدرێت، بەپێی ئەم بەڵگانە:

١. لە صەحیحی (بوخاری‌و مسلم)دا هاتووە (عبدالله ی كوڕی عومەر) - خوای لێ ڕازی بێت- دەفەرموێت: (ان رسول الله ﷺ قطع في مجن ثمنة ثلاثه دراهيم) وفي لفظ لمسلم (قطع سارقا في مجن قيمته ثلاثه دراهيم) واتە: (پێغەمبەر ﷺ دەستی دزی بڕیوە لە دزینی قەڵغانێكدا كە بەسێ درهەمی زیو بوو) لە ڕیوایەتی موسلمدا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی دزێكی بڕی قەڵغانێكی دزیبوو بایی سێ درهەم بوو).

٢. لە صەحیحی (بوخاری‌و مسلم)دا هاتووە كە (عائیشە) -خوای لێ ڕازی بێت- دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (تقطع اليد في ربع دينار فصاعدا) وفي رواية لمسلم (لا تقطع يد السارق إلا في ربع دينار فصاعدا) (دەستی دز لە دزینی چارەكە دینارێكی (زێڕ) بەرەو ژوور دەبڕدرێت) لە ڕیوایەتی (موسلم)دا هاتووە كە (دەستی دز نابڕدرێت، مەگەر لە دزینی چارەكە دینارێكی (زێڕ) بەرەو ژوور.

٣. لە صەحیحی (بوخاری)دا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دەستی دز لە دزینی چارەكە دینارێكی زێڕدا ببڕن، بەڵام ئەگەر لەو ئەندازەیە كەمتر

---

[1] كفاية الأخيار م٢ ص١١٦-١١٧، وەرگێڕ.

بوو، ئەوە لەسەری دەستی دز مەبڕن) چارەکە دینارێکی زێڕ لەو ڕۆژەدا سێ درهەمی زیو بووە، دینارێکی زێڕیش دوازدە درهەمی زیو بووە.

وە (دز) دەستی نابڕدرێت هەتاکو ئەو ماڵەی کە دەیدزێت دەبێت لە جێگای هەڵگرتنی (عادە)تی خۆیدا بێت، بۆیە ئەو ماڵەی کە لە دەست خاوەنەکەی فەوتاوە، یان بەروبوومی ئەو بێستانەی کە لە دەرودەشتدایەو پەرژینی نیە، یان حەیوانێك کە بەبێ شوان بەرەڵا کراوە، ئەوە ئەگەر بابایەك ئەمانە بدزێت، دەستی نابڕدرێت، بەڵکو سەرزەنشت دەکرێتو قەرزو بژاردنەکەشی بەسەرەوە چەندانە دەکرێت، هەروەك فەرمودەی پێغەمبەریش ﷺ لەم بارەوە هاتووە، ئەوەتا (عومەری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە، ئەویش لە باپیرییەوە دەفەرموێت: جارێکیان گوێم لە پیاوێك بوو پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ دەکردو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووم تا سەبارەت بە وشتری ون بوو پرسیارت لێ بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێڵاوو ئاوی خۆی پێیەو لەدرەخت دەخواو، وازی لێبێنە هەتاکو دەگاتە خاوەنەکەی خۆی پاشان پیاوەکە وتی: ئەی بزنو مەڕی ون بوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ یان بۆ براکەت یان بۆ گورگە، پاشان پیاوەکە وتی: ئەی ئەو مەڕەی کە بە شەو لە لەوەڕگاکەی خۆی دادەبڕێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەوەدا دەبێ سزابدرێو دوو ئەوەندەی نرخەکەی خۆی بدرێتەوە، وە هەر حەیوانێکیش ئەگەر لە پەچەکەی خۆی دابڕێت، ئەگەر گەیشتە نرخی قەڵغانێك ئەوە دەستبڕینی لەسەرە، پاشان پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بەروبومو ئەوەی کە لە نێو قۆزاخەکەدا دەبڕێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: لەبەروبومدا هەرچییەك بیخوات بەڵام چاکی پڕ نەکات بۆ ماڵەوە، ئەوە هیچی لەسەر نیە، بەڵام هەرکەس لێی هەڵگرێت ئەوە دوو ئەوەندەی نرخەکە سزادانیشی لەسەرە، وە ئەگەر بەروبومەکە برایە جێگای خۆیو دزرا، ئەوە لەو کاتەدا دەستبڕنی لەسەرە، ئەویش ئەگەر هاتو دزراوەکە گەیشتە نرخی

قەڵغانێك، بەڵام ئەوەی کە ناگاتە نرخی قەڵغانێك ئەوە دەبێت دوو ئەندازەی نرخەکەی ببژێرێت و پاشان سزاش دەدرێت) رواه اهل السنن.

(خوێنەری خۆشەویست (شێخی ئیسلام ابن تیمیه) –خوا لێی خۆش بێت– ئەم باسەشی بەکورتی هێناوە، جا بە پشتیوانی خوای کاربەجێ، من چەند خاڵێك دەخەمە سەری بەهیوای زیاترو چاکتر حاڵیبوون:

خاڵی یەکەم: لە باسی (مەرجەکانی بڕینی دەستی دز)دا (شێخی ئیسلام) تەنها ئاماژەی بۆ دوو مەرج کردووە، بەڵام زانایان دەفەرموون: دەبێت چەند مەرجێکی دیکە هەبێت، کە ئەمانەن:

١. دەبێ دزەکە باڵغ بێت، واتە: تەمەنی گەیشتبێتە (پانزە) ساڵ.

٢. دەبێت (عاقڵ) بێت، واتە: شێت نەبێت.

بەڵگەش لەسەر بەمەرج گرتنی ئەم دوو خاڵە، ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێت: (رفع القلم عن ثلاثة، عن النائم حتى يستيقض، وعن الصبي حتى يحتلم، وعن المجنون حتى يعقل) فەرمودەیەکی صەحیحەو ئەبوداودو نەسائیو ئبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە.

٣. دەبێ (دزە)کە بە ئارەزووی خۆی دزیەکە بکات، نەك زۆر لێکراو (مکره) بێت، بەڵگەش ئەم فەرمودەیە: –ابن عباس– خوای لێ ڕازی بێت– دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوای بەرز لەمانەدا لە (ئوممەت)ەکەم دەبورێت، نەزانیو... لەبیرچوونو.... ئەوەش کە زۆر لێکراوە بۆ کارێکی خراپ) حاکمو ابن حبان ڕیوایەتیان کردووەو فەرمودەیەکی (صحیح)ە.

٤. دەبێت ئەو ماڵەی کە ئەیدزێت موڵکی خۆی نەبێت، وە (شوبهە)ش نەبێ کە بەشی ئەمی تێدایە.[1]

---

[1] فقه السنة م٢ ص٤١٣.وەرگێر.

خاڵی دووەم: ئەگەر کەسێك شتێکی بەخواستن (العاریە)برد، پاشان ئینکاری لێ دەکردو دەیوت: نەمبردووە، ئایا ئەوە (دزە)و حەددی لێ دەدرێ یان نا؟

وەڵام: زانایان تێیدا جیاوازن، (جمهوری)ی زانایان دەفەرموون: دەستی نابڕدرێت چونکە (قورئانو سوننەت) تەنها لەسەر (دز) دەست برینیان فەرزکردووە.

دەی ئەو کەسەی شت بە خواستن دەباتو پاشان -حاشای لێ دەکات- ئەوە پێی ناوترێت (دز) بەڵام ئیمام ئەحمەدو ئیسحاقو ظاهرییەکان دەڵێن: حسابی دزی بۆ دەکرێو دەبێ دەستی ببڕدرێ، بەڵگەشیان ئەم فەرمودەیەیە: عائیشە خوای لێ ڕازی بێت، دەڵێت: ئافرەتێکی مەخزومی هەبوو، هەموو جار شتی بە خواستن دەبردو پاشان حاشای لێدەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە بڕینی دەستیکرد، لەو کاتەدا کەسوکاری ئافرەتەکە هاتنە لای (ئوسامەی کوڕی زەید)و داوایان لێکرد بەڵکو لەسەر ئەم ئافرەتە قسە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بکات، ئەویش چوو لەو بارەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ بە ئوسامەی فەرموو: ئەی ئوسامە جارێکی دیکە نەتبینم لەیەکێك لە سنورەکانی خوادا تکا بکەیت، پاشان پێغەمبەرﷺ هەستاو فەرمووی: ئەوانەی پێش ئێوە تەنها بۆیە خوای گەورە لەناوی بردن، ئەگەر بابایەکی ناودارو بەڕێز لەناویاندا دزی بکردایا، وازیان لێدەهێنا، بەڵام ئەگەر بابایەکی لاواز دزی بکردبا، یەکسەر دەستیان دەبڕی!!

دەی بەو خوایەی کە گیانی منی بە دەستە، ئەگەر (فاتیمە)ی کچی (محمد)یش دزی بکات، دەستی دەبڕم، پاشان دەستی ئافرەتە مەخزمیەکەیان بڕی، ئیمام ئەحمەدو موسلیمو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە، (ابن قیم) ئەم بۆچونەیانی لاپەسەندترە، وە هەروەها زۆرێك لە زانایانی تریش، چونکە: ئەو کەسەی شتێك دەخوازێو پاشان حاشای لێ دەکات، ئەگەرچی لە زوبانی عەرەبیدا دزی پێناوترێت، بەڵام لە (شەرع)دا هەر دزە،

دەی شەرعیش پێش زوبان دەکەوێت، وە (شەوکانی)یش لە دوای هێنانی بۆچوونی هەردوولا، موناقەشەکردنی بەڵگەکانیان، بۆچونی دووهەم بەسەرکەوترو پەسەندتر لە قەڵەم دەدات[1] هەندێ وردە بابەت ماوە سەبارەت بە (حەددی دز) بەڵام پێم وایە ئەمەندە بەس بێتو خوێنەری خۆشەویست حەواڵەی پەڕاوەکانی (فقە) دەکەم.

---

[1] نیل الأوطار م٧ ص١٤٨-١٥٠. وەرگێڕ.

# فەصڵی پێنجەم

## حەددی داوێن پیس-الزاني-

ئەو کەسەی کە داوێن پیس‌و زیناکەرە – چ پیاو چ ژن– ئەگەر هاتوو (محصن) بوو.[1] ئەوە دەبێت بە بەرد ڕەجم بکرێت هەتاکو دەمرێت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ (ماعزی کوڕی مالکی ئەسلەمی) و (ئافرەتە غامدی)ەکەو (دوو یەهودی)یەکەی ڕەجمکرد، وە موسوڵمانانیش لە پاش خۆی هەردەم ڕەجمی داوێن پیسانیان کردووە.

بەڵام ئەگەر داوێن پیسەکە (محصن) نەبوو[2]، ئەوە بە فەرمانی (قورئان) دەبێ سەد قامچی لێ بدرێت، وە بە سوننەتی پێغەمبەریشﷺ دەبێت ساڵێك دووربخرێتەوە، ئەگەرچی هەندێك لە زانایان دوورخستنەوەکە بە فەرز نازانن[3] وە هەتاکو چوار شایەت لەسەر ئەنجامدانی ئەو زینایە شایەتی نەدەن، یان کابرا خۆی (اقرار) نەکات لەسەر خۆی، ئەوە حەددەکە بەرپا ناکرێت، جا زۆربەی زانایان دەفەرموون: ئەگەر خۆی شاهێدی لەسەر خۆیدا، ئەوە دەبێت چوار جار شاهیدی بدات، وە هەندێك لە زانایانیش دەفەرمون: یەك جار شاهێدی بدات بەسە.[4]

---

[1] زانایان دەفەرموون: (محصن) بەوە دەوترێت کە ئەم خاڵانەی تیا بێت:
یەکەم: باڵغ بێت. دووەم: عاقڵ بێت. سێیەم: ئازادبێت. چوارەم: ئەگەر پیاوبێت ژنی هێنابێت، ئەگەر ژنیش بێت شوی کردبێت، كفاية الأخيار م٢ ص١١١. وەرگێڕ.

[2] واتە ئەو چوار مەرجەی تێدا نەبوو، کە باسمان کرد. وەرگێڕ.

[3] بەڵگەی قورئان ئەمەیە: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ) (النور:٢) واتە: ئافرەت‌و پیاوی داوێن پیس هەریەکەیان سەد قامچیان لێدەن‌و لە ڕاپەڕاندنی دەستورو یاسای خوادا بەزەیی‌و نەرمی نەتان گرێت).وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (البكر بالبكر جلد مائة ونفي سنة) رواه مسلم. كفاية الأخيار م٢ ص١١٠. وەرگێڕ.

[4] ئەوانەی کە بۆچونیان وایە (کابرای زیناکەر) یەکجار دان بە زیناکەی خۆیدا بێنێ بەسە، ئەم زانایانەن: (مالك، شافعي، داود الظاهري، طبري، ابو ثور) بەڵام (احمد و ابوحنيفه) دەفەرموون: دەبێ کابرا چوارچار

وە ئەگەر کابرایەك خۆی (إقرار)یکرد بەوەی کە زینای کردووە، پەشیمان بویەوە، ئەوە هەندێك لەزانایان دەفەرموون: حەددەکەی لەسەر لادەکەوێت، وە هەندێکیشیان دەڵێن: (حەددە)کەی هەر لەسەر لاناکەوێت[1]؟

(محصن)یش بەوە دەگوترێت کە بابای زیناکەر (مکلف) -باڵغو عاقڵ- بێت، وە بە نیکاحێکی صەحیح ژنی هێنابێت وە بە پێشدا چووبێتە لای ژنەکەی، ئەگەرچی تەنها یەك جاریش بێت.

وە زانایان سەبارەت بە ئافرەتێك کە سکی پڕ دەبێو کەچی مێردیشی نەکردووە جیاوازن، هەندێکیان دەڵێن: حەددی لەسەر نیە، چونکە دەگونجێت بە زۆرلێکراوی سکی پڕبووبێ، یان کابرایەك چووبێتە لایو وای زانیبێ ژنەکەی خۆیەتی، بەڵام دەستەیەکی دیکە لە زانایان دەڵێن: ئەگەر بەبێ مێردکردن سکی پڕبوو، ئەوە دەبێ حەددی لێ بدرێت، جا بە ڕاستی ئەم بۆچونەیان زیاتر لەگەڵ (بنچینەکانی) بەرنامەی ئیسلامدا دەگونجێتو، هەر چوار جێنشینەکانی پێغەمبەریش ﷺ پەیڕەوییان لەمە کردووە[2].

لە بارەی حەددی نێربازیشەوە، هەندێك لە زانایان دەفەرموون: حەددەکەی وەك هی زینایە، وە هەندێکیشیان دەڵێن: حەددەکەی لە هی زینا کەمترەو، بەڵکو تەنها (تعزیر) سەرزەنشت دەکرێت، بەڵام ڕای پەسەندترو ڕاستتر ئەوەیە کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وان لەسەریو یەك دەنگن تێیدا، ئەویش

---

شاهێدی لەسەرخۆی بدات بە ئەنجامدانی زیناکە، وە هەردوولاش بەڵگەی شەرعی خۆیان هەیە، بەڵام پێویست ناکات، لێرەدا باسیان بکەم، وە (سید سابق)یش لە (فقه السنة)دا بۆچونی (ئیمام مالكو شافعی) پێ (راجح) ترە، فقه السنة م٢ ص٣٥٢. وەرگێڕ.

[1] ئەو بۆچونەیان کە دەڵێ حەددەکەی لەسەر لادەکەوێ، بۆچونی ئەم زانایانەیە: (شافعیەکان، حەنەفیەکان، حەنبەلیەکان) ئیمامی (مالك)یش دەفەرموێت: ئەگەر پەشیمان بویەوەو (شوبهە)ی هەبوو، ئەوە لێی قەبوڵ دەکرێت، بەڵام ئەگەر (شوبهە)ی نەبوو، ئەوە لێی قەبوڵ ناکرێت، فقه السنة م٢ ص٣٥٢. وەرگێڕ.

[2] بۆ قوڵتر شارەزابوونی بەڵگەکان، سەیری (فقه السنة م٢ ص٣٥٦-٣٥٧) بکە. وەرگێڕ.

ئەوەیە دەفەرموون: دەبێ هەردوکیان بکوژرێن، چ (بکەر) چ (لەگەڵ کراو) ئیتر (محصن)بن یان (محصن) نەبن وەك یەکە[1]، بۆ ئەمەش چەند بەڵگەیەکیان بەدەستەوەیە: بە تایبەت ئەم فەرمودەیە: (ابن عباس) -خوای لێ ڕازی بێت- لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (من وجد تموه یعمل عمل قوم لوط، فأقتلوا الفاعل والمفعل به) ئەبوداودو ترمذیو ابن ماجه گێڕاویانەتەوەو فەرمودەیەکی صەحیحە.

واتە: (هەرکەستان بینی کردەوەکەی گەلی لوطی ئەنجام ئەدا -نێربازی- ئەوە بکەرو لەگەڵکراو بکوژن).

بە کورتی یارەکانی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە کوشتنی (نێرباز) جیاوازیان نیە -چ فاعل چ مفعول بە- بەڵام بۆ شێوازو چۆنێتی کوشتنەکەیان چەند بۆچونێکیان هەیە:

(ئەبوبەکری صدیقو عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب -خوایان لێ ڕازی بێت- دەفەرموون: دەبێ لەسەربانێك بەر بدرێنەوە یان دیوارێکیان بەسەردا بتەپێنرێت هەتاکو لە ژێریدا دەمرن!!

وە هەندێکیان دەفەرمون: دەبێت بۆن پیسترین جێگادا بەند بکرێن هەتاکو دەمرن، (ابن عباس)یش دەفەرموێت: دەبێت ببرێنە سەر بەرزترین سەربانی ئەو گوندە یان ئەو شارەو بەربدرێنەوە، پاشان بە شوێنیاندا بەرد باران بکرێن، هەروەك چۆن خوای گەورە بەو شێوەیەی بە گەلی (لوط) کرد، وە (ابن عباس) -خوای لێ ڕازی بێت- لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێت: دەبێ ڕەجم بکرێن، شایانی باسە زۆربەی سەلەفیش لەسەر ئەم بۆچونەن، وە دەفەرموون: لەبەرئەوەی خوای گەورە لەسەر ئەو کردەوەیە گەلی (لوط)ی

---

[1] لە باسی حەددی زینادا پێناسەی (محصن) و (غیر محصن)مان ڕوون کردۆتەوە، بە شێوەیەك لێرەدا پێویست ناکات. وەرگێڕ.

ڕەجم کردووە، کەواتە دەبێت: هەردوکیان ڕەجم بکرێن، ئیتر کۆیلە بن یان ئازاد یان یەکێکیان کۆیلەو ئەویتر ئازاد وەك یەکەو هیچ جیاوازییەکیان نیە، بەڵام ئەگەر باڵغ نەبوون، یان یەکێکیان باڵغ نەبوو، ئەوە سزاکەی لە کوشتن سوکترە[1].

[1] خوێنەری خۆشەویست: دەربارەی حەددی نێربازی سێ بۆچوون هەیە:

یەکەم: بە ڕەهابی دەبێت هەردوکیان بکوژرێن، ئەمەش بۆچونی هەموو هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ وە ئیمامی شافعیش لە قسەیەکیدا لەسەر ئەمەیە.

دووەم: حەددی نێربازی وەك حەددی زینا وایە، بۆیە ئەگەر ژندار بوون، دەبێ (ڕەجم) بکرێن و، ئەگەر بێ ژنیش بوون، ئەوە دەبێ (سەد) قامچیان لێبدرێ، ساڵێکیش لە وڵات دوربخرێنەوە، ئەمەش بۆچونی ئەم زانایانەیە: (سەعیدی کوڕی موسەیەب، عطائی کوڕی ڕەباح، قەتادە، حەسەنی بەصری، نەخەعی، ثەوری، ئەوزاعی، ئیمام شافعی لە قسەیەکیدا).

سێهەم: (ئەبوحەنیفەو، شافیعی لە قسەیەکی تریدا) دەڵێن: ئەو کەسەی نێربازی دەکات تەنها (تعزیر) سەرزەنشتی لەسەرە، چونکە ئەو کردەوەیە زینا نیە، بۆیە حوکمی ئەویش وەرناگرێت. فقە السنە م٢ ص٣٦٥-٣٦٧، بەڵام ئیبن تەیمییە -ڕەحمەتی خوای لێبێت- بۆچوونی یەکەمی لاپەسەندترو (صەحیح)ترە، چونکە ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە، وە شەوکانیش -خوای لێ ڕازی بێت- لە پەڕاوی (نیل الأوطار/٧ ص١٣٣)دا ئەمیش هەمان بۆچونی هاوەڵانی پێڕاسترو، لاپەسەندترو، بەرپەرچی هەردوو بۆچونەکەی تری داوەتەوە. وەرگێڕ.

# فەصڵی شەشەم

## حەددی عارەق خۆر – شارب الخمر-

حەددی عارەق خواردنیش، بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ جێگیرەو کۆڕا (اجماع)ی ئوممەتیشی لەسەرە، چونکە بەچەند جۆرێك لە پێغەمبەری خواوەﷺ گێڕدراوەتەوە کە فەرمویەتی: (من شرب الخمر فاجلدوه، ثم ان شرب فاجلدوه، ثم إن شرب الرابعة فأقتلوه) ئەبو داودو ترمزیو ابن ماجه گێڕاویانەتەوە.

(هەرکەس عارەقی خواردەوە، ئەوە شەلاقی لێدەن، پاشان ئەگەر خواردیەوە شەلاقی لێدەن، پاشان ئەگەر خواردیەوە شەلاقی لێدەن، وەئەگەر بۆ جاری چوارەمیش خواردیەوە، ئەوە بیکوژن).

وە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ جێگیرە کە چەند جار (شەلاق)ی لە عارەق خۆر داوە، وە بەهەمان شێوە جێنشینەکانیو موسوڵمانانیش لە پاش خۆی هەردەم پەیڕەویان لێکردووە.

بەڵام کوشتنی (عارەق خۆر) لەلای (جمهوری) زانایان (منسوخ)ە، هەندێکیش دەڵێن: (منسوخ) نیەو، بەڵکو ئەو کوشتنە وەك (سەرزەنشتێك) وایە کە پێشەوای موسوڵمانان لەکاتی پێویستدا ئەنجامی دەدات[1].

سەبارەت بە ژمارەی شەلاقەکانیش: لە صەحیحی (مسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ: (انه ضرب في الخمر بالجريد والنعال أربعين).

واتە: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەڕ حەددی عارەق خۆردا، بەپەلی دارخورماو نەعل (چل) شەلاقی وەشاندووە). وە ئەبوبەکری صدیقیش –خوای لێ ڕازی

[1] تەنها (ظاهیریەکان) لەناویاندا (ابن حزم) بۆچونیان وایە کە: عارەقخۆر لە جاری چوارەمدا دەکوژرێت، ئیتر کۆو جەماوەری زانایان دەفەرموون: کوشتنەکەی (نسخ) بووەتەوە. نیل الأوطار م٧ ص١٦٢-١٦٣. وەرگێڕ.

بێت- هەر چل قامچی وەشاندووە، بەڵام عومەری کوڕی خەتتاب -خوای لێ ڕازی بێت- لەسەردەمی جێنشینایەتی خۆیدا (هەشتا) قامچی لە عارەق خۆر داوە، وە ئیمامی عەلی -خوای لێ ڕازی بێت- جاری وا هەبووە چل قامچی‌و جاری وا هەبووە هەشتا قامچی لێ دەدا.

بۆیە دەستەیەك لە زانایان دەڵێن: (واجب)ە هەشتا قامچی لە عارەق خۆر بدرێت، وە هەندێکیش دەڵێن: ئەوەی کە واجبە چل قامچییە، بەڵام زیاد لەوە (پێشەوای موسوڵمانان) دەتوانێت لە کاتی پێویستدا ئەنجامی بدات، بۆ نمونە: ئەگەر بابای عارەق خۆر لە هەشتا قامچی کەمتر گوێی نەدەداو پەندی وەر نەدەگرت، یان خەڵکی بەشێوەیەکی زۆر دەستیان دابوویە عارەق دروستکردن‌و خواردنەوەی، ئەوە لەو دەمەدا زیاد لە چل قامچی دروستە، بەڵام ئەگەر عارەق خۆران کەم بوون‌و، بابای عارەق خۆریش تازە دەستی دابوویە عارەق خواردنەوە، ئەوە چل قامچی بەسەو، زیاتر لەوە پێویست ناکات، شایانی باسە ئەم بۆچونی دووەمەیان لەوی پێشوو (پەسەند)ترەو، بۆچوونی ئیمام (شافعی)و ئیمام (احمد)یشە لە یەکێك لە قسەکانیدا چونکە (عومەری کوڕی خەتتاب) -خوای لێ ڕازی بێت- کاتێك هەستیکرد عارەق دروستکردن‌و خواردنەوەی پەرەی سەندووەو زۆر بووە، یەکسەر لە هەشتا قامچیەکەش زیادی کردووە، ئەنجا بۆ زیاتر سەرزەنشتکردن سەری عارەق خۆرەکەشی (سفر) دەکرد، بۆیە ئەگەر کابرای عارەق خۆر لەگەڵ لێدانی چل قامچییەکەیدا، لە وڵاتیش دوور بخرێتەوە تا ناوی کوێر بێتەوە، یان ئەگەر بەرپرس بوو، لابرێت‌و بهێنرێتە خوارەوە، ئەوە کارێکی زۆر چاکە، چونکە ئیمامی عومەر -خوای لێ ڕازی بێت- لەسەر عارەق خواردنەوە بەرپرسی هێناوەتە خوارەوەو (عەزلی)ی کردووە!!

# عارەق چیە؟

## پێناسەی عارەق -الخمر-

**ئەو عارەقەی کە خواو پێغەمبەر ﷺ قەدەغەیان کردووە، وە هەرکەس بیخواتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە شەلاق لێدانی، بریتیە: لە هەموو شەرابێکی سەرخۆشکەر، ئیتر لە هەرچییەك دروست بکرێت، وەك یەك وایە، وەك ئەمانە: (ترێو خورماو هەنجیر) لە میوەدا، (گەنمو جۆ) لە دانەوێڵەدا، یان (هەنگوین) و (شیر)ی ئاژەڵ. چونکە عارەق تایبەت نیە بە گوشراوی ترێوە، تەنانەت ئەو کاتەی کە ئایەتی حەرامبوونی (عارەق) دابەزی، لەنێو مەدینەدا ئەو عارەقەی کە لە ترێ دروست دەکرێت هیچی تێدا نەبوو، چونکە لە نێو شاری مەدینەدا دار ترێ هەر نەبووە، بەڵکو عارەقی ترێ لە شامەوە دەهات بۆ مەدینە، وە خەڵکی شاری مەدینە زۆرینەی عارەقەکەیان گوشراوی خورما بووە.**

**هەربۆیە بە (موتەواتر)ی لە پێغەمبەری خواو ﷺ جێنشینە بەڕێزەکانیو، هاوەڵانی تریش هاتووە کە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو سەرخۆشکەرێکی بە حەرام داناوەو، ڕونیشی کردۆتەوە کە (عارەق)ـە.**

**کەواتە: ڕای پەسەندترو بەهێز ئەوەیانە کە (جمهور)ی زانایانی لەسەرە، ئەویش ئەوەیە کە بەگشتی هەرشتێك (مسکر) سەرخۆشکەر بێت ئەوە عارەقەو حەڕامە، وە شەلاقیش لە بخۆرەکەی دەدرێت، ئیتر ئەگەرچی تەنها یەك قەترەشی لێبخواتەوەو بۆ تەداوی بێو بۆ غەیری ئەوە وەك یەکە.**

**چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە عارەق پرسیاری لێکرا لە کاتێکدا بۆ دەرمان بەکاربهێنرێت؟ ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: (إنها داء وليست بدواء) رواه مسلم. واتە: (لە ڕاستیدا عارەق دەردە، نەك دەرمان). وە لە ڕیوایەتی ئیمام (بوخاری)دا دەفەرموێت: (إن الله لم يجعل شفاء امتي فيما**

حرم عليها) واته: (خوا شيفاى ئومەتەكەمى لە شتێكدا دانەناوە كە لەسەرى حەرام كردبێت) بەرپاكردنى حەددەكەش بە دوو شت واجب دەبێت.

يەكەم: بە شاهيدى دانى دوو شاهيدى پياو.

دووەم: بە (اعتراف) دانپێداهێنانى عارەق خۆرەكە خۆى.

بەڵام ئەگەر بابايەك بۆنى عارەقى لێ دەهات، يان بينرا لە وەختى ڕشانەوەدا عارەقى هەڵدەهێنايەوە، ئەوە هەندێك لە زانايان دەڵێن: ئەو كەسە حەددى لێ نادرێت، چونكە بۆى هەيە عارەقى نەخواردبێت، يان بە نەزانى خواردبێتى، يان بە زۆرو شەق دەرخوارديان كردبێت، لەم لاشەوە دەستەيەكى تر لە زانايان دەفەرموون: ئەگەر زانرا ئەو شتەى كە خواردويەتيەوە سەرخۆشكەرە، ئەوە دەبێت شەلاقى لێبدرێت، ئەم بۆچونەشيان پەسەندترەو، هەر ئەمەش لە جێنشينەكانى پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانى ديكەشەوە هاتووە، وەك (عوسمانو عەلىو ابن مسعود) -خوايان لێ ڕازى بێت- سوننەتى پێغەمبەريش ﷺ هەر لەسەر ئەمەيانەو، بۆ (ئيصلاح)ى خەڵكيش ئەمەيان باشترەو، ڕێڕەوى ئيمام (مالك)و (احمد)و غەيرى ئەوانيش لەسەر ئەمەيە.

# حوكمی حەشیشە

بەهەمان شێوە حەشیشەش خواردنی حەرامەو، بخۆرەکەی شەلاقی لێدەدرێت، وەك چۆن لە عارەق خۆر دەدرێت، بەڵکو حەشیشە لە عارەقیش –لەچەند روویەکەوە– پیسترو قێزەونترە!!

بەلام ئەوەندە هەیە لەبەر ئەوەی (تەڕ)نیەو (وشكو ڕەقە) زانایان سەبارەت بە پیسبوونی مشتومڕیان هەیەو سێ بۆچوونی لەسەرە:

بۆچوونی یەکەم: وەك عارەق وایەو پیسە.

بۆچوونی دووەم: لەبەرئەوە وشكو ڕەقە پیس نیە.

بۆچوونی سێیەم: دەبێ جیاوازی بخرێتە نێوان وشكو تەڕەکەیانەوە.

بەهەرحاڵ: بە ناوو ناوەڕۆك حەشیشە دەچێتە نێو ئەو عارەقەی کە خواو پێغەمبەر ﷺ قەدەغەیان کردووە، ئەوەتا (ئەبوموسای ئەشعەری) –خوای لێ ڕازی بێ– دەفەرموێت: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەو دوو (شەرابە)ی کە ئێمە لە وڵاتی یەمەن دروستی دەکەین فەتوامان بۆ بدە؟ (البتع) کە لە هەنگوین دروست دەکراو (المزر) کە لە گەنم دروست دەکرا، جا ئەبو موسا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتاردا وشەی کورتو پڕمانای "جوامع الکلم"ی پێ بەخشرابوو. بۆیە فەرمووی (کل مسکر حرام) واتە: (هەموو شتێکی سەرخۆشکەر قەدەغەیە) متفق علیه.

وە (نوعمانی کوڕی بەشیر) –خوای لێ ڕازی بێت– دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە (جۆ) عارەق هەیە، لە (گەنم) عارەق هەیە، وە لە (مێوژ) عارەق هەیە، وە لە (خورما) عارەق هەیە، وە لە (هەنگوین) عارەق هەیەو منیش پێشگیریی لە هەموو سەرخۆشکەرێك دەکەم. ئەبوداودو ترمزی گێڕاویانەتەوە.

وە (ابن عمر) –خوای لێ ڕازی بێت– دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (کل مسکر خمر، وکل مسکر حرام) وفی روایە (کل مسکر خمر، وکل خمر حرام) رواه مسلم.

واتە: (هەموو سەرخۆشکەرێك عارەقەو، هەموو سەرخۆشکەرێکیش قەدەغەیە) لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (هەموو سەرخۆشکەرێك عارەقەو هەموو عارەقێکیش قەدەغەیە) وە (عائیشە) -خوای لێ ڕازی بێت- دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (كل مسكر حرام، وما أسكر الفرق منه، فملا الكف منه حرام) رواه الترمذي وقال: حديث حسن. واتە: (هەموو سەرخۆشکەرێك قەدەغەیە، وە هەر شتێك زۆرەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات، ئەوە پڕە مشتێکیشی لێ قەدەغەیە) وە هەم پێغەمبەری خوا ﷺ لە جێگایەکی دیکەدا دەفەرموێت: (ما أسكر كثيره، فقليلة حرام) رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه وصححه الحاكم. واتە: (ئەو شتەی زۆرەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات، کەمەکەیشی قەدەغەیە) وە (جابر) -خوای لێ ڕازی بێت- دەفەرموێت: (جارێکیان پیاوێکیان پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەشەرابێك کە لە وڵاتی ئەوان دەیان خواردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو شەرابە سەرخۆشکەرە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەموو سەرخۆشکەرێك قەدەغەیە، وە هەر کەس خواردنی سەرخۆشکەر بخواتەوە، خوا بەڵێنی داوە کە: چڵك و چەپەڵی دۆزەخییەکانی دەرخوارد بدات) موسلم ڕیوایەتی کردووە. جا لە ڕاستیدا فەرمووده لەم بارەوە زۆرەو لەیەك وشەی کورتدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو سەرخۆشکەرێکی کۆکردۆتەوەو، بە حەڕامی لە قەڵەمداوە، وە جیاوازی نەخستۆتە نێوان جۆرێك و جۆرێکی دیکە، ئیتر ئایا ئەو سەرخۆشکەرە دەخورێت، یان دەخورێتەوە، شلە یان ڕەق و وشك، هیچ کار لە حەرامبوونی ناکات، وە شایانی باسە زانایانی پێشوو بۆیە بە تایبەت باسی (حەشیشە)یان نەکردووە، جونکە لەم نزیکانەداو لە پاش ئەوان خواردنی داهاتووە، هەروەك چۆن هەندێك شەرابی سەرخۆشکەری دیکەش هەن لەکاتێکدا لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبوون و لە پاش ئەو داهاتوون، بەڵام هەموویان دەڕۆنە ژێر ئەو فەرمودانەی کە بڕیاری حەرامبوونی هەر سەرخۆشکەرێکیان داوە.

# فەصلی حەوتەم

## حەددی بوهتان کردن[1]

یەکێکیتر لەو حەددانەی کە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ باسیان کردووەو موسوڵمانانیش تێکڕا کۆکن لەسەری... حەددی بوهتان کردنە – القذف– بۆ کەسێکی داوێن پاك! بۆیە ئەگەر بابایەك بوهتانی (زینا) کردن یان نێربازی بۆ کەسێکی پاكو بێگەرد (المحصن) کرد، ئەوە واجبە حەددی لێ بدرێت، شایانی باسە حەددەکەش هەشتا قامچییە.

لەباسی بوهتاندا مەبەست بە (محصن) مرۆڤی ئازادو داوێن پاکە (الحرالعفیف) بەڵام لە بابی زینادا: بریتیە لەوەی کە ژنی هێنابێو (جیماع) تەواوەتی لەگەڵدا کردبێت.

---

[1] بێگومان شێخی ئیسلام –ڕەحمەتی خوای لێبێت– باسی (القذف) بوهتانیشی بە کورتی هێناوەو هەندێك وردە بابەتی باس نەکردووە، بۆیە ئەگەر خوێنەر دەیەوێت قوڵتر شارەزا بێت، با سەیری پەڕاوەکانی (فقه) بکات. وەرگێڕ.

# فەصلی هەشتەم

## ئەو تاوانانەی کە سزاو حەددێکی دیاریکراویان بۆ دانەنراوە

لەمەڕ ئەو سەرپێچیو تاوانانەی کە لە قورئانو سوننەتدا حەدێکی دیاریکراو، یان (کەفارەت)یان بۆ دانەنراوە، وەك ئەم تاوانانە:

١. ماچکردنی منداڵی بێ موو، یان ئافرەت-غەیری ژنی خۆییو محارم-.

٢. باوەشکردن بە ئافرەتدا، سۆك لێدانیو، خۆپیائاسون، چونە لای ئافرەت، بەڵام بەبێ (جیماع)!!.

٣. بوهتان هەڵبەستن بۆ خەڵکی، بەڵام کەمتر لە زینا، (بۆ نمونە: فلاّن کەس ماچی فلاّن ئافرەتی کرد، یان سۆکی لێدا، یان چاوی لێ هەڵتەکاند).

٤. خواردنی شتی حەڕام، وەك: خوێنو مردارەوە بوو.

٥. دزینی شتێك لە جێگایەکدا کە شوێنی پاراستنی سروشتی ئەو شتە نەبێت، ئەگەرچی شتێکی زۆر کەمیش بێت.

٦. ناپاکیکردن لە ئاست (ئەمانەتو بەرپرسێتیدا، وەك: بەرپرسانی (بیت المال)و (هەتیو) و (وەکیل) و (شەریك) ئەگەر هاتوو ناپاکی -خیانەت- یان تێدا ئەنجامدا.

٧. (غەش) کردن لەسەوداو کڕینو فرۆشتندا، وەك: ئەوانەی لە (کێشانە)و (پێوانە)دا کەمو زۆر دەکەنو خەڵکی هەڵدەخەڵەتێننو قۆڵیان دەبڕن!!

٨. شایەتیدانی درۆ. (شهادة الزور).

٩. بەرتیل (ڕەشوە) وەرگرتن لە (حوکم)کردندا.

١٠. حوکمکردن لە شتێکدا بە غەیری بەرنامەی خوا.

١١. دەست درێژکردنە سەر خەڵکی بە ناحەق.

جا ئەوانەی کە ئەم جۆرە تاوانانە ئەنجام دەدەن، ئەوە دەبێت هەریەم سزابدرێن‌و سەرزەنشت –تعزیر– بکرێن، جۆری سەرزەنشتەکەش دراوەتە دەست والی موسڵمانان.

بەڵام ئەوەندەیە بۆ کەم‌و زۆری –تعزیر–ەکە دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

یەکەم: دەبێ سەرزەنشت –تعزیر–ەکە بە گوێرەی کەم‌وزۆری تاوانەکەی بێت لە نێو خەڵکیدا، بۆیە ئەگەر ئەو تاوانە لە نێو خەڵکیدا زۆر بوو، ئەوە دەبێت سزاکەی زۆرتر بێت، بەڵام ئەگەر کەم ئەنجام دەدرا ئەوە دەبێت بەپێچەوانەوە بێت.

دووەم: وە دەبێ بەگوێرەی حاڵی تاوانبارەکە بێت، بۆیە ئەگەر کابرایەك بو لە گوناهو سەرپێچیدا ڕۆچووبوو.. ئەوە دەبێ سزاکەی بۆ چەندانە زیاد بکرێت، بەڵام ئەگەر وانەبوو ئەوە دەبێت بە پێچەوانەوە بێت.

سێهەم: وە دەبێ بە گوێرەی گەورەوبچوکی خودی تاوانەکە بێت. بۆ نمونە: بابایەك شەلم کوێرم دەستدرێژی دەکاتە سەر ناموسی هەموو کەس، نابێت سزاکەی وەك ئەو کەسە بێت کە تەنها دەستدرێژی کردۆتە سەر یەك ئافرەت یان یەك منداڵ.

لەمەڕ کەمترینی (تعزیر)ەکەش سنورێکی دیاریکراو دانەنراوە، بەڵکو هەر شتێك ئازاروئێش بە تاوانبار بگەیەنێت ئەوە دەگونجێت ئەنجام بدرێت، چونکە زۆرجار پیاوی وا هەیە بە ئامۆژگاری سەرزەنشت دەکرێت، هی واش هەیە بە توڕە بوون لێی، هی واش هەیە تەنها بە هەڕەشە کردن لێی، وە زۆرجاریش (تعزیر) بە دەنگ لێ هەڵگرتن‌و (سلاو) لێ نەکردن دەبێت، ئەگەر هاتوو بەرژوەندی لەوەدا بوو، هەروەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ‌و هاوەڵانی پەنجا ڕۆژ قسەیان نەکرد لەگەڵ ئەو سێ موسڵمانەدا کە بەبێ (عوزر) لە جەنگی (تەبوك) دواکەوتن!!

وە پیاوی واش هەیە (تعزیر)ەکەی بەوە دەبێت کە لە (لێپرسراوێتی) بهێنرێتە خوارەوە، هەروەك پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵانی (تعزیر) یان بەو جۆرە کردووە، وە هەندێ جاریش (تعزیر) بە پێچراندنی (راتب) موچە دەبێت، وەك ئەو سەربازە موسڵمانەی کە لە شەڕدا هەڵدێو پشت ئەکاتە دوژمن، چونکە پشتکردنە دوژمن لە شەڕدا لە تاوانە گەورەکان (الکبائر)ە، جا بڕینی یارمەتیەکەی وەك شێوە (تعزیر)ێك وایە بۆی، وە بەهەمان شێوە (لێپرسراو) ئەگەر کردەوەیەکی نادروستی کرد، ئەوە هێنانە خوارەوەیو دورخستنەوەی لەو بەرپرسێتیە جۆرە سەرزەنشتێکە بۆی!

وە زێدە جارانیش سەرزەنشت (تعزیر) بە (بەند) کردنو لێدان دەبێت، یان ناوچاو ڕەشکردنو سوارکردنی بە پشتدا لەسەر وڵاخێكو گێڕانی بەنێو خەڵکیدا. هەروەك دەگێڕنەوە کە ئیمامی (عومەر) –خوای لێ ڕازی بێت– هەرکەسێك شاهیدی درۆی بدابایە، فەرمانی دەکرد ناوچاوی ڕەش بکرێتو بە پشتا سواری وڵاخێك بکرێو، بەنێو عالەمدا بگێڕدرێت!!

سەبارەت بە سنوری زۆرترینی (تعزیر)ەکەش، زانایان مشتومڕیان هەیە، شافعییەکان دوو قسەیان لەسەری هەیە:

یەکەم: نابێت لە (دە) قامچی زیاتر بێت.

دووەم: نابێت بگاتە ئەندازەی حەددێکی شەرعی.

وە ئیمام (احمد) دەڵێت: دەگونجێت لەسەر تاوانێك ئەوەندەی لێ بدرێت کە بگاتە ئەندازەی (حەدد)ی تاوانێکیتر، بەڵام نابێت بگاتە (حەدد)ی هەمان تاوان، بۆ نموونە: کابرایەك دزی بکات، بەڵام ئەو مەرجانەی تێدا نەبێت کە دەبێتە هۆی دەستبڕینی، ئەوە نابێت دەستی ببڕدرێت، بەڵام دەکرێت زیاد لە (حەدد)ی (بوهتان)کردنیشی لێ بدرێت، یان کەسێك لە (زینا) کەمتر بکات، ئەوە نابێت –حەدد–ی زینای لێبدرێت، بەڵام دەگونجێت زیاد لە (حەدد)ی (بوهتان)کەری لێ بدرێت!!

بەلاّم ئیمام (مالك) دەڵێت: هەندێك تاوان هەن دەگونجێت (تعزیر)ەكەیان بگاتە (كوشتن)یش. جا هەندێك لە شوێنكەوتوانی ئیمام (احمد)یش لەگەڵیدا یەكدەنگن، بۆ وێنە: (جاسوسی موسڵمان) ئەگەر هاتوو جاسوسی بەسەر موسڵمانانەوە بۆ دوژمن دەكرد، ئەوە سەبارەت بە حوكمەكەی ئیمامی (احمد)تێیدا وەستاوە، بەلاّم (مالك)و هەندێكیش لە (حەنبەل)ییەكانیش كوشتنیان پێ (مەنعە)!.

بەهەمان شێوە سەبارەت بە (ساحر –جادوگەر–)یش زۆربەی زانایان پێیان وایە دەبێت بكوژرێت. چونكە (جوندب) –خوا لێی ڕازی بێ– دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (حد الساحر ضربه بالسیف) رواه الترمذي. واتە: (حەددی جادوگەر شمشێر لێدانیەتی!!) وە لە هاوەڵانیش: (عومەرو، عوسمانو، حەفصەو، عبداللەی كوڕی عومەر، هەندێ صەحابەی تریش) –خوایان لێ ڕازی بێت– پێیان وایە دەبێ (جادوگەر) بكوژرێت.

شایەنی باسە (جمهور)ی زانایانیش كوشتنی (جادوگەر) بە (حەدد) دەزانن نەك (تعزیر).

وە (ئەبو حەنیفە)ش پێی وایە ئەگەر تاوانێك زۆر دوبارە بویەوە، ئەوە (تعزیر)ەكەی دەبێتە (كوشتن)!.

بەڵگەش لەسەرئەوەی هەر تاوانبارو خراپكارێك ئەگەر خراپەو شەڕی بە كوشتن نەبێت كۆتایی پێ نەدەهات، ئەوە دەبێت بكوژرێت...

ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە ﷺ: ئیمام (مسلم) لە صەحیحەكەیدا لە (عەرفەجەی ئەشجەعییە)وە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هەركەس هات بۆلاتان وە لەكاتێكدا ئێوە هەموو كۆبوون لەسەر

لێپرسراوێتی یەك پیاو، بەڵام ئەو دەیویست هێزتان تێكداو، یان جیاوازی بخاتە نێوان ڕیزەكانتانەوە، ئەوە بیكوژن)[1]

یان دەبینی پێغەمبەری خوا ﷺ لەجاری چوارەمدا فەرمانی بە كوشتنی عارەقخۆر كردووە، ئەویش بەبەڵگەی ئەو فەرمودەیەی كە ئیمامی (أحمد) لە (دەیلەمی)یەوە دەیگێڕێتەوە كە دەفەرموێت: (پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كردو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە وڵاتێكین هەمیشە سەرگەرمی ئیشكردنین، جا بۆیە لە (گەنم) شەراب دروست دەكەین‌و بەهۆیەوە خۆمان لەسەرمای وڵاتەكەمان دەپارێزین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو شەرابە سەرخۆش كەرە؟! وتم: بەڵێ. ئەویش فەرمووی: وازی لێبێنن‌و خۆتانی لێ دوور بخەنەوە، منیش وتم: دەی خەڵكی دەستی لێ هەڵناگرن، ئەویش فەرمووی: ئەگەر دەستیان لێهەڵنەگرت بیانكوژن).

لەلایەكی دیكەشەوە: چونكە مرۆڤی خراپكارو پیس وەك دوژمنی هێرش هێنەر وایە، جا هەر كاتێك ئەو دوژمنە بە كوشتن نەبێت نەدەچووە دەرەوە، ئەوە دەبێت بكوژرێت.

كۆكەرەوەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە (عقوبە)كان دوو جۆرن:

یەكەمیان: (عقوبە)و سزا لەسەر تاوانێكی ڕابردوو، وەك: قامچی لێدانی (عارەق خۆر)و (بوهتانكەر)، یان: دەستبڕینی (ڕێگر)و (دز).

دووەمیان: (عقوبە)و سزا بۆ ئەنجامدانی (واجب)ێك، یان وازهێنان لە (حەڕامێك) لەداهاتوودا، وەك: داوای تەوبەو گەڕانەوە لە بابای (پاش

---

[1] سەیری دەكەی پێغەمبەری خوا ﷺفەرمان دەكا بە كوشتنی ئەو كەسەی داوای لێپرسراوێتی موسڵمانان دەكات لەكاتێكدا موسڵمانان لێپرسراوی شەرعی‌و ڕاستی خۆیانیان هەیە. چونكە ئەوە خراپەی زۆر لێدەبێتەوەو هۆكارێكی گەورەیە بۆ (فیتنە). جا خراپەی ئەو كابرایە بە كوشتن نەبێت كۆتایی پێنایەت، كەواتە دەبێت بیكوژرێت، ئەگەرچی پیاوچاكیش بێت، چونكە هەر لەڕیوایەتی (موسلم)دا هاتووە دەفەرموێت: (كائنا من كان) واتە: هەركەس بێت. وەرگێڕ.

گەزبووەوە-المرتد-) هەتاکو موسڵمان بێتەوە، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە باشەو ئەگەر نەیشی کرد ئەوە دەکوژرێت، یان سزادانی ئەوەی کە وازی لە (نوێژ)و (زەکات)و مافی مرۆڤەکان هێناوە، هەتاوەکو بەشێوەیەکی باش بیانگێڕێتەوە.

جا شایانی باسە (تعزیر)و سەرزەنشت لەم جۆرەیاندا لە هی یەکەم توندترو ناڕەحەتترە. هەربۆیەش ئەوەی کە وازی لەنوێژ هێناوە (جائیزە) جار لەدوای جار لێی بدرێت هەتاوەکو دەست بکاتەوە بە نوێژکردن، ئەو فەرمودەیەش کە لەصەحیحی (بوخاری)و (مسلم)دا هاتووەو دەفەرموێت: (لا يجلد فوق عشرة أسواط إلاّ في حد من حدود الله). واتە: (تەنها لە سنورێك لە سنورەکانی خوادا نەبێت بۆ هیچ شتێك زیاد لە (دە) قامچی ناوەشێنرێت). ئەوە کۆمەڵێك لە زانایان بە وردی توێژیویانەتەوەو دەڵێن: مەبەست لە (حدود الله) (سنورەکانی خوا) هەرشتێکە لەبەر مافی خوا -جل جلاله- قەدەغە کرابێت.

بەڵام ناونانی ئەو سزایانەی کە لە قورئان و سوننەتدا سنورەکەیان دیاریکراوە بە (حەدد)، ئەوە شتێکی پەیدابوو داهێنراوە، مەبەست لە فەرمودەکەش ئەوەیە: هەرکەس لەبەر مافی خۆی لە هەر کەسی دا -وەك: لێدانی پیاو لە ژنی خۆی ئەگەر هاتوو گوێنەگر بوو- ئەوە نابێت لە دە قامچی تێپەڕ بکات.

تێبینی: لە یاسای خوادا مەبەست بە (جەلد - قامچی - شەلاق) لێدانێکی مام ناوەندییە بە قامچی، چونکە چاکترینی هەموو شتێك ئەوەیە کە مامناوەندی بێت، وە (جەلد) بە (گاڵۆك و تەختە) بەکار نایەت، بەڵکو بۆ (حەدد)ەکان دەبێت قامچی بەکاربهێنرێت. چونکە ئیمامی (عومەر) -خوای لێ ڕازی بێت- هەمیشە گاڵۆکێکی بەدەستەوە بوو بۆ ئەدەب فێرکردنی سەرپێچی کاران بەکار دەهێنا، بەڵام ئەگەر (حەدد)ێکی شەرعی بهاتبایە پێشێ، یەکسەر بانگی دەکرد کە (قامچی) بۆ بێنن.

وە ئەو کەسەی کە (حەدد)ی لێدەدرێت نابێت هەموو جلەکانی لەبەردا دابکەنرێت‌و، بەتەواوەتی ڕووت بکرێتەوە، بەڵکو تەنها ئەوانەی لەبەردا دادەکەنرێت کە بەربەستن لە ئێش پێگەیاندنی، وە ئەگەر پێویستی بە بەستنەوە نەدەکرد، ئەوە نابێت ببەسترێتەوە، وە نابێت لە دەم‌و چاوی بدرێت، چونکە فەرمودەی ئیمام (مسلم)ی لەسەر هاتووە، لەبەرئەوە لەکاتی (تعزیر)دا مەبەست پێی ئەدەب دادانێتی نەك کوشتنی. وە دەبێت هەموو ئەندامانی لاشەی بەشی خۆیان لێدانیان وەبەرکەوێت. وەك: (پشت)و (ناوشان)و (ڕانەکان)!!

# فەصڵی نۆیەم

# جیهادی بێبڕوایان

**جۆرەكانی سزا -عقوبە- شەرعییەكان-**

ئەو سزایانەی كە لەبەرنامەی خوادا دیاریكراون بۆ ئەوانەی كە سەرپێچی خواو پێغەمبەر ﷺ دەكەن، دوو جۆرن:

جۆری یەكەم: سزا (عقوبە)ی ئەوانەی كە بەردەست كراون، ئیتر لەكەسێكەوە بۆ چەند كەسێك، ئەمانەش پێشتر باسكراون.

جۆری دووەم: سزای ئەو كۆمەڵەی بەرنامەی خوا قبوڵ ناكاتو ڕەتی دەكاتەوە (الطائفة المتنعة) وە بەشەڕو جەنگ نەبێت دەستگیربونیان ئەستەمە.

جا مەبەست بە سزای كۆمەڵی جۆری دووەم (جیهاد)ی بێبڕوایانە، ئەوانەی كە دوژمنی خواو پێغەمبەر خوان ﷺ. چونكە هەركەس بانگەوازی پێغەمبەر ﷺی بۆ لای (دین)ی خوای پێ بگاتو وەڵامی نەداتەوە، ئەوە ئیتر (قیتال)و جەنگ لەگەڵكردنی (واجب)ە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلّه) (الأنفال:٣٩).

واتە: (ئەو بێبڕوایانە جەنگیان لەگەڵدا بكەنو بیانكوژن، هەتاكو فیتنە -ئەشكەنجەدانی موسڵمانان- نەمێنێت، وە ملكەچی تەنها بۆ خوا بێت).

وە لەبەرئەوە خوای پەروەردگار كاتێ پێغەمبەری خوای ﷺ ڕەوانە كردووە فەرمانی پێكرد بەبانگهێشتكردنی تێكڕای مرۆڤایەتی بۆلای بەرنامەكەی خۆی، لەسەرەتاوە مۆڵەتی كوشتنو كوشتاركردنی خەڵكی پێنەدا، هەتاوەكو كۆچیكرد بۆ شاری (مەدینە)، جا لە پاش كۆچكردن مۆڵەتی بە پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانیدا بە كوشتنو كوشتاركردنی بێبڕوایان، وەك خوای گەورە ئاماژە بۆ ئەو حاڵە دەكاتو دەفەرموێت: (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ)(الحج:٣٩)

پاشان له دوای ئەو قۆناغە - کە قۆناغی بەرگری بوو- خوای پەنهانبین بەیەکجاری جەنگی لەسەر موسڵمانان فەرزکرد، ئەویش بەم ئایەتە پیرۆزە: (كُتِبَ عَلَيْكُمْ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ)(البقره:٢١٦) واته: (جیهادو جەنگتان لەسەر فەرزکراوە لە کاتێکدا بۆتان ناخۆش‌و ناڕەحەتە، وە زۆرجاریش ئێوە شتێکتان پێ گرانە بەڵام ئەوە خێرە بۆتان، وە زۆرجاریش ئێوە شتێکتان پێ خۆشە بەڵام ئەوە خراپە بۆتان، بێگومان خوا دەزانێ‌و ئێوە نازانن).

پاشان خوای زاناو توانا لە زۆربەی سورەتە مەدەنیەکاندا (واجب) بوونی جیهادی دووپات کردۆتەوەو، جیهادی زۆر بەگەورە هەڵسەنگاندووەو سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کە هەردەم دەستی لێ هەڵدەگرن، وە بە (دوودڵ)و (دەغەڵ)و (دڵ نەخۆش) ناوی بردوون. وەك دەفەرموێت: (قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ)(التوبه:٢٤). واته: (ئەی موحەمەد پێیان بڵێ: ئەی موسڵمانان ئەگەر هاتوو باووباپیرانتان‌و، منداڵەکانتان‌و، براکانتان‌و، هاوسەرانتان‌و، هۆزوکەس‌وکارەکانتان‌و، ئەو پارەو سامانەی کە بە ناڕەحەتی وە دەستتان کەوتووەو، ئەو بازرگانییەی کە دەترسێن زەرەربکات‌و، ئەو مەنزڵگایەی کە بۆخۆتان پێی ڕازین، لاتان خۆشەویستتر بون لەخواو پێغەمبەرەکەی‌و ﷺ تێکۆشان لە ڕێی خوادا، ئەوە چاوەڕوان بکەن هەتاوەکو خوای گەورە فەرمانی خۆی بنێرێ، بەڕاستی خوا ڕێنمایی کۆمەڵی لادەرو(فاسق) ناکات!)

وە خوای دادگەر دەفەرموێت: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمْ

الصَّادِقُونَ)(الحجرات:١٥) واته: (بەڕاستی موسڵمانانی ڕاست تەنها ئەوانەن کە: کەبڕوایان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو، پاشان لەو بڕوایەیاندا هیچ گومانو دوو دڵییەکیان نەبووە، وە دارایی‌و دەرونیان جیهادیان لەڕێگەی خوادا کرد، بەڕاستی هەر ئەوانەن ڕاستان).

وە لەجێگەیەکی دیکەدا پەروەردگاری (بینەرو بیسەر) دەفەرموێت: (فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَأَوْلَى لَهُمْ)(محمد:٢٠) واته: (ئەگەر سورەتێکی قورئان دابەزێت‌و بە ڕوون‌و ئاشکرایی باسی فەرزبوونی جیهادی تێداکرابێت، ئەوسا دەبینی ئەوانەی کە دڵەکانیان نەخۆشی‌و دەغەڵی تێدایە، سەیرت دەکەن، وەك سەیرکردنی کەسێك کە ترسی مردنی لێ نیشتبێ، بەڕاستی ئەوانە باشتر وابوو گوێڕایەڵییان کردبا). جا شایانی باسە نمونەی ئەم جۆرە ئایەتە پیرۆزانە لە (قورئان)دا زۆر زۆرن.

وە بەهەمان شێوە خوای کاربەجێ لە سورەتی (الصف)دا جیهادو ئەهلی جیهادی بەرزکردۆتەوەو دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ(١٠)تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ(١١)يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ(١٢) وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ)(الصف:١٠-١٣) واته: (ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە!! ئایا ڕێگەتان پیشاندەم بۆ بازرگانییەك کە لە سزای بە ئێشی (جەهەنەم) ڕزگارتان دەکات؟ ئەو بازرگانییەش ئەوەیە: بڕوا بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بێنن‌و وە بەدارایی‌و گیانتان جیهاد لە ڕێگەی خوادا بکەن، بەڕاستی ئەو بڕواو جیهادە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر ئێوە هەست بکەن‌و بزانن. چونکە بەهۆیەوە خوا لە هەموو تاوانەکانتان خۆش دەبێ‌و، وە دەتانخاتە نێو چەند باخ‌و باخچەیەك کە لە

ژێریاندا ڕووبارو جۆگەلە ڕێ دەکات، وە دەتانخاتە نێو چەند مەنزڵگایەکی پاكو خۆشەوە لەنێو چەند باخچەیەکی ئامادەکراودا، بەڕاستی هەر ئەوە سەرکەوتنو پایەو پلەی گەورەیە).

وە پەروەردگار لە سورەتی (التوبه)شدا دەفەرموێت: (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ(١٩)الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَائِزُونَ(٢٠)يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ(٢١)خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ)(التوبه:١٩-٢٢) واتە: (ئایا ئێوە واتان داناوە: ئاودان بە حاجییەکانی ماڵی خواو ئاوەدانکردنەوەی (مسجد الحرام) وەکو کردەوەی ئەو کەسە وایە کە بڕوا بەخواو ڕۆژی دوایی هێناوەو لەپێناوی خوادا جیهادی کردووە؟! نەخێر بەڕاستی ئەو دوانە لای خوا وەك یەك نین، وە خوای گەورە ڕێنمایی کۆمەڵی لادەرو ستەمکار ناکات. وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووەو لەپێناوی خوادا بە دارایيو گیانیان جیهادیان کردووە، ئەوانە لەلای خوا گەورەترین پلەیان هەیەو، هەر ئەوانەش سەرفرازو سەرکەوتوون، وە پەروەردگاریان لەلایەن خۆیەوە موژدەی میهرەبانيو ڕەزامەندی خۆی پێیان دەدات، وە موژدەیان پێدەدات بەچەند باخچەیەك کە لەنێوانیاندا چەندین نازو نیعمەتی ئامادەکراوی تێدایە: وە لەو بەهەشتەدا بەهەتاهەتایی دەمێنێتەوە، بەڕاستی خوای پەروەردگار پاداشتی گەورەی لایە!).

وە خوای میهرەبان لە جێگایەکی دیکەی ئەم قورئانە پیرۆزەدا دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لاَئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ)(المائدة:٥٤)

واتە: (ئەی کۆمەڵی بڕواداران، هەرکەس لەئێوە ئەگەر پشت بکاتە بەرنامەی خوا، ئەوە خوا گەل‌و کۆمەڵێك دەهێنێ کە ئەم بەهاو ئاکامە جوانانەیان تێدایە:
یەکەم: (یحبهم ویحبونه) خوا ئەوانی خۆش ئەوێ‌و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ.
دووەم: (أذلة على المؤمنين أعزةٍ على الكافرين) لە ئاست بڕوادارانیدا هێمن‌و لەسەرخۆو زەلیلن‌و، لە ئاست بێبڕواکانیشدا توندو زبرو بەجورئەت‌و خاوەن عیزەتن.
سێهەم: (يجاهدون في سبيل الله) لەپێناوی خواداو بۆبەرزکردنەوەی وشەی (الله) بەردەوام خەبات‌و تێکۆشان دەکەن.
چوارەم: (ولا يخافون لومة لائم) لەم مەیدانەشدا تۆسقاڵێك لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن. پاشان دەفەرموێت: ئەم ئاکامە جوانەش فەزڵی خوایەو بەهەرکەسێکی دەدا کە خۆی بیەوێ، بەڕاستی زانیاری خوا بەرفراوانەو بەشێوەیەك ئاگاداری گەورەو گچکەیە).
وە هەم لەمەڕ فەزڵی جیهادو موجاهیداندا دەفەرموێت: (ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ لاَ يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلاَ نَصَبٌ وَلاَ مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَطَؤُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلاَ يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلاً إِلاَّ كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ إِنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ(١٢٠)وَلاَ يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلاَ كَبِيرَةً وَلاَ يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلاَّ كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)(التوبه:١٢١). واتە: (بۆیە ڕەوا نیە موسڵمانان لە غەزادا لە پێغەمبەر ﷺ دوا بکەون، چونکە بڕواداران هەر تینوێتی‌و ماندوبوون‌و برسێتیەکیان لە جیهاددا دووچار نابێت، وە پێ نانێن بە هیچ جێگا پێ‌و شوێنێکدا کە ڕق‌و خەشمی بێبڕوایان هەڵدەستێنێ‌و دڵتەنگیان ئەکات، وە لە هیچ دوژمنێك وەرناگرن هیچ شتێك لە کوشتن‌و بڕین وشکان‌و دەستکەوت، مەگەر لەبەر هەر کام لەمانە کردەوەیەکی باشیان بۆ تۆمار بکرێت، بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران بەفیڕۆ نادات، وە ئەو

موسڵمانانە هیچ شتێك نادەن لەڕێی خواداو هیچ ئەرك و نەفەقەیەك نە بچوك نە گەورە ناكێشن، وە لەڕۆشتن و هاتووچۆیاندا بۆ هەر غەزایەك هیچ شیوو دۆڵێك نابڕن و تێپەڕ ناكەن لێی، مەگەر بۆیان نوسراوە، بۆ ئەوەی خوا بە چاكترو جوانتر لەوەی خۆیان كردوویانە پاداشتیان بداتەوە)[1]

شایانی باسە لە (قورئان)و (سوننەت)دا فەرمانكردن بە جیهادو باسكردنی پاداشت و فەزڵ و گەورەییەكەی لەوە زۆرترە كە باسبكرێ و بژمێردرێت!!

جا هەر بۆیەش: (جیهاد)كردن لە هەموو كردارە (سوننەت)ەكان گەورەترەو، بەیەك دەنگی هەموو زانایان لە (حەج) و (عەمرە)و (نوێژ) و (ڕۆژو)ی سوننەت پایەبەرزترو مەزنترە، هەروەك (قورئان)و (سوننەت)ی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر ئەوە بەڵگەیە.

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (رأس الأمر الإسلام، وعمودُهُ الصلاة، وذروة سنامهِ الجهاد) رواه الترمذي وإبن ماجه.

واتە: (سەری بەرنامەكە (ئیسلام)ە، كۆڵەكەو بڕبڕەیشی نوێژەو، گەورەترین پلەو سەرتۆپیشی (جیهاد)ە).

وە دەفەرموێت: (إنّ في الجنة لماة درجة، ما بين الدرجة والدرجة كما بين السماء والأرض، أعدها الله للمجاهدين في سبيله) متفق عليه.

واتە: (لەنێو (بەهەشت)دا صەد پلە هەن، نێوانی پلەیەكیان بۆ ئەوی دیكە وەك نێوانی ئاسمان و زەوی وایە، جا ئەو بەهەشتە خوای گەورە بۆ تێكۆشەرانی ڕێگەی خۆی ئامادەی كردووە). وە دەفەرموێت: (من اغبرت قدماه في سبيل الله حرمهُ الله علٰى النار) رواه البخاري. واتە: (هەركەس لە جیهاددا قاچەكانی تۆزاوی بن، ئەوە خوا ئاگری دۆزەخی لەسەر قەدەغە دەكات)!!.

وە پێغەمبەری ڕابەرو سەروەر لە جێگایەكی دیكەدا دەفەرموێت: (رباط يوم وليلة في سبيل الله خير من صيام شهر وقيامه وإن مات أجري عليه عمله الذي

---

[1] تەفسیری قورئانی پیرۆز (مامۆستا مەلا عوسمان–خوا لێی خۆش بێت–) بەرگی ٦ لاپەرە ٣٩. وەرگێڕ.

كان يعمله، وأجري عليه رزقه، وأمن الفتان) رواه مسلم. واته: (ئێشکگرتنی ڕۆژو شەوێك لە پێناوی خوادا لە ڕۆژوگرتنو شەو نوێژی مانگێك خێرترە، وە ئەگەر تێیدا وەفاتی کرد، ئەوە ئەو کردەوەیەی کە دەیکرد تا ڕۆژی دوایی بۆی بەردەوام دەبێت، وە لەبەهەشتەوە ڕۆزی خۆی بۆ دێتو، لە ئازاری نێو گۆڕو فیتنەی (نکیر) و (مونکیر)یش ڕزگاری دەبێت)!! وە هەم دەفەرموێت: (رباط يوم في سبيل الله، خير من ألف يوم فيما سواه من المنازل) رواه الترمذي والنسائي والدارمي وأحمد. واته: (ئێشکگرتنی ڕۆژێك لەپێناوی خوادا، لە خواپەرستی هەزار ڕۆژی جێگاکانی دیکە چاکترە)!!

وە پێغەمبەری سەروەر ﷺ دەفەرموێت: (عينان لا تمسهما النار، عين بكت من خشيه الله، وعين باتت تحرس في سبيل الله) قال الترمذي: حديث حسن. واته: (دووچاو هەن ئاگریان ناگاتێ، چاوێك لە ترسی خوا بگریو، چاوێکیش شەو نەخەوێو لە ڕێگەی خودا پاسەوانی ئەنجام بدات).

وە لە (موسنەد)ی ئیمام (احمد)دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (حرس ليله في سبيل الله، أفضل من ألف ليله يقام ليلها ويصام نهارها). واته: (پاسەوانی شەوێك لە جیهاددا، لە هەزار شەو کە شەوەکەی شەو نوێژی تیا بکرێو ڕۆژەکەشی ڕۆژوی تیا بگیرێ باشترە)!!.

وە لە صەحیحی (بوخاریو موسلم)دا هاتووە کە: (پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێبدە سەبارەت بە کردەوەیەك کە وەك جیهادکردن وابێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ توانای ئەنجامدانی ئەو کردەوەیەت نیە. پیاوەکەش وتی: بەڵکو تۆ هەر پێم بڵێی؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئایا لەو کاتەدا بابای موجاهید دەردەچێ بۆ جیهاد، تۆش دەتوانی بە ڕۆژووبیتو نەیشکێنیو، شەونوێژ بکەیتو وازی لێنەهێنیو، بێزار نەبیت؟!! پیاوەکەش وتی: نەخێر شتی وا ناتوانم. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: دەی هەر ئەوەی کە باسم کرد دەگاتە پلەی جیهاد)!!

وەپێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت: (إن لكل أمةٍ سياحةً، وسياحةُ أُمتي الجهاد في سبيل الله) رواه أبوداود. واتە: (هەموو ئوممەتێك گەشتو گوزارو سەیرانی خۆی هەیە، سەیرانی ئوممەتەکەی منیش جیهادە).

شایانی باسە: باسی گەورەیی و پاداشتی جیهاد باسێکی زۆر فراوانەی پێم وایە لە تەرازووی (قورئان و سوننەت)دا هیچ کام لە کردەوە چاکەکان پاداشتیان وەك پاداشتی (جیهاد) باس نەکراوە!!.

وە ئەگەر مرۆڤ سەیر بکات و تێرامێنێ، لە مەیدانی (واقع)دا دەردەکەوێ کە زۆر وایە، چونکە سودو کەڵکی جیهاد لە دین و دونیادا بابای موجاهید تەنها بۆ خۆی نیە، بەڵکو بۆ گشت موسڵمانانە، وە (جیهاد) هەموو عیبادەتە نهێنیێ و ئاشکراکانی دیکەی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، چونکە جیهاد خۆشەویستی خواو دڵسۆزیو یەکلابونەوە بۆ خواو پشت بەستن بە خواو، تەسلیمکردنی گیان و ماڵ بەخواو، ئارامگرتن و، دونیا بە کەم گرتن و یادی خواو، زۆرێکی دیکەش لە کردەوە چاکەکانی دیکەی لە خۆ گرتووە، بەشێوەیەك هیچ کردەوەیەکی دیکە وا لە خۆیانی ناگریێ و تێیدا کۆ نابنەوە!!

وە (موجاهیدان)ی ڕێگەی خوا ﷻ لە ئاستی تاك یان کۆمەڵ - هەمیشەو هەردەم ئەوەتان لەنێوان دوو نیعمەتی مەزندا، کە ئەویش (سەرکەوتن و سەربەرزی) یان (بەهەشت و شەهیدی)یە.

وە مرۆڤەکان بە گشتی ژیان و مردنیشیان هەیە، دەی بە ڕاستی ژیان و مردنی سەربەرزانە نەنها لەنێو جیهاددایە، وە لەملایشەوە لەیادکردن و دەست هەڵگرتن لە جیهاد مایەی لە دەستدان یان نوقسان بوونی سەربەرزیو سەرکەوتنی دونیاو قیامەتە. چونکە دەبینی هەندێ خەڵك هەن خۆیان مەشغوڵ دەکەن بە جۆرە کردەوانێکەوە -کە زۆر گران و ناڕەحەتیشن- لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژیان کەمەو زێدەجاریش تێیاندا تووشی مردن دەبن، دەی لەملاشەوە (جیهاد)کردن لە هەموو کردەوەیەکی توندو ناڕەحەت پەرێزی زۆرترە، وە مردنی

(شەهیدییانە)ش ئاسانترین‌و بەفەڕترین مردنە، جا ئەگەر لە بنچینەدا مەبەست لە جەنگ جیهاد بێ‌و، تاکە مەبەستیش لەو جیهادە ئەوە بێت کە ملکەچی هەرهەمووی بۆ خوا بێ‌و وشەی خوا سەرکەوتوو بێت.. بۆیە هەرکەس ببێتە لەمپەرو بەربەست لەبەردەم ئەو مەبەستەدا –واتە: دین تەنها بۆ خوا بێت– ئەوە بەیەکدەنگی هەموو زانایان دەبێت بکوژرێت. بەڵام لە بێبڕواکان ئەوانەیان کە توانای بەربەست دروستکردن‌و گوشتاریان نیە، وەك: ئافرەت‌و منداڵ‌و پیرەپیاوی پەککەوتەو کوێرو نەخۆش‌و نمونەی ئەمانە... ئەوە لەلای (جمهوری) زانایان نابێت بکوژرێن، مەگەر لەکاتێکدا ئەوانیش بەقسەیان کردەوە بجەنگن، لەملاشەوە هەندێك لە زانایان پێیان وایە کە (ئافرەت‌و منداڵ)ی لێ بەدەرکە کوشتنی ئەوانی دیکە (موباح)ـە، چونکە ئەهلی (کوفرن). بەڵام ڕای یەکەم پەسەندترە، لەبەرئەوە جیهاد دژی ئەوانەیە کە شەڕ دەکەن‌و دەجەنگن دژی ئەوانەی کە دەیانەوێ بەرنامەی خوا سەرخەن، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: (وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ)(البقره: ١٩٠)

واتە: (لەپێناوی خوادا بجەنگن لەگەڵ کەسانێکدا کە دژتان دەجەنگن، وەدەستدرێژی‌و زێدە ڕەوی مەکەن، چونکە خوا دەستدرێژکارانی خۆش ناوێت). وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەیەکێك لە شەڕەکانیدا بەلای ئافرەتێکی کوژراودا تێپەڕی کردو سەیریکرد خەڵکی بەسەریەوە وەستاون، لەو دەمەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نەدەبوو ئەم ئافرەتە بکوژرابایە)، وە بەیەکێك لە هاوەڵەکانی فەرموو: بڕۆ بۆ لای (خالد)و پێی بڵێ: با منداڵ‌و کرێ گرتە نەکوژێ) رواه ابن ماجه واحمد. وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جێگایەکی دیکەدا دەفەرموێت: (لا تقتلوا شيخاً فانياً، ولا طفلاً صغيراً، ولا إمرأةً) رواه أبوداود. واتە: (پیرە پیاوی پەککەوتە مەکوژن، بەهەمان شێوە منداڵی بچوك‌و ژنیش).

ئەمەش لەبەرئەوەیە کە خوای میهرەبان تەنها لەبەر چاکسازیو بەرژەوەندی مرۆڤایەتی کوشتنی بێبڕواکانی (موباح) کردووە، وەك دەفەرموێت: (والفتنة اکبر من القتلِ) (البقرة:٢١٧) واتە: (کوشتنو کوشتار ئەگەرچی خراپەو مایەی تێکچوونە، بەڵام ئەو خراپەو (فەسادە)ی لە (فیتنە)ی بێبڕواکاندا هەیە، لە (کوشتنو کوشتار) گەورەترە).

جا بۆیە هەر بێباوەڕێك بەربەست لەبەردەم موسڵماناندا دروست نەکات بۆ بەرپاکردنی بەرنامەی خوا، ئەوە زەرەرو زیانی بێبڕوایەکەی تەنها بۆ خۆیەتی، هەر بۆیەش شەرعزانان دەفەرموون: ئەو کەسەی کە بانگهێشتی خەڵکی دەکات بۆلای (بیدعە) سزاکەی وەك ئەو (بیدعە)چیە نیە کە تەنها خۆی بیدعە دەکاتو خەڵکی بۆ بانگ ناکات.

هەر بۆیەش دەبینی لەکاتێکدا کە بەرنامەی خوا کوشتاری بێبڕواکانی (واجب) کردووە، کەچی ئەوانەیان کە بەردەست دەکەون کوشتنیانی (فەرز) نەکردووە، بەڵکو ئەگەر لە (قیتال)دا یان لە غەیری قیتالدا یەکێکیان لێ (ئەسیر) کرا، ئەوا پێشەوای موسڵمانان لەم چەند خاڵە کامیان بەرژوەندیترو چاکترە ئەوەیان هەڵدەبژێرێت:

یەکەم: کوشتنیان.

دووەم: کردنیان بە کۆیلە -خزمەتکار-.

سێیەم: بەرەڵاکردنو ئازادکردنیان.

چوارەم: گۆڕینەوەیان بەو ئەسیرە موسڵمانانەی کە لەلای دوژمنن.

پێنجەم: ئازادکردنیان بەپارە.

شایانی باسە ئەمەش بۆچوونی زۆربەی شەرعزانەکانەو (قورئانو سوننەت)ی پێغەمبەریش ﷺ لەسەری بەڵگەن.

بەڵام جولەکەو گاورو ئاگرپەرستەکان (الیهود + النصاری + المجوس) ئەوە دەبێ بکوژرێنو هەردەم شەڕیان لە دژ بکرێ هەتاوەکو موسڵمان بن، یان

(سەرانە) بدەن و لە وڵاتی موسڵماناندا دانیشن. بەس غەیری جولەکەو گاورو ئاگرپەرستان، زانایان جیاوازییان هەیە لەوەدا کە: ئایا سەرانە (الجزیە)یان لێ وەردەگیرێت؟ زۆربەی زانایان پێیان وایە: لە (عەرەب) نابێت سەرانە وەربگیرێت. وەپێویستە بزانرێت کە:

هەر دەستەیەك خۆی بە موسڵمان بزانێ و لەگەڵ ئەوەشدا پاشگەز بێتەوەو (ئینکار)ی لەیەکێك لە یاسا ئاشکراو ڕونەکانی ئیسلام بکات..ئەوە بەیەك دەنگی هەموو زانایان کوشتارکردن و هەڵگیرسانی جەنگ لە دژیان (واجب)ە، بۆ ئەوەی (دین) تەنهاو تەنها بۆ خوا بێت، هەروەك دەبینی هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ بەسەرکردایەتی (ئەبوبەکری صدیق) -خوای لێ ڕازی بێت- ئەوانەی کە زەکاتیان نەئەدا جەنگ و کوشتاریان لەگەڵدا بەرپاکردن، تەنانەت لەسەرەتاوە هەندێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ئاست شەڕکردن لەگەڵیاندا دوودڵ بوون و تێیدا وەستان، پاشان ئەوانیش یەك دەنگی خۆیان دەربڕی، تەنانەت (عومەر) -خوای لێ ڕازی بێت- بە ئەبوبەکری صدیقی وت: تۆ چۆن ئەم خەڵکە دەکوژی و لەگەڵیان دێیتە شەڕ، لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکی بێمە شەڕ، هەتاوەکو بڵێن (لا اله الا الله- محمد رسول الله) جا ئەگەر ئەو شایەتییەیان دا، ئەوە ئیتر خوێن و ماڵیان پارێزراوە، مەگەر شتێکیتر کە ماف ئەو شایەتمانە بێت، وە پاش ئەوە حیسابیان لەسەر خوایە؟!! ئەبوبەکریش لەوەڵامدا بە (عومەر)ی -خوا لەهەردوکیان ڕازی بێت- وت: دەی (زەکات)یەکێکە لە مافەکانی (شایەتمان)، سوێند بەخوا ئەگەر (گیسکێك) کە جاران بە (زەکات) دەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ ئێستە بە منی نەدەن، ئەوە لەسەری دێمە شەڕو دەیانکوژم) جا (عومەر) - خوای لێ ڕازی بێت- دەفەرموێ: سوێند بە خوا لە دوایدا بۆم دەرکەوت کە ئەمە تەنها خوایە دڵی ئەبوبەکری بۆ قیتال فراوان کردووە، بۆیە بۆم دەرکەوت کە تەنها بۆچوونەکەی ئەو حەقە.

بیۆه (قاعیده)یەك كه به (قورئان) و (سوننەت) و (ئیجماع)ی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ جێگیر بووه كه: هەر تاقمو كۆمەڵێك لەبەرنامەی ئیسلام دەرچن، دەبێ جەنگو (قیتال)یان له دژ بەرپا بكرێت، ئیتر ئەگەرچی به زوبان (شایەتمان)یش بهێنن، بەڵام زانایان سەبارەت به (كۆمەڵی له ئیسلام دەرچوو) جیاوان كه ئەگەر سوننەتێكی موئەكەدەیان واز لێهێنابوو، وەك دوو ڕكعاتی پێش نوێژی بەیانی، ئایا لەسەر ئەوه شەڕ لەگەڵكردنیان (جائیزه)؟ جا دەبنه دوو بەشەوه، كۆمەڵێك دەڵێن: بەڵێ دەبێ جەنگیان لەگەڵ بكرێت، هەندێكیشیان دەڵێن نابێت.

بەس ئەگەر واز بێنن له ئەنجامدانی هەندێ (واجبات) یان نەكردنی هەندێك (محرمات) له كاتێكدا كه (واجب) و (حەڕام)ییەكەیان ڕوونو ئاشكرا بێت.. ئەوه بەیەكدەنگی زانایان دەبێ لەسەر ئەوه (قیتال)یان له دژ بەرپا بكرێت، هەتاوەكو بێنو ملیان بۆ دوا بەیەكی فەرمانەكانی ئیسلام كەچ بكەن.

جا ئەمانه كاتێك جەنگ لەگەڵكردنیان (فەرز) دەبێت كه بەرپاكردنی بەڵگەیان لەسەر كرابێت، لەم لاشەوه ئەگەر ئەمان دەست پێشخەربوونو ئاگری جەنگیان هەڵگیرساند، ئەوه ئیتر جەنگ لەگەڵكردنیان دووپاتو ڕوونو ئاشكرابه!.

وه شایانی باسه: گەورەترینو مەزنترین جیهاد، جیهادی بێبڕوایانو ئەوانەیه كه پاشگەز (مورتەد) بونەتەوەو وازیان له هەندێك یاساو دروشمی بەرنامەی ئیسلام هێناوه، وەك: ئەوانەی زەكات نادەنو....هتد.

وه هەركات دوژمن ویستی هێرش بكاته سەر موسڵمانان.. ئەوه بەرەو ڕوو وەستانو بەرپەرچدانەوەی لەسەر ئەوانەی هێرشیان بۆ كراوەو لەسەر غەیری ئەوانیش دەبێته فەرزی (عەین). چونكه ئەوانەی هێرشیان بۆ نەكراوه، لەسەریان فەرزه كۆمەكی هێرش بۆ كراوەكان بكەن، هەروەك خوای گەوره دەفەرموێت: (وَإِنْ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمْ النَّصْرُ)(الأنفال:٧٢) واته: (ئەگەر لەسەر دین موسڵمانان داوای سەرخستنو كۆمەكیان لێكرنن.. ئەوه لەسەرتانه كۆمەكیو یارمەتییان بدەن).

جا ئەو موسڵمانانە لەوانەبن کە ناویان نوسراوەو کریٰ وەردەگرن، یان واش نەبن وەك یەك وایە. وە ئەو بەرگریو بەرپەرچدانەوەیە لەسەر تاك تاکی موسڵمانان فەرزە، ئیتر بە گوێرەی تواناو بۆ گونجان بە داراییو گیانیان.. ئەو جیهادەیان لەسەر فەرزە لەگەڵ کەموزۆردا، لەگەڵ سوارو پیادەدا، هەروەك موسڵمانان کاتێك لەشەڕی خەندەقدا دوژمن هێرشی بۆ هێنان، لەو کاتەدا خوای گەورە مۆڵەتی دانیشتنی کەسی نەداو بەرگرییەکەی لەسەر هەر هەموویان فەرز کرد، تەنانەت زر لۆمەو سەرزەنشتی ئەوانەشی کرد کە دەهاتن مۆڵەتیان لە پێغەمبەر ﷺ دەخواست بۆ دانیشتنیان لە (جیهاد)ەکە وەك خوای گەورە ئاماژەد بۆ هەندێك لەوانە دەکاتو دەفەرموێت: (يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلاَّ فِرَارًا)(الأحزاب:١٣) واتە: (دەهاتنو بۆ نەچوونیان بۆ جیهادەکە مۆڵەتیان لە پێغەمبەر ﷺ دەخواستو دەیانوت: ئێمە ماڵەکەمان لە پەڕی شارەوەیەو بەدەرەوەیە، بەڵام وا نیەو ماڵەکەیان بەدەرەوە نیە، بەڵکو ئەمانە دەیانەوێت ڕابکەنو خۆیان لەشەڕەکە قوتار بکەن)!! بەڵام ئەو کۆمەڵو تاقمانەی کە بەرنامەی خوا بەرپەرچ نادەنەوە، وە ئەوانەی کە لە وڵاتی موسڵماناندا دەژین.. ئەوە (فەرزە) کە پابەند بکرێن بەهەر پێنج بنەماکەی ئیسلامەوە، وە بەهەمان شێوە هەندێ (واجبات)ی تریش وەك: گێڕانەوەی ئەمانەت: وەفا بە پەیمان....و غەیری ئەمانەش. بۆ نمونە: هەریەکەیان –چ ژن چ پیاو– ئەگەر نوێژنەکەر بوو ئەوە دەبێت فەرمانی نوێژکردنی پێبکرێت، جا ئەگەر لەسەر نوێژ نەکردن هەر بەردەوام بوو، ئەوە بە کۆڕا (اجماع)ی زانایان دەبێت سزا بدرێت هەتاوەکو دەست دەکاتەوە بە نوێژکردن، وە زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەگەر هەر نوێژی نەکرد، ئەوە کوشتنی (واجب)ـە، بۆیە داوای تەوبەو گەڕانەوەی لیٰ دەکرێت، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا باشەو ئەگەر نەیشیکرد ئەوە دەبێت بکوژرێت.

## ئایا نوێژچوێنەر –تارك الصلاة- بە فاسقی دەکوژرێت؟ یان مورتەددیی؟ یان بە کافریی...؟!

لە ڕێڕەوی ئیمام (احمد)و غەیری ئەویشدا دوو قسەی لەسەرە، بەڵام ئەوەی کە زۆرینەی (سلف) پێشینان وان لەسەری ئەوەیە کە: بە کافریی دەکوژرێت.

تێبینی: ئەمە لە کاتێکدا زانایان تێیدا جیاوازن کە ئەگەر دانی بە (واجب)بوونی نوێژدا دەنا، بەڵام ئەوەی کە (ئینکاری) (فەرز) بوونی نوێژ بکات، ئەوە بەیەك دەنگی هەموو زانایان پێی (کافر) دەبێت، بەڵکو سەرپەرشتکاری منداڵ (واجب)ە لەسەری کە لەتەمەنی (حەوت)ساڵیدا فەرمانی نوێژکردن بە منداڵەکەی بکات، وە هەر کات گەیشتە تەمەنی (١٠) دە ساڵی دەبێت لەسەر نوێژنەکردن لێی بدات، هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (مرهم بالصلاة لسبع، واضربوهم عليها لعشر، وفرقوا بينهم في المضاجع) رواه ابوداود.

واتە: (لە تەمەنی حەوت ساڵیدا فەرمانی نوێژکردن بە منداڵەکانتان بکەن، وە لەتەمەنی دە ساڵیدا لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەنو لەنێو جێگەی خەوتنیشدا لەیەکتر جیایان بکەنەوە).

وە پێویستە فەرمان بە ئیمامی مزگەوتەکان بکرێت کە: وەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکرد، ئاوا نوێژ بۆ خەڵکی بکەن، هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (صلوا كما رأيتموني أصلي) رواه البخاري.

واتە: (وەك چۆن منتان بینی نوێژم دەکرد، ئێوەش ئاوەها نوێژ بکەن) وە ئەوەی دەبێتە پێشەوای خەڵك –چ لە نوێژو چ لە غەیری نوێژدا– پێویستە هەمیشە سەیری خەڵکەکە بکاتو ئاگای لێیان بێتو شتێك کە بەم دەکرێت لەبەرژەوەندی دینی ئەواندایە نەیفەوتێنێو وازی لێ نەهێنێ. بەهەمان شێوە ئەوەی کە دەبێتە ئیمامی خەڵکی لە (حەج)دا یا ئەوەی لێپرسراویانە لە

(جیهاد)دا. هیچ جیاوازی نیەو دەبێت ڕەچاوی ئەو خاڵانە بکات. چونکە تێڕامینە: ئەو کەسەی دەبێتە وەلی یان وەکیلی کابرایەك لەسەودایەکدا. لەسەری پێویستە کە چۆن بەرژەوەندی پارەو سامانی خاوەن ماڵەکەی تێدایە دەبێت وا بکات.. ئەمە لە ئیشێکی دنیاییدا!! دەی بێگومان ئیش‌و کاری دینی زۆر بەڕێزترو گەورەترەو ڕەچاوکردنیشی حەوتجار شایستەترە.

وە بێگومان هەرکات (لێپرسراوان) هۆگربوون‌و تێکۆشان بۆ چاکسازی‌و (اصلاح)کردنی (دین)ی خەڵکی.....ئەوە خوای گەورە دین‌و دنیای هەموو لایەك چاك‌و مسۆگەر دەکات،بەلام ئەگەر وانەبوو،ئەوە ئیشوکاری هەموو لایەك تێك دەچێت و ئاڵۆز دەبێت.

وە تاکە فاکتەری اصلاحی دین‌و دنیای خەڵکی دەگەڕێتەوە بۆ سێ شت:

یەکەم: نیاز چاکی قواعید.-جیلی خوارەوە-.

دووەم: گێڕانەوەی دین هەرهەمووی بۆ خوا.

سێهەم: پشت بەستن تەنها بە خوا.

چونکە بەڵگە نەویستە (نیاز پاکی‌و پشت بەستن تەنها بە خوا) تاکە هۆکاری ئیصلاح بوونی هەموو توێژەکانی خەڵکییە.

هەروەك خوای گەورە فەرمانی بەهەموو لایەکمان کردووە کەلە نوێژەکانماندا بڵێین (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) (الفاتحه:٥) واتە: (خودایە تەنها تۆ دەپەرستین‌و تەنها پشت بە تۆ دەبەستین).هەندێك لە زانایان ووتویانە: ئەم دوو وشەیە: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) کۆکەرەوەی نێوەرۆکی هەموو کتێبە ئاسمانی‌یەکانن. وەلەزۆر شوێنی ئەم قورئانە پیرۆزەدا خوای گەورە ئەم دوو وشەیەی پێکەوە گرێداوە، وەك دەفەرمووێت: (عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ) (هود:٨٨) .

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکاتێك قوربانی سەربڕیبایە دەیفەرموو: (اللهم منك و لك) رواه أبو داود و ابن ماجه . وە شایەنی باسە سێ خاڵ هەن گورەترین یارمەتیدەرن بۆ لێپرسراو بە تایبەتی و غەیری ئەویش بە گشتی ، کە ئەمانەن:-

یەکەم: نیازپاکی‌و خۆ یەکلاکردنەوە بۆ خوا، پاشان پشت بەستن تەنها بەخوا، بنچینەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پابەندبوون‌و چاودێریکردنی نوێژەکان بەدڵ و بەجەستە.

دووەم: چاکە کردن لەگەڵ خەڵکیدا بە سود پێگەیاندنیان و پشتگیری کردنیان. سەرچاوەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ (زەکات)و ماڵ بەخشین.

سێهەم: ئارامگرتن‌و دان بەخۆداگرتن لەئاقار ئەزێتدانی خەڵکی. هەر بۆیەش دەبینی خوای زاناو توانا زۆرجاران باسی (نوێژ) و (ئارامگرتن)ی پێکەوە هێناون. وەك دەفەرمووێت: (وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ) (البقرە:٤٥). واتە: ( پشت بە ئارامگرتن و نوێژکردن ببەستن).

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرمووێت: (وَأَقِمْ الصَّلاَةَ طَرَفِي النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنْ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ(١١٤) وَاصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ)(البقرة:١١٤-١١٥). واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)لە هەردوو لای ڕۆژ و ساتێکی شەودا نوێژبکە،بەڕاستی کردەوە چاکەکان - نوێژەکان- کردەوە خراپەکان لادەبەن‌و ڕایاندەماڵن، ئەمەش یادخستنەوەیەکە بۆ ئەوانەی هەمیشە یادی پاداشت‌و سزای خوا دەکەن. وە ئارامیش بگرە، چونکە بەڕاستی خوا پاداشتی چاکە کاران بەفیڕۆ نادات)[1].

---

[1] دەربارەی ئەم دوو وشەیە (طرفي النهار) و (زلفا من الليل) چەند ڕایەك هەیە، کە ئایا مەبەست پێیان کام نوێژانەیە؟ جا بۆ زیاتر شارەزابوون سەیری ئەم تەفسیرە نایابە بکە: تفسير الطبري م٧ ص١٢٤-١٢٥. وەرگێڕ.

وه له شوێنێکیتردا پەروەردگار دەفەرموویت:( فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا )(طه:١٣٠). واته: (ئەی موحەمەد (ﷺ) ئارام بگرە لەسەر ئەو هەموو پڕوپاگەندەیەی کە بێبڕواکان پێتی دەڵێن، وە بەردەوام پێش خۆرهەڵهاتن و پێش ئاوابوونی نوێژ بکەو ستایشی پەروەردگار بکە)[1] وە بە هەمان شێوە لەسورەتی(ق)یشدا دەفەرموویت: ( فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ) (ق:٣٩). شایەنی باسە : لەم قورئانە پیرۆزەدا خوای گەورە زۆرجار (نوێژ)و (زەکات)یشی پێکەوە گرێداوە.

لە ڕاستیشدا تەنها بەڕاپەڕاندنی (نوێژ) و(زەکات) و (ئارامگرتن) حاڵی سەرکردەو جوندی موسڵمانان (ئیصلاح) دەبێت. چونکە هەریەك لە (نوێژ)و (زەکات)و (ئارامگرتن) چەندین ئاکاری بەرزو بەڕێز لەخۆدەگرن، بۆ وێنە: (نوێژ بەرپاکردن) وێڕای خۆی ئەم کردەوە جوانانەی دیکەشی لەخۆگرتووە: (یادی خوا، پاڕانەوە لە خوا، خوێندنی قورئان، یەکلاکردنەوەو پاکڕاگرتنی دین تەنها بۆ خوا، تەنها پشت بەستن بەخواو......هتد) هەروەها ماڵ بەخشین (زەکات)دانیش ئەم ئاکارانەی لەخۆگرتووە:(چاکەکردن لەگەڵ خەڵکیدا بە پارە وسامان،سەرخستن و پشتگیریکردنی ستەم لێکراوان و بە دەمەوەچوون و دڵدەدان و دەست بار بۆگرتنی بێنەواو مافخوراو، ئەنجامدانی پێویستیەکانی خەڵکی و...هتد) بێگومان ئەمانەش هەموویان لە کردەوە چاکەکانن، چونکە لە صەحیحی (بوخاری و مسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (کل معروفٍ صدقة). واتە(هەموو چاکەیەك لەگەڵ خەڵکیدا بە (صدقە) دەنوسرێت). ئەمەش هەموو بەخشینێك دەگرێتە

---

[1] توێژەرەوانی قورئان دەفەرموون: مەبەست بە پێشی خۆر هەڵهاتن نوێژی بەیانیەو، پێش ئاوابونیشی نوێژی عەسرە، تفسیر الطبري م٨ ص٤٧٦-٤٧٧. وەرگێڕ.

خۆی، ئەگەرچی بەوتەیەکی جوان‌و ڕوویەکی خۆشیش بێت لەگەڵیاندا.چونکە لە صەحیحی (بوخاری‌و مسلم)دا هاتووە کە (عەدی کوڕی حاتەم) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(مامنکم من أحد ألا سیكلمه ربه لیس بینه وبینه حجاب ولاترجمان،فینظر أیمن منه فلا یری إلا شیأً قدمه، وینظر اشأم منه فلا یری إلا شیأ قدمه، فینظر امامه، فیستقبله النار،فمن استطاع منكم أن یتقي النار ولو بشق تمرة فلیفعل، فإن لم یجد فبكلمة طیبة). واتە:(هیچ یەکێك لە ئێوە نییە مەگەر خوای پەروەردگار قسەی لەگەڵدا دەکات لە کاتێکدا نەپەردەیان لەنێواندا هەیەو نە وەرگێڕ، جا ئەو مرۆڤە لەو کات و ساتە سامناکەدا سەیری لای ڕاستی دەکات تەنها ئەوە دەبینێت کە پێشی خۆی خستووە ،وە ئاوڕ بەلای چەپیشدا دەدانەوە تەنها ئەوە دەبینێت کەوا پێش خۆی خستووە، جا لەو کاتەشدا سەیرێکی بەردەمی خۆشی دەکات، دەبینێ وا ئاگری دۆزەخ بەرەو ڕوی دێت، جاهەر کەستان دەتوانێت خۆی لەو ئاگرە بپارێزێت ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت با بیکات، ئەگەر نەیبوو ئەوە با بە وتەیەکی جوان و شیرین))!!.

بەهەمان شێوەش ئارامگرتن (الصبر) چەندین شوێنەوارو بەروبومو پەرێزی هەیە، لەوانە:

(دانگرتن بەخۆدا لە ئاقار ئەزیەتدانی خەڵکیدا، خواردنەوەی ڕق‌و کینەو دەرنەبڕینی، گیانی لێبوردن و چاوپۆشی لە مرۆڤەکان، سەرپێچی کردنی ئارەزوو ملنەدان بۆی و .....هتد).وەك پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَئِنْ أَذَقْنَا الإنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ(٩)وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ(١٠) إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ) (هود:٩-١١). واتە:( ئەگەر لە لایەن خۆمانەوە میهرەبانی بە مرۆڤ بنوێنین و ژیانی خۆش و ڕۆزی بۆ بەرفراوان بکەین،پاشان ئەو ڕۆزی و گوزەرانە خۆشەی لێ بسەنینەوە ، دەمو

دەس لە میهرەبانی خوا بێ هیوا دەبیٚو بێبڕوا دەبێتو شوکرانەی خواناکات.لەم لاشەوە ئەگەر تووشی خۆشیو خۆش گوزەرانی بکەین لە دوای ناخۆشیو تەنگی ژیان کەبەسەری هاتبێت یەکسەر بەلەخۆبایبونێکەوە دەڵێت:تازە ناڕەحەتیو تەنگو چەڵەمەی دونیالای من باری کردووە و نەماوە،جابۆیە زۆر خۆشحاڵ دەبیٚو فەخردەکات و تووشی لەخۆبایبوون دەبێت. تەنها ئەوانە بەو چەشنە نین کەلە هەردووکاتدا-خۆشیو ناخۆشی.ئارامگرو خۆگرو هەردەم کردەوەچاکەکان ڕادەپەڕێنن، جابەڕاستی ئەو کەسانە لێبوردن و پاداشتی گەورەی خوایان بۆ مسۆگەرە)[1]

وە پەروەردگار بە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ) (الأعراف:١٩٩). واتە: (ئەی محمد (ﷺ) ئەوەی ئاسانە لە خەڵکی وەربگرە- واتە زۆرچاوەڕوانیت لێیان نەبێت-،فەرمان بەچاکە بکە و پشتیش لە نەفامان بکە.)[2]

وە دەفەرموویێت: (وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ(١٣٣)الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنْ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) (الأعراف:١٣٣-١٣٤). واتە: (ئەی موسڵمانان بکەونە پێشبڕکیٚ کردن بۆ وەدەست خستنی لێبوردنی پەروەردگارتان بەهەشتێك کە پانتاییەکەی وەك پانایی ئاسمانەکان و زەوی وایە و بۆ پاریزکاران ئامادەکراوە. ئەوانەی کە هەمیشە و بەردەوام لە خۆشی و ناخۆشیدا ماڵ دەبەخشن، وە ڕقی خۆیان دەگرن و دەی خۆنەوە و لەبەر خوا لەخەڵکیش دەبوورن، بەڕاستی خوا چاکەکارانی خۆش دەویٚ).

---

[1] تفسير الطبري م٧ ص ٩-١٠. وەرگێڕ.

[2] تفسير الطبري م٧ ص ٩-١٠. وەرگێڕ.

وە خوای پەنهان بێن لە جێگایەکی دیکەدا دەفەرموویێت: (وَلاَ تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلاَ السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ(٣٤)وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ) (فصلت:٣٤-٣٥). واتە: (چاکەو خراپە وەك یەك نین بەڵکو جیاوازییان زۆرە، بۆیە هەرکەس خراپەی لەگەڵکردی تۆ بەچاکە لەگەڵ کردن بەرپەرچی بدەرەوەو لە خۆتی دوورخەرەوە، جا دەبینی کە ئەوەی لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتییەك هەبووە وەك دۆستێکی خۆشەویستی لێدێت. بەڵام کەسانێك دەگەن بەو پلەیە -کە ئاوا ڕەفتار لەگەڵ خەڵکی بکەن-کە خاوەنی خۆگرتن و ئارامگرتنن-چونکە لەسەر دەروون گرانە-وە ئەو کەسانە پێی دەگەن کە لە دونیا و دواڕۆژدا خاوەنی بەشێکی فراوان و گەورەن)[1]

وە دەفەرموویێت: (وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ)(الشورى:٤٠). واتە: (سزای خراپە خراپەی وەك خۆیەتی، بەڵام هەرکەس ئەگەر یەکێکی تر خراپەی لە ئاقاربکات و ئەم لێی ببورێت و تۆڵەی لێنەسێنێتەوە لە کاتێکدا بشتوانێ،وە چاکسازی بکات، ئەوە پاداشتەکەی لای خوای گەورەیە، بەڕاستی خوا ستەم کاران و دەست درێژکارانی خۆش ناوێت).

(حەسەنی بەصری)-ڕەحمەتی خوای لێبێت-دەڵێت:کاتێك کەڕۆژی دوایی دێت....بانگدەرێك لە (عەرشەوە) بانگ دەکات و دەڵێت: خەڵکینە بائەوەی کە پاداشتی لەسەر خوا (واجب)ە هەستێت، جالەنێو خەڵکدا تەنها ئەوانە هەڵدەستن کە خاوەنی لێبوردەیی و چاکسازی بوونە.!!!!

---

[1] مختصر تفسير إبن كثير م٣ ص٢٦٤.

# ئاگاداركردنەوەيەكی گرنگ

پێویستە بزانرێت كە: دڵپاكیو چاكە كردن لەگەڵ خەڵكیدا بریتی نییە لەوەی هەرچییەك ئەوان پێیان باشبێت و پێی خۆش حاڵبن ئیتر پێشەوای موسڵمانان بیكاتو هەرچییەكیش ئەوان پێیان ناخۆش و گران بێت دەستی لێ هەڵگریو توخنی نەكەوێت.بەڵكو پەروەردگار دەفەرمووێت: (وَلَوْ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتْ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ). (المؤمنون:٧١)

واتە: (ئەگەر خوا شوێنی ئارەزو و ویستی خەڵكی بكەوێت و وەڵامی تێكڕای ئارەزووەكانیان بداتەوە، ئەوە ئیتر ئاسمانەكان و زەوی و هەرچیش تێیاندایە تێك دەچێت). وە پەروەردگار بە هاوەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنْ الأَمْرِ لَعَنِتُّمْ) (الحجرات:٧). واتە: (ئاگاداربنو بزانن كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نێوانتاندایە، جا ئەگەر بێتو لەزۆربەی كاروبارەكاندا بەگوێتان بكاو بۆچونی ئێوە وەربگرێت ئەوە توشی ناخۆشی و هەڵدێریتان دەكات). بەڵكو چاكەكردن لەگەڵ خەڵكیدا ئەوەیە كە:هەرچییەك سود بە (دین)و دونیایان دەگەیەنێت ئەوەیان بۆ مسۆگەر بكرێت، ئیتر ئەوەی كەپێی گرانە و پێی دڵ تەنگە باهەر پێی ناخۆش بێت،بەڵام ئەوەندەیە پێویستە لە گۆڕینی ئەو شتەدا كەمایەی ناخۆشی ئەوانە پێشەوای موسڵمانان نەرمونیان بێت لەگەڵیاندا. چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (ماكان الرفق في شيء إلازانه، ولا كانا لعنف في شيء إلا شانه). رواه البخاري و مسلم. واتە: (نەرمونیانی لەهەرشتێكدابووبێت جوانی كردووە،وە توڕەیی و هەڵچونیش لە هەرشتێكدابووبێت هەر ناشرینی كردووە).

وەلەشوێنێكی تردا دەفەرمووێت: (إن الله رفيق يحب الرفق،ويعطي على الرفق مالا يعطي على العنف)) رواه مسلم. واتە: (خوا بەبەزەیی و نەرم

**ونیانه و نەرم و نیانیشی خۆش دەوێت،وە ئەوەی بەهۆی نەرم ونیانییەوە دەیبەخشێت،بەهۆی توڕەیی و هەڵچونەوە نایبەخشێت))!!.**

**(عومەری کوڕی عبدالعزیز)-ڕەحمەتی خوای لێبێت-دەڵێت:سوێند بەخوا دەمەوێت تالآیی نێو(حەق ووتن) دەربهێنم،بەلآم دەترسێم بەهۆیەوە خەڵك له (حەق)ەکە بسلەمێتەوە،بۆیە چاوەڕوان دەکەم هەتاوەکو شتێکی، شیرینی دونیایی بێتە پێشەوە، جابۆیە ئەگەر خەڵکی لە ئاقار تاڵیەکە بسلەمێنەوە و ڕاکەن....ئەوە لەبەر شیرینیەکە هێور دەبنەوە.[1]**

**ئەگەر تێڕامێنین دەبینین پێغەمبەری پێشەواو ڕابەر (ﷺ) هەر بەو شێوەیە لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتی کردووە، بۆنمونە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر یەکێك بهاتبایەو داوای پێویستیەکی لێ بکردایە نەیدەگێڕایەوەو ئەگەر دەستی بدایە ئەوە پێویستیەکەی بۆ ئەنجام دەداو،ئەگەر نەش بوایە ئەوە قسەیەکی شیرینو خۆشی لەگەڵ دەکرد.ئەوەتا جارێکیان هەندێك لەخزمەکانی هاتنە خزمەتیو داوای ئەوەیان لێکرد کەلەماڵی زەکاتو (صەدەقات)بەشی ئەوانیش بدات، ئەویش لەوەلآمدا پێی فەرموون: (إن الصدقة لاتحل لمحمد ولا لآل محمد). رواه النسائیو الدارمیو مالك. واتە: (صەدەقە -زەکات- نە بۆ (محمد)و نەبۆ کەسوکاری (محمد) حەڵاڵ نییە). بۆیە زەکاتی پێنەدان، بەلآم لەملاوە لەبری زەکات ماڵی دەستکەوت (الفیء)ی بۆ دیاریکردن کەپێیان بدات!!..**

**وەجارێکیشیان ئیمامی (عەلی وزەید و جەعفەر)-خوایان لێ ڕازیبێت-هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەریەکەیان داوای ئەوەی دەکرد کە ئەو کەلوپەلەی**

---

[1] خوێنەری خۆشەویست: مەبەست لەوەیە ئەو شتە خراپانەی کە خەڵکی ئولفەتیان پێوە گرتوون نابێت بۆیان بخرێتە قەڵەمڕەوی شەرعەوە، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا لە گۆڕینیدا دەبێت خاوەن نەرمونیانی بینو زوو هەڵنەچینو بێ سەلیقە نەبین، حەق گوتن تاڵەو هەموو کەس قبوڵی ناکات. وەرگێڕ.

کچەکەی (حمزە)-خوالێی ڕازیبێت-کەلەپاش خۆی بەجێی هێشتووە بۆخۆی بێت. بەلاّم پێغەمبەری خوا(ﷺ)بە هیچ کامیانی نەدا، بەڵکو بڕیاریدا بدرێتە پوری کچەکە. ئەنجا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لێنەگەڕا هەروا بگەڕێنەوە، بەڵکوو دەرِوونی هەریەکەیانی بەووشەیەکی شیرین و جوان پاك کردەوە، ئەوەبوو بە(علی)-خوالێی ڕازیبێت-ووت: (أنت مني وأنا منك) رواه الترمذي و النسائي. واتە: (ئەی علی تۆ لەمنی و منیش لەتۆم)!!. وە بەجەعفەریشی وت: (أشبهت خلقي وخلقي) رواه البخاری و الترمذي و احمد. واتە: (ئەی جەعفەر تۆ هەم لەشێوەدا و هەم لە خوڕەوشتدا لەمن ئەچیت)!. وە بەزەیدیشی ووت: (أنت أخونا ومولانا) رواه احمدو الحاكم. واتە: (ئەی زەید تۆ هەم براو هەم خۆشەویست و پشتیوانمانی).

جا زۆر پێویستە کە لێپرسراوی موسڵمانانیش تێکڕا چاو لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بکاو، لە (حوکم)کردن‌و دابەشکردنی پارەو تێکڕای ئیش‌و کارەکانی دیکەشدا مووبەموو شوێن پێی ئەو هەڵگرێت.چونکە زۆرجار هەندێ خەڵك دێنە لای لێپرسراوو داوای هەندێ شتی لێدەکەن کە ناگونجێ پێیان بدرێت، جائەگەر گونجاو لەدەستدا هەبوو ئەوە دەبێ لەبری ئەوەی کەداواکراوە بەشتێکی دیکە بۆیان قەرەبووکاتەوە، یان هیچ نەبێت بەقسەیەکی خۆش دڵیان خاوێن و خۆش کات!.

چونکە لەڕاستیدا گێڕانەوەی خەڵکی هەروا بەدەستی خاڵی مایەی ئێش پێگەیاندنیانە،جا زۆر پێویستە شوێنەکەی بەشتێکی دیکە قەرەبوو بکرێتەوە،بەتایبەت بۆ ئەوکەسانەی کەپێویستیان بە دڵ ڕاگرتن هەیە. ئەوەتا خوای میهرەبان و توانا دەفەرمووێت: (وَأَمَّا السَّائِلَ فَلاَ تَنْهَرْ) (الضحی:١٠). واتە:(ئەی محمد(ﷺ)ئەو کەسەی کەدێت و پرسیارت لێدەکات-چ دەربارەی دین‌و چ بۆ پشتگیریکردن-ئەوە تۆ سەرزەنشتی مەکەو لەگەڵیدا خاوەن بەزەیی و نەرم ونیان بە)!.

وه پەروەردگار لە لە جێگەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: (وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا(٢٦)إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا(٢٧) وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمْ ابْتِغَاءَ رَحْمَةٍ مِنْ رَبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُلْ لَهُمْ قَوْلاً مَيْسُورًا) (الإسراء:٢٦-٢٨). واته: (خزمەکانتو، هەژارونەداران‌و، ڕێبواران، مافی خۆیانیان بدەرێ و هەردەم دەستگیرییان بکە، وه لەو دەستگیری‌و بەخشینەشدا زیادەڕەوی مەکە، چونکە ئەوانەی (ئیسراف)و زیادەڕەوی دەکەن هاوچەشن‌و برادەری شەیتانەکانن،بەڕاستی شەیتان لە ئاقار پەروەردگاری خۆی بێبڕوا بووه. وه ئەگەر خزمەکانت‌و خەڵکانی تریش داوای یارمەتییان لێکردی وهیوایان هەبوو کە پێیان بدرێت، بەڵام تۆ لەبەر نەبوونی ماڵ و دەست نەدانی هیچت پێنەدان‌و پشتت تێکردن، ئەوه هەروا لێمەگەڕێ بەڵکو قسەیەکی شیرین‌و خۆشیان لەگەڵدا بکە و پەیمانیان بدەرێ و بڵێ: (ئەگەر خوا ڕزق‌و ڕۆزیدا ئەوه لەیادناکرێن‌و پێتان دەدرێت).

وه بێگومان لێپرسراو کاتێك حوکم بەسەر کەسێکدا دەدات.....ئەو حوکم بەسەردانە دەبێتە هۆی ئێش و ئازار پێگەیاندنی،بەڵام ئەگەر لێپرسراو ووردبین بێت و بەوتەیەك،یان کردەوەیەکی جوان و شیرین دڵی پاك کاتەوه، ئەوه لەڕاستیدا سیاسەتی کامڵ و ڕاستەقینە هەر ئەوەیە، پەروەردگار کاتێك (موسا)و براکەی ناردن بۆلای (فرعەون) دەبینی پێی فەرموون (فَقُولاَ لَهُ قَوْلاً لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى)(طه:٤٤). واته: (ئامۆژگاری بکەن و قسەیەکی نەرمی لەگەڵدا بکەن ، سابەڵکو بەهۆیەوه بیربکاتەوه و دەست لە تاوان کاری هەڵگرێ و ،وه بترسێ و دەست بکاتە گوێڕایەڵیکردنی پەروەردگار) وه پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك (موعازی کوڕی جەبەل)و (ئەبی موسای ئەشعەری)- خوایان لێ ڕازیبێت-نارد بۆ ولاتی (یەمەن) پێی فەرموون: ((یسرا ولا تُعسرا، وبَشراو لاتُنفرا، وتَطاوعا ولا تَختَلِفها)) رواه البخاري. واته: (ئاسانکاربن و

شت لەسەر خەڵکی گران مەکەن وە موژدەدەربن و خەڵکی مەتۆرێنن. وەگوێ بیستی یەکتربن‌و ناکۆك مەبن))! وە جارێکیان (دەشتەکییەك) لەنێو مزگوتەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) میزی کرد، جا لەو دەمەدا هاوەڵەکانی بۆی هەڵسان‌و ویستیان لێی بدەن. پێغەمبەر (ﷺ) یەکسەر فەرمووی: (إنما بُعِثْتُم مُيسرين ولم تُبْعثوا مُعسرين)) رواه البخاري. واتە: (ئێوە تەنها بۆ ئەوە نێردراون کە ئاسان کەربن،نەك بۆئەوەی شت لەخەڵکی گران وقورس بکەن))!!

جا شایەنی باسە ئەوەی کەباسکرا،مرۆڤی موسڵمان لەبەڕێوەبردنی ئیش وکاری خۆی و ژێردەستەو منداڵەکانیشیدا هەرپێویستی پێیەتی، چونکە بێگومان مرۆڤەکان هەتاوەکو پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێ نەکرێت و مافەکانیان پێنەدرێت.....(حەق)و ڕاستی وەرناگرن و قبوڵی ناکەن!! هەربۆیەش دەبینی مرۆڤ(نەفەقەی) خۆی‌و خاوخێزانی پێش (نەفەقەی) خەڵکیکیتر خراوە. ئەوەتا(ئەبوهورەیرە)-خوالێی ڕازیبێت-دەفەرمووێت: (پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی خەڵکینە ماڵ ببەخشن، پیاوێکیش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من دینارێکم هەیە چی لێبکەم؟! فەرمووی بۆخۆتی سەرف بکە، پیاوەکەش ووتی: دینارێکی دیکەشم هەرپێیە، فەرمووی: بۆ خێزانەکەتی (سەرف)بکە. پیاوەکەش وتی: دینارێکی تریشم پێیە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆ منداڵەکانتی (سەرف)بکە.پیاوەکە وتی: دینارێکی دیکەشم لایە. ئەویش فەرمووی: بیدە بە خزمەتکارەکەت. ئینجا ووتی: دینارێکی تریشم هەیە. پێغەمبەریش (ﷺ)فەرمووی: ئیتر بۆخۆت باشتر دەزانیت) رواه احمد و ابو داود و النسائي.

وە لە صحیحی(موسلم)دا هاتووە(ئەبو هورەیرە)-خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (دینارێك کەلەڕێگەی خواو (جیهاد)دا دەیدەیت‌و، دینارێکیش کە بۆئازادکردنی بەندەیەك دەیبەخشی‌و،

دینارێکیش کەبەهەژارو گەدایەکی دەدەیتو، دینارێکیش کە بۆ خۆتی (سەرف) دەکەیت، ئەوەیان کە بۆ خاووخێزانەکەت (سەرف)کردووە لەهەر هەموویان پاداشتی زۆرترو مەزنترە)رواه مسلم..شایەنی باسە لەم بارەوە چەندین ئایەت و فەرموودەی دیکە هاتووە.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە:

پیاو(نەفەقە)ی خۆیی و خاوخێزانی بەسەریەوە فەرزی (عەینە)، بەپێچەوانەی (نەفەقە)ی جیهادو هەژارو گەدایان، کەلەبنچینەدا (نەفەقە)ی ئەوان فەرزی (کیفایە) یان(سوننەت) ،بەڵام ئەگەر هاتوو کەس پێی هەڵنەستا، ئەوە هی ئەوانیش دەبێتە فەرزی (عەین)،چونکە بابای برسی هیچ نەبوو،نان پێدانی (واجبە). هەر بۆیەش ئیمام (احمد)-خوالێی ڕازیبێت- دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: ((لو صدق السائل لما أفلح من ردە)).واتە: (ئەگەر سواڵکەر ڕاستبکات کە فەقیرە ، ئەوەی بەدەستی خاڵی بیگێڕێتە دواوە سەرکەوتوو نابێت))!.

(ئەبوحاتەمی بوستی) لە صحیحەکەی خۆیدا فەرموودەیەکی دووردرێژ لە(ئەبوو زەڕڕە)وە -خوای لێ ڕازیبێت-دەگێڕێتەوە، جائەو فەرموودەیە چەندین ئاەۆژگاریو زانستی لەخۆی گرتووەو لە یەکێك لەباسەکانیدا فەرموویەتی: (یەکێك لە(حیکمەتە)کانی ئالی(داوود)-علیە السلام- بریتی بوو لەم ئامۆژگارییە:هەموو مرۆڤێکی خاوەن بیروهۆش مافی خۆیەتی کە چوار سەعاتی هەبێت: سەعاتێك بۆئەوەی بە پەنهان بپاڕێتەوەو گفتوگۆ لەگەڵ پەروەردگاری بکات، سەعاتێکیش تێیدا بچێتەوە بە دەرونی خۆیداو موحاسەبەی بکات ،وە سەعاتێکیش بەتەنها لەگەڵ ئەو هاوڕێ و دۆستانەیدا دانیشێت کە هەردەم لە عەیبو کەموکورتییەکانی ئاگاداریدەکەنەوەو باسی خودی خۆی بۆ دەکەن، سەعاتێکیش بۆ ئارەزووەرگرتن لەو شتە جوانو

شیرینانەی کە بۆی حەڵاڵن، چونکە ئەم سەعاتەی کۆتای یارمەتی دەرە بۆ سەرکەوتن و ئەنجام دانی ئیشی سەعاتەکانی دیکە)!.

ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە کە مرۆڤی موسڵمان هەردەم پێویستی بە خۆتێرکردن لە ئارەزووە حەڵاڵ و زوڵاڵەکانی هەیە، چونکە خۆتێرکردن لێیان دەبێتە یارمەتی دەرێك بۆ ڕاپەڕاندنی زۆرێك لە ئیشە خێرەکانی دیکە!!!

هەر بۆیە (فوقەها) دەڵێن: (عەدالەت) بریتیە لە ئیسلاح کردنی (دین) و (پیاوەتی)، ئەویش بەبەکارهێنان وئەنجامدانی هەرشتێك کە دەیانڕازێنێتەوە وە جوانیان دەکات وە قوتارکردنیشیان لە هەر کارێك کە نابوت و ناشرینیان دەکاتز وە پەروەردگار لە بنچینەدا ئارەزوەکانی بۆ تێر و تەسەل کردنی بەرژەوەندیەکانی خەڵکی دروست کردووە، چونکە ئەوان بە هۆی ئەو ئارەزوانەی هەرشتێك مایەی سود پێگەیاندنیان بێت بۆ خۆیانی وەدەست دەخەن. بۆنمونە: خوای گەورە تورەیی(الغضب)ی دروست کردوە بۆ ئەوەی هەر شتێك زیانیان پێ دەگەیەنێت بەهۆیەوە لە خۆیانی دوور خەنەوە. وە ئەو ئارەزوانەش کە هەردەم مایەی زەرەرو زیانن.... پەروەردگار قەدەغەی کردون و سەرزەنشتی ئەوانەشی کردووە کە پێیەوە سەرقاڵن.

بۆیە سود لێوەرگرتن و بەکارهێنانی ئەو ئارەزوانەی کە پەروەردگار حەڵاڵ و زوڵاڵی کردون فەرمانێکی باشەو لەکردەوە چاکەکانە، هەر بۆیەش لەفەرمودەی صەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە دەفەرموێت: (هەریەك لە ئێوە بچێتە لای خێزانەکەی خۆیشی بەکردەوەی چاك بۆی دەنوسرێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا یەکێك لەئێمە بچێتە لای خێزانەکەیو ئارەزوی خۆی تێربکات، لەوەشدا پاداشتی بۆ دەنوسرێت؟!!! پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەی نازانن ئەگەر ئەو ئارەزوەی لە (حەرامدا)دا نابایە ئایا گوناهبار نەدەبوو؟ وتیان: بەڵێ فەرمووی: دەی بۆ

لەشتی حەرام چاوەڕوانی تۆڵەو سزا دەکەن.... بەڵام لە ئەنجامدانی حەڵاڵدا چاوەڕوانی پاداشت ناکەن؟ ). مسلم.

وەلە صەحیحی (بوخاری ومسلم)هاتوە کە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)- خوای لێ ڕازی بێت- دەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (ئەی (سەعد) تۆ هەر پارەو ماڵێك کە خەرجی دەکەیت و مەبەستت پێی خواو ڕاری کردنی بێت، ئەوە پلەت بەرز دەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر پارویەکیش بێت کە دەیخەیتە نێو دەمی خێزانەکەتەوە!!)

لەڕاستیدا مرۆڤی موسوڵمان ئەگەر نیاز و مەبەستی پاك بێتو بۆ خوا بێت، ئەوە تێکڕای ئەو کردەوانەی ڕۆژانە ئەنجامی دەدات بەهۆی دڵ پاکی و نیاز چاکیەکەیەوە بەکردەوەی چاك بۆی تۆمار دەکرێت بەڵام مرۆڤی دووڕو (منافق) لەبەر دڵ پیسی و نیاز پیسی یەکەی تەنانەت ئەو کردەوە چاکانەش کە ئەنجامیان دەدات لە جێی پاداشت لەسەری سزا دەدرێت، لەبەر ئەوەی لە ناخەوە مەبەستی ڕوپامایی یە نەك ڕازیکردنی خوای گەورە!!. ئەوەتا لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ( ألا إن في الجسد مضغة، أذا صلحت صلح لها سائر الجسد، وإذا فسدت فسد لها سائر الجسد، ألا وهي القلب.) رواه البخاري والمسلم.

واتە: (وریابن لەنێو لاشەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر بێت و ئەو پارچە گۆشتە چاك بێت. ئەوا تێکڕای ئەندامانی لاشەی بۆ چاك دەبێت، وە ئەگەر خراپ بێت، ئەوە تێکڕای ئەندامانی لاشەی خراپ دەبێت ..... جا وریابن ئەو پارچە گۆشتە "دڵ"ە)!!.

چونکە هەروەك چۆن خوای گەورە سزاو (عقوبە)کانی داناوە تا ببینە پاڵنەرو فاکتەرێك بۆ ڕاپەڕاندنی (فەرزەکان)و، وازهێنان لە (حەرامە)کان.... ئاوهاش هەرچییەك یارمەتی دەریان بێت ئەویشی پێویست کردووە.

پێویستە بەهەموو شێوەیەك ڕێگەی خێر و گوێڕایەڵی خوای گەورە بۆ خەڵك ئاسان بکرێ و برەوی پێ بدرێ و پشتگیری و یارمەتی یان لەسەر بدرێت و بەهەموو شێوەیەکی گونجاو خەڵکی بۆ هان بدرێت. بۆ نمونە: پێویستە لێپرسراوی موسوڵمانان هەرشتێك دەبێتە هاندەرو پاڵنەری خەڵکی بۆ کردەوەی چاك بەکاری بهێنیت. وەك: پارەومالْ... پیاهەڵدان... سوپاس کردنو .... عتد.

هەربۆیەش دەبینی پێش بڕکێکردن بەووڵاخ و حوشتر وتیر بازی و نیشانە شکاندن و پارە وەرگرتن لەسەریان کارێکی باش و شەرعیە. چونکە بەهۆیەوە خەڵکی هان دەدرێت بۆ هێز ئامادە کردن و خۆئامادەکردن بۆ (جیهاد) لە ڕێگەی خوای پەروەردگاردا. تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆیو جێنشینە ئازیزەکانیشی لەپاش خۆی پێشبڕکێیان بە ووڵاخ کردووەو لە (بیت المال) پارەیان بۆ ئەو کارە ئامادە کردووە، وە هەردەم بۆ ڕاکێشان و دڵڕاگیرکردنی خەڵکی پارەیان بەخشیوە، وەك دەگێڕنەوە کە : پیاوی وا هەبوو سەر لەبەیانی تەنها لەبەر وەدەست هێنانی شتێکی دونیایی موسوڵمان دەبوو.... بەڵام ئێوارەی نەدەکردەوە ئیسلامی لە هەموو گەنج و گەوهەری دونیا لا خۆشەویستر بوو : وە لەم لاشەوە هەرچی خراپە و سەرئەنجامی سەرپێچی پەروەردگارە، دەبێ قەڵاچۆ بکرێ و ڕێگەی تەنگ بکرێو بەهەموو چەشنێك لەمپەر لەڕێیدا دروست بکرێت، وە هەرشتێکیش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی و دروست بونی پاڵی پێوە بنرێت، ئەگەر هاتوو لەبونیدا بەرژەوەندیەکی باشتر و پەسەند تر نەبوو!!. بۆ نمونە: پێغەمبەری بت شکێن (ﷺ) بەرهەڵستی لەپێکەوە دانیشتن بە تەنها لەگەڵ ئافرەتی (نامەحرەم)دا دەکاتو دەفەرموێت: (لا يخلون رجل بأمراةٍ، فإن ثالثهما الشيطان) رواه احمد والترمذي.

واته: (با هەرپیاوێك لەئێوە بەتاقی تەنها لەگەڵ ئافرەتێكدا دانەنیشێت، چونكە سێ هەمیان شەیتانە)!.

(عومەری كوری خەتاب)- خوای لێرازی بێت- لە كاتێكدا شەو بەناو شاری (مەدینە)دا دەگەڕاڵە كارو باری خەڵكی ئاگادار بێ، شەوێك گوێ بیستی ئافرەتێك بوو بە گۆرانیەوە ئەم پارچە شعرەی دوبارە دەكردەوە:-

هل من سبيل الى الخمر فاشربها          هل من سبيل الى نصر بن حجاج

واتە: تۆ بڵێی ڕێ هەبێ مەی بخۆمەوە.. تۆ بڵێی بكونجێ لەگەڵ (نەصری كوڕی حەجاج)دا ڕابوێرم؟!!

جا ئیمامی (عومەر)- خوای لێ ڕازی بێ- داوای كرد ئەو (نەصرە)ی بۆ بیبب كاتێك كە هێنایان بینی وا گەنجێكی قۆز و پێكەوتووە، بۆیە فەرمانی كرد قژی بتاشن، بەڵام لەپاش تاشینیشی هەر قۆز و جوانتر بوو، ئەنجا فەرمانی كرد كە دوور بخرێتەوە بۆ (بەصرە)، بۆ ئەوەی ئافرەتان پێی هەڵنەخەڵەتێن!!

وەدەگێڕنەوە ئیمامی (عومەر)- خوای لێ ڕازی بێ- ئاگاداریان كردەوە كەوا پیاوێك هەیە هەمیشە منداڵان دێنە لای دادەنیشن، ئەویش یەكسەر مەنعی كردن و نەی هێلا جارێكی دیكە لەگەڵی دانیشن!.

جا بۆیە: ئەگەر هاتوو گەنجێك یان منداڵێك مەترسی ئەوەی لێدەكرا كە پیاوان یان ئافرەتانی پێهەڵ خەڵەتێن، ئەوە دەبێ دەم و دەست وەلی یەكەی ئاگادار بێ و لەبەر پێویست نەبێ نەهێڵێت دەركەوێت، وەنابێت شۆخ و جوانتری بكات و هەردەم بیهێنێتە كۆڕی گۆرانی و لەهووەوە، چونكە ئەو جۆرە كارانە پێویستە مرۆڤی لەسەر سەرزەنشت بكرێت.

وە هەمدیسان هەركەسێ لێی ئاشكرا بوو كە خەریكی خراپەكاری یە، دەبێ نەهێڵرێ منداڵی جوان كیلەی بێ موو نزیكی كەوێت، بەڵكو دەبێت بەهەموو چەشنێك لێی قوتار بكرێت، چونكە شەرعزانان-خوالێیان خۆش بێ-

بەتێکڕا یەك هەڵوێست و دەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر کابرایەك لای (حاکم) شایەتیداو بەڵام یەکێك لەو تاوانانەی کەشەهامەتی پیاو دەڕوشێنن لێ ی ئاشکرا بوو، ئەوە شایەتیەکەی (جایز) نییە وەربگیرێت، وە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی ئەو تاوانەوە (جەرحی) بکات، واتە: متمانەی لێبسەنرێتەوە.

ئیتر ئەگەر چی بە چاوی خۆیشی تاوانەکەی نەدیبێت، بەبەڵگەی ئەوەی کە: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) جارێکیان جەنازەیەکیان بەلادا تێپەڕ کردوو خەڵکەکە بەخێر باسیان کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بۆی بڕیار درا).... (بۆی بڕیار درا). پاشان جەنازەیەکی تریشیان بەلادا تێپەڕکردو خەڵکەکە باسی خراپەیان کرد. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بۆی بڕیار درا) ... (بۆی بڕیار درا). خەڵکەکەش سەبارەت بەو حاڵەتە پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئەویش فەرمووی: ئەو جەنازەیەی ئێوە بەخێر باستان کرد منیش ووتم: بەهەشتی بۆ بڕیار درا، ئەو جەنازەیەی ئێوە بەخراپە باستان کرد، منیش ووتم: ئاگری بۆ بڕیار درا، چونکە ئێوە لە نێو زەویدا شاهیدی خوان) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ئافرەتێك هەبوو بە ئاشکرا ئیشی خراپەی دەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لو كنت راجماً احداً بغير بينةٍ لرجمت هذه) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (ئەگەر یەکێکم بەبێ بونی شایەت ڕەجم بکردایە ئەوە ئەم ئافرەتەم ڕەجم دەکرد) .

بۆیە: (حەددی شەرعی) بەبونی شایەت نەبێت کە بەچاوی خۆیان خراپەکەیان بینیبێت و شایەتی لەسەر بدەن نابێت بەرپا بکرێت، بەڵام ڕەت کردنەوەی(شەهادەتو ئەمانەت)ی کابرایەك کە بەهۆی تاوانێکەوە کە ئەنجامیداوە پێویست بە بینین ناکات، بەڵکو تەنها کردن و بڵاوکردنەوەی لە نێو خەڵکیدا بەسە بۆ متمانە پێنەکردنی، تەنانەت دەشتوانرێت تەنها بەهۆی

هاوڕێو برادەرانیەوە پێناسە بکرێت- ئەگەر هاوڕێکانی خراپ بوون- هەروەك (ابن مسعود)- خوای لێ ڕازی بێ- دەفەرمووێت: (إعتبروا الناس بأخوانهم) رواه البخاري ومسلم. واتە:(خەڵکی بەهاوڕێو خۆشەویستەکانیان هەڵبسەنگێنن)!!.

# ( بەندی دووەم )

(ئەو ماف و حەدادانەی کە سودەکەیان تایبەتە بە کەسێکی دیاریکراوەوە)

ئەم بەندەش بریتیە لە هەشت فەصلْ:-

سەبارەت بەو (ماف و حەدانە)ش کە سودەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ کەسێکی دیاریکراو...

وە ئەو کەسە خۆی خاوەنیتی لە بەرپا کردن و نەکردنیدا ، بریتین لە مانە:-

# ( فەصلی یەکەم )

## ( النفوس-گیان و ڕۆح )

خوای مەزن لەم بارەوە دەفەرموێت: (قُل تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ مِنْ إِمْلاَقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلاَ تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ(١٥١) وَلاَ تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ(١٥٢)وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ) (سورة الأنعام:١٥١-١٥٣) واتە: (ئەی محمد (ﷺ) بە خەڵکی بڵێ ئەی خەڵکینە با ئەو شتانەی پەروەردگارتان لە سەرتانی قەدەغە کردووە بۆتانی بخوێنمەوە، ئەو قەدەغە کراوانەش ئەمانەن:

یەکەم: هیچ هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار مەدەن.

دووەم: وە لەگەڵ دایك و بابدا بەو پەڕی باش هەڵسوکەوت بکەن.

سێهەم: وە منالەکانتان لە ترس هەژاری و نەبونی مەکوژن، چونکە هەر ئێمە ڕۆزی خۆتان و منالەکانیشتان دەدەین.
چوارەم: وە هەرچی خراپەو سەرپێچی هەیە نزیکی مەکەونەوە، ئیتر ئەو خراپەو سەرپێچییەی بە ئاشکرا بێت یان بە نهێنی و پەنهان.
پێنجەم: وە هیچ کەسێك مەکوژن مەگەر کاتێك شایستەی کوشتن بێت- وەك ئەوەی نوێژ نەکات، یان زەکات نەدات، یان زینا بکات، یان لە دین پاشگەز بێتەوەو.... هتد- جا ئەم کردەوە قەدەغە کراوانە خوا ئاگاداری کردنەوەو لێتانی دوپات کردەوە تا دەستیان لێهەڵگرن، بەهیوای ئەوەی بەهۆیەوە بیر بکەنەوەو وریا ببنەوە.
شەشەم: وەنزیکی ماڵی هەتیو مەکەون مەگەر بە شێوەیەك کە بەرژەوەندی هەتیوەکەی تێدا بێت، هەتاوەکو هەتیوەکە هێز پەیدا دەکات- چ هێزی تەمەن و جەستەی ، چ هێزی ژیان و تەجرەبە-.
حەوتەم: وەلەکاتی کڕین‌و فرۆشتندا بەشێوەیەکی دادپەروەرانە کێشانەو پێوانە بکەن، وە ئەو داد پەروەریەش لە کێشانەو پێوانەدا خوا بەگوێرەی توانای خۆتان داواتان لێدەکات.
هەشتەم: وە ئەگەر لە (حوکم)کردن یان (شایەتی)داندا شتێکتان وت ... ئەوە دادپەروەربن ئەگەر چی (حەقە) کەبکەوێتە سەر خزمێکی نزیکی خۆشتان .
نۆیەم: وە هەر بەڵێن و پەیمانێك لەگەڵ خوادا دەیبەستن -یان لەگەڵ خەڵکی -ئەوە وەفاتان پێی هەبێت‌و بیبەنە سەر. ئا ئەمە خوا وەصییەتتانی پێ دەکات بە هیوای ئەوەی پەند وەربگرن و بیر بکەنەوە .وە ئەی محمد(ﷺ) بشڵێ: ئەم بەرنامەی ئیسلامە ڕێگا ڕاست‌و دروستەکەی منەو ئێوەش شوێنی کەون، وەوریاش بن شوێن تولە ڕێگا لارو گێڕەکانیتر مەکەون چونکە لە ڕێگە ڕاستەکەی خوا لاتان دەدات. ئائەمەیە خوا ئێوەی لێ ئاگادارکردەوەو لێتانی دوپات کردەوە، بەڵکو ئێوەش پارێزکەن- ببنە پارێزگار-) خوای

دادپەروەر لە جێگایەکی تردا دەفەرمووێ: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا) (النساء:٩٣)

هەرکەس بڕوادارێکی (عمد)ی بکوژێت ئەوە پاداشتەکەی چونە نێو ئاگری دۆزەخە بەبەردەوامی تێیدا دەمێنێتەوە، وەخوای لێ توڕە دەبێت و نەفرەتی لێدەکات- لە ڕەحمەتەوە دوری دەخاتەوە- وە سزایەکی ئێجگار گەورەو توندی بۆ ئامادە کردووە)!!.

وە هەمدیسان دەفەرموێت: (مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا)(المائدة:٣٢)

وە لە صەحیحی(بوخاری و مسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أول ما يقضي بين الناس يوم القيامة في الدماء).

واتە: (لە ڕۆژی دوایدا یەکەم شتێك کە لە نێو خەڵکیدا دادگایی لەسەر دەکرێت -خوێنە-!!).

# جۆرەكانی قەتڵ

## قەتڵ بۆ سێ جۆر پۆلێن دەكرێت

### جۆری یەكەم/ ( قەتلی عەمدی ڕووت ):-

بریتیە: لە كوشتنی كەسێكی بێتاوان ،بە ئامێرێك كە زێدەجار كوشندەیەو خەڵكی پێدەكوژرێت- نەك ئەو ئامێرانەی كە كوشندە نین-، وەك ئەم ئامێرو شێوە كوشتنانە : (شمشێر، سوتاندن و ئاگر تێبەردان، خنكاندن چ لە نێو ئاودا یان بە هەر هۆكارێكی دی، بەردانەوەو فڕێدان لە شوێنێكی بەرزو بڵندەوە، داپۆشینی دەموچاو هەتامردن، زەهر دەرخواردكردن)و هۆكارەكانی تری لەم چەشنە !.

بۆیە ئەگەر هەركەس بەم جۆرە یەكێكی كوشت.... ئەوا (قیصاص) تۆڵەكردنەوەی (واجب)ە ئەویش بەوە دەبێت كە بابای (قاتل)بهێنرێتە بەردەم كەسو كاری كوژراوەكەوەو پاشان سەرپشك بكرێن بۆ هەڵبژاردنی یەكێك لەم سیانە:

یەكەم: كوشتنەوەی بكوژەكە.

دووەم: لێبوردن و خۆشبوون لێی.

سێیەم: وەرگرتنی خوێنەكەی.

وە كەسوكاری كوژراوەكە بە هیچ شێوەیەك ماف ئەوەیان نیە بچن غەیری بكوژەكە یەكێكی تر بكوژنەوە. ئەوەتا خوای دادپەروەر دەفەرموێت: (وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاَقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا(٣١)وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً(٣٢) وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنصُورًا) (الإسراء:٣٣) واتە: (ئەو

کەسەی خوا کوشتنی قەدەغە کردووە ئەگەر مافێکی بەسەرەوە نەبێت و شایستەی کوشتن نەبێت مەیکوژن (وەك زینا بکات، یان قەتڵ، یا لەئیسلام پاشگەز بێتەوە)، بەڵام هەرکەس بەبێ تاوان و بە ناڕەوا کوژرا– واتە: بەبێ ئەوەی زینای کردبێت یان قەتڵ یان پاشگەزبونەوە –، ئەوە ئێمە بۆ (وەلی)و خاوەنی کوژراوەکە بەسەر بکوژەکەوە دەسەڵاتێکمان داناوە بەوەی بیەوێت دەکوژێتەوە و یان لێی خۆش دەبێت یان خوێنەکەی لێ دەسەنێ،وەئەگەر خاوەنی کوژراوەکە ویستی تۆڵە بسەنێتەوە ئەوە باڵەو کوشتنەدا زیادەڕەوی نەکات بەوە کەبڕوات وازلەبکوژەکەبێنێ و بیەوێت یەکێك یان چەند کەسێك لەکەسوکارەکەی بکوژێت، بەڕاستی ئەگەر خاوەنی کوژراوەکە ئەوزیادە ڕەوییە نەکات ئەوا هەرئەو سەرکوتوە).

وە(ئەبی شورەیحی خوزاعی)–خوای لێ ڕازی بێ– دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من أصيب بدم أو خبل فهو بالخيار بين إحدى ثلاث، فإن أراد الرابعة فخذوا على يديه، ان يقتل، أو يعفو، أو يأخذ الدية، فمن فعل شيئا من ذلك فعاد، فإن له نار جهنم خالداً فيها أبداً) رواه أهل السنن. قال الترمذي: حديث حسن صحيح.

واتە: ( هەرکەس خوێنی ڕژێنرا یان بریندار کرا ئەواسەرپشکە بۆئەو سێ شتە کە یەکێکیان هەڵبژێرێ، ئەگەرخۆی داوای چوارەمی کرد ئەوە نەیەڵن و لە دەستی بدەن: کابرای بکوژ بکوژێتەوە، یان لێی خۆش بێت ، یان خوێن وەربگرێت. جاهەرکەس یەکێك لەم سێ شتەی هەڵ بژاردو پاشانیش دەستی بەناخۆشی کردەوە وەهەڵی وەشاندەوە، ئەوە بەهەتا هەتایی دەخرێتە نێو ئاگری جەهەننەمەوە)!!

بۆیە ئەگەر کەسێك هەرکەسێکی لێ کوژراو پاشان لەبابای بکوژ خۆش بو یان خوێنی لێسەند، بەڵام لەدوای ئەوەش هەرچوو کابرای بکوژی کوشتەوە، ئەوە تاوانی ئەم لە هی یەکەم گەورەترە، تەنانەت زانایان دەفەرمون:

هەردەبێ بکوژرێتەوەو کەسوکاری کوژراوەکە هیچ پرسیاریکیان پێناکرێت.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموویت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأَنثَى بِالأَنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنْ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ(١٧٨)وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاأُوْلِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) (البقرة:١٧٨-١٧٩)

واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە: لە کوشتنەوەدا-کوژراوەکاندا- تۆڵە سەندنەوەتان لەسەر فەرز کراوە، ئازاد بەئازادو کۆیلە بەکۆیلە مێینە بە مێینە،[١] وەئەگەر خاوەنی کوژراوەکە خۆشبو و داوای کوشتنەوەی نەکرد، ئەوە دەبێ لەداواکردنی خوێنەکەیدا بەشێوەیەکی باش داوابکاو بکوژەکەش بەشێوەیەکەی جوانوڕێك خوێنەکە بەخاوەنی کوژراوەکە بدا ت[٢] ئەم

---

[١] زانایان دەفەرمون: لەم ئایەتە پیرۆزەدا مەبەست ئەوەنیە کە: ئازاد لەبری کۆیلە ناکوژرێتەوە، یان ئافرەت لەبری پیاو ناکوژرێتوەو، یان بە پێچەوانەوە، بەڵکو دەفەرمون: لەنێو خێڵەکانی عەرەبدا ئەگەر خێڵێك زیاتر بەخۆیدا بینازی بایەو هێزو شەو کەتێکی هەبوایە، کۆیلەیەکی خێڵیکیتر پیاوێکی ئازادی ئەمانی بکوشتایە، ئەمان ڕازی نەدەبون لەبری پیاوە ئازادەکەی ئەمان ئەو کۆیلە بکوژێتەوە، بەڵکوبەخەسارەتیان دەزانیو دەیانوت: دەبێت خاوەنی ئەو کۆیلە بکوژە بکوژرێتەوە،یان هەر پیاوێکی ئازاد.یان ئەگەر ئافرەتێکی خێڵێکی ترپیاوێکی ئەمانی بکوشتایە ئەمان بەکوشتنەوەی ئافرەتەکە ڕازی نەدەبون، بەڵکو دەیان وت: لەبری پیاوەکەمان پیاوێکتان لیّ بکوژین نەك ئافرەت. جاخوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی دابەزاندو ڕونی کردەوە کە: ئەوەی لەتۆڵەسەندنەوەدا فەرزە لەسەرتان ئەوەیە کە هەرکەس هەرکەسی کوشت دەبێ خۆی بکوژرێتەوە نەك یەکێکیتر لەبریدا، ئیتر هەر کەس بێت _تەنها ئەوەندەیە موسوڵمان بەکافر ناکوژرێتەوە-الله اعلم .وەرگێڕ.

[٢] مەبەست لەوەیە خاوەنی خوێنەکە زیاد لەسنوری دیاری کراوی شەرعی داوانەکاتو خوێندەرەکەش ئەو ئەندازە یەی کە خوای گەورە دیاری کردووە بیدات لیی کەم نەکاتو زوڵم نەکات . هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ڕێبازەش کەبۆمان حەڵاڵ کردوون لەوەی کەخاوەنی کوژراوەکە دەتوانێت لە بکوژەکە خۆش بێتو نەیکوژێتەوەو لەبریدا خوێن وەرگرێت ئاسانکاریو بەزەییو میهرەبانییە کەلەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە- لەکاتێکدا بۆ میللەتانی پێشوو حەڵاڵ نەبوە-، وەهەرکەس لەپاش ئەوەی کەخوێنەکەی وەرگرت بڕوات دەستدرێژی تریش بکات و بابای بکوژ بکوژێتەوە، ئەوەسزایەکی بەئێشو ئازاری هەیە.[1] وە بەڕاستی ئەوی خاوەن هۆشو ئەقڵان: لەتۆڵە سەندنەوەدا ژیانتان بۆ هەیە ژیان، بەڵکو بەهۆیەوە ئێوەش بیر کەنەوەو خۆتان لەجەریمەو قەتل قوتاربکەن).

زانایان دەفەرموون: کەسوکاری کوژراوەکە لەڕقان کڵپەی دەرونیان دێت تەنانەت پێیان خۆشە هەم بابەی بکوژو هەم کەسو کارە کەشی بوژن، وەزۆ خاریش تەنها بەکوشتنەوەی بکوژە کەشیان ڕازی نابن بەڵکو زۆرێك لە کەسوکارو سەرۆك خێڵکەشی لەگەڵدا دەکوژن!!.

جابەمەش وای لێدێت هەرچۆن بکوژی یەکەم لەسەرەتاوە دەست درێژی کردوەو لایداوە ئەمانیش ئاوها لەتۆڵەداو لەوەرگرتنەوەی مافەکەیاندا دەبنە دەست درێژکار. هەروەك ئەم کارە بەدانە بۆتە پیشەی نەفامانو جاهیلانی ئەم سەردەمە، ئەوانە کەلەبەرنامەو شەریعەتی خوای بالاّ دەست دەرچوون و یاخیبوون. زۆر جاریش کەسو کاری بکوژەکە لەملاوە پێیان قورسوگرانە ئەم لەبری کوژراوەکە بکوژرێتەوە، چونکە واحیساب دەکەن ئەم لەکوژراوەکە

---

[1] زانایان دەربارەی ئەم (عزاب)ە کە دانراوە بۆ ئەو کەسەی خوێن وەردەگرێو لەپاشان دا دەست درێژی دەکات و بکوژەکەش دەکوژێتەوە جیاوازیان هەیە کە مە بەست پێی چیە؟ هەندێك دەفەرموون : مەبەست پێی کوشتنەوەیەتی، ئەمەش بۆچونی (ضحاكو، سەعیدی کوڕی جوبەیرەو، عکرمە)یە. هەندێکی دیکەش دەفەرموون: مەبەست پێی ئەو سزایەیە کە دەستەلاّتداری موسڵمانان دیاریدەکاتو بەبەرژەوەندی دەزانێت. (إبن جەریری طەبەری) خوای لێ ڕازی بێت، بۆچونی یەکەمیانی بەپەسەند داناوە. والله اعلم تفسیر الطبري م٢ ص١١٨-١١٩. وەرگێڕ.

خاوەن شەرەفەو ڕێزی زیاترەو نابێ ئەم لە بری ئەو بێت بۆیە سەر ئەنجام سەردەکێشێ بۆئەوەی هەردولا ناچاربن و هەریەکەیان لە دژی ئەویتر پەیوەندی بەخەڵکانی دەرەکیەوە بکات و ئەمەش سەردەکێشێ بۆوەیشومەو دوژمنایەتیەکی گەورەو سوتێنەر.

فاکتەرو هۆکاری سەرەکی ئەم دوژمنایەتی و وەیشومەش تەنهاو تەنها بریتیە لە لادانیان لەو ڕێبازو بنەما داد پەروەروەرانەیەی کەبریتیە لە (قصاص)چونکە خوای گەورە(قصاص)ی لەسەر ئێمە فەرز کردوەو ئاگاداریشی کردوینەتەوە کە مایەی ژیانە، لە مەشدا خوێنی کەسوکاری بکوژو کوژراوەکەش یارێزراوەو نابێت دەست درێژیان بۆ بکرێت و، بەڵکو تەنها خودی بکوژ دەکوژرێتەوە، هەرئەمەش مانای پڕاوپڕی (قصاص)ە لەئیسلامدا.

وەهەمدیسان هەر کەسێك دەیەوێت کەسێکی بێتاوان بکوژێت و هەر لە سەرەتاوە بزانێت و یەقینی هەبێت کە ئەمیش دەکوژرێتەوە ...دەستبەجێ واز لەو کارەدێنێت. ئەوەتا(عەلی کوڕی ئەبی تایب) دەگێڕێتەوە لە (لەعەمری کوڕی شوعەیب) ئەویش لەباوکیەوە ئەویش لەباپیریەوە-خوالەهەمویان ڕازی بێ-کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی :(المؤمنون تتكافأ دماءهم، وهم يدٌ على من سواهم، ويسعى بذمتهم أدناهم، ألا لا يقتل مسلم بكافرٍ، ولا ذو عهد في عهده) رواه احمد ابوداود وغيرهما من أهل السنن.

واتە: (خوێنی بڕواداران لە (قصاص)داوەك یەك وایە، هەموشیان بۆغەیری خۆیان یەك دەستن، وەخوارترین موسوڵمان ئەگەر پەیمانێکیدا دەبێت هەمویان وەفایان بەو پەیمانە هەبێ وە پەیمانپێدراو ڕزگار بکەن، ئاگاداربن موسوڵمان لەبری بێبڕوا ناکوژرێتەوە، وەخاوەن پەیمان لەنێو مودەتی پەیمانەکەیدا ناکوژرێ).

کاتێك تێ ڕادەمێنی بۆت ڕون دەبێتەوە کە:پێغەمبەری خوا(ﷺ)خوێنی هەموو تاك تاکی بڕوادارانی وەك یەك سەیرکردوەو حیساب بۆکردوە، بەشێوەیەك باری

خوێنی عەرەبێك نادرێت بەسەر غەیری عەرەبێكدا و قورەیشیەك یان هاشمییەك خوێنەكەی لە هی خەڵكیتر بەرێزتر نیە ،یان خوێنی زانایەك یان بەرپرسێك بەسەر نەخوێندەوارێك یان (مەئمورێك)دا.

ئەم بنەما زێرینەش موسوڵمانان بەتێكڕا یەك دەنگن‌و مشتومڕیان تێدانیە، بە پێچەوانەی ئەورێبازە گەندەڵەی كە خەڵكانی نەفام‌و جاهیل‌و حاكمەكانی (جولەكە)وان لەسەری و پەیرەوی دەكەن .

چونكە لەنزیك شاری (مەدینە)دا دوو كۆمەڵ لە (جوولەكە)هەبون بەناوی (بنی قریظة و بنی نضیر)،جا(بنی نضیر)لە خوێندا باری خۆیان دابوو بەسەر(بنی قریظة)داو حیسابی زۆرتریان بۆخۆیان دەكرد ... بۆیە سەبارەت بەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)و دادیان بردە لای و لەنێو خۆیاندا وتیان : ئەگەر محمد)یش حوكمەكەی بەم شێوەیە بوو ئەوە بۆ ئێوە دەبێتە بەڵگەیەكی بەهێز، بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە حوكمی كرد و ئێوەش بەگوێتان كرد،ئەوە ئیتر حوكمی (تەورات)تان دەست لێ هەڵگرتوە و چونەتە سەر حوكمی —محمد— (ﷺ).

مەبەستیان ئەوەبو ئەگەر پێغەمبەریش(ﷺ)وەك ئارەزوی ئێمە حوكمیكرد باری خوێنی (بنی نضیر)ی دا بەسەرخوێنی (بنی قریظة)دا... ئەوەشتێكی باشە ، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە بڕیاری نەدا ئەوە ئیتر ئێوە نابێت حوكم‌و یاسای (تەورات)دا رازلێبێنن، چونكە بەگومانی گەندەڵی خۆیان ئەو حوكمە لارو گێرەیان لە (تەورات)دا هەڵهێنجاوە، خوای گەورە لەم چەند ئایەتەدا سرپیان هەڵدەماڵێ ورەتیان دەداتەوە).

بۆیە لە پاشدا پەروەر دگار لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە:(يَاأَيُّهَا الرَّسُولُ لاَ يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنْ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِنْ قُلُوبُهُمْ وَمِنْ الَّذِينَ هَادُوا سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ وَإِنْ

لَمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا وَمَنْ يُرِدْ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنْ اللَّهِ شَيْئًا أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدْ اللَّهُ أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ(٤١)سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِنْ تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَنْ يَضُرُّوكَ شَيْئًا وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(٤٢)وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِنْدَهُمْ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُوْلَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ(٤٣)إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ فَلاَ تَخْشَوْا النَّاسَ وَاخْشَوْنِي وَلاَ تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلاً وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ(٤٤)وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ) (المائدة:٤١-٤٥)

واته:(ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداربە: بائەوانەی لەبۆ بێبڕوایی‌و سەرپێچی پەروەردگار پێشبڕکێ دەکەن توشی پەژارەو ناڕەحەتیت نەکەن، لەوانەی کە بەدەم دەڵێن: بڕوامان هێناوە بەڵام بەدڵ بێبڕوان -واتە: دووڕووەکان- ،وەئەوانەش کەجولەکەن ودوژمنی سەرسەختی ئیسلام و ئەهلی ئیسلامن، لەکاتێکدا ئەوانە بەگشتی زۆر گوێ لە وتەی درۆو پڕو پوچ دەگرن ووەڵامی دەدەنەوەو هەردەم گوێبیستی ئەوانەشن کەنایەنە خزمەت تۆ، جائەوانە پیشەیان ئەوەیە وتەو بەرنامەی خوا لەماناو مەبەستی ڕاستی ڕاستە قینەی خۆی دەگۆڕن‌و لای دەدەن، وکاتێك دێنە لای تۆ بۆ دادگایکردن لەنێوانیاندا بەیەکتری دەڵێن: ئەگەر ئەمەی کە خۆمان واین لەسەری ئەویش هەمان مافی پێدان... ئەوە وەری بگرنو قبوڵی بکەن، بەڵام ئەگەر وانەبوو ئەوا خۆتانی لێ قوتار بکەن‌و قایل مەبن، جالەڕاستیدا هەرکەسێك خوا بیەوێت توشی فیتنەو ناخۆشی بکات ئەوە لەئاستی پەروەردگاری هیچ شتێکی بەدەست نیەو ناتوانێت لە خۆی لابدات. وە ئەوانە خودا دەیەوێت دڵە کانیان لەژەنگ‌وژاری

تاوان پاك نەكاتەوە بۆيە هەر لەدونيا سەرشۆڕوڕيسوايان دەكات‌و لەڕۆژى دوايشدا سزايەكى زۆر سەخت‌و گەورە يان بۆهەيە. بۆيە ئەگەر هاتن بۆ لات‌و داديان بۆهێنايت ئەوە حوكمەكەيان لە نێواندا بكە و يان پشتيان تێبكەو وەلاّم يان مەدەرەوە، ئەگەر پشتيشيان تێكەى ئەوان ناتوانن هيچ زيانێكت پىّ بگەيەنن، ئە گەريش حوكميشت لەنێوان داكردن ....ئەوە بەچەشنى هەق‌و دادپەروەرانە حوكميان بكە، بەڕاستى خوا دادپەروەرانى خۆش دەوێت. وە ئەى –محمد– (ﷺ) مەحاڵە چۆن ئەوان حوكم‌وداد دێننە لاى تۆو پێت قايل دەبن لە كاتێكدا(تەورات) يان لەلايەو دڵنياشن كە كتێبى منەو ناردومەتە سەر(موسا) و–عليه‌السلام– حوكم‌و ياساى خواى تێدايە، بەلاّم ئەوان لەپاشدا پشتى تێدەكەن و ملى بۆ كەچ ناكەن؟ بەڕاستى ئەوانەى ئەوە سيفەتو ئاكاريانە بڕوا دارو موسوڵمان نين. ئێمە (تەورات)مان ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر (موسا) –عليه‌السلام– وەهيدايەت‌و ڕۆشنايى تێدايە، بەشێوەيەك هەموو پێغەمبەرانى (بەنو ئيسرائيلى) حوكوميان پێكردوە بۆ جولەكەو ڕاهيب‌و زانايان، چونكە ئەوان فەرمانيان پێكرا بوو كە (تەورات) لەهەمو گۆڕان و (تەحريفێك)بپارێزن‌و لەسەرى شاهێد بن، كەواتە:ئەى–محمد–(ﷺ) لە خەڵكى سڵ مەكەو مەترسە بەڵكو تەنها لە من بترسە، وەئايەتەكانى من بە پارەو پولێكى كەم مەفرۆشە، وە هەر كەس بەو پڕۆگرامەى كە خوا ناردويەتيە خوارەوە حوكم و داد نەكات... ئەوەبێگومان ئەوانە بێبڕواو كافرن. وەلەنێو (تەورات)دا لەسەر جولەكەمان فەرز كردبوو: لەتۆڵە سەندنەوەدا دەبىّ (نەفس)بە(نەفس)بىّ‌و چاو بەچاو، لوت بە لوت‌و، گوێچكە بە گوێچكەو، ددان بە ددان‌و، بريندارکردنيش تۆڵەى وەك خۆى....)

جا لەم ئايەتە پيرۆزانەدا پەروەردگار ئاشكراى كرد كە :ئەو جولەكانەى كەخۆيان بەشوێنكەتوى (تەورات)دەزانن، گيان‌و ڕۆحى هەر هەمويانى وەك يەك داناوەو، بارى خوێنى هيچ يەكێكيانى بەسەر ئەوى ترياندا نەداوە، بەڵكو ئەو

کاره بەدو ڕدفتاره پیسه هەر هەموی تەنهائارەزوی خۆیان بوو. پاشان خوای پەروەردگار دوابەدوای ئەو ئایەتانه دەفەرموویت: (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ) (المائدة:٥٠)

واته:(ئایا حوکمو دەستوری نەفامیان دەویٚ؟!! دەی حوکم و یاسای کیٚ له هی خوا چاکترو دادپەروەرانه تره بۆکەسانیك که(یەقین) یان هەیەو دەزانن که خوا (احکم الحاکمین)ه؟!

هەر بۆیه خوای دادگەر لەمەڕ خوێنی موسوڵمانان دا حوکمو یاسای دەرکرد که : هی دوا بویەکیان وەك یەك وایه و باری کەس نادریٚ بەسەر کەسی تردا، به پێچەوانەی ئەوە که ئەهلی نەفامیو جاهیلی لەسەریبون. لەڕاستیشدا زۆربەی هەره زۆری ئەو وەیشومەو ئارەزوو پەرستییەی که ئاوێتەی خەڵکی بو دوچاری خەڵکی شارو گوندەکان بو...فاکتەرو هۆکاره سەرەکییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵ :-

یەکەم: (البغی):سەرکەشیو زیاده ڕەوی .

دووەم:(ترك العدل):واز هێنانو پەیڕەوی نەکردنی دادپەروەری .

چونکه سەیر دەکەی له ناوچەیەکدا دو کۆمەڵ هەن،کۆمەڵی یەکەم دەست درێژ دەکاتەسەر کۆمەڵی دووەم ئیتر ئەو دەست درێژیه له (خوێن)دابێت یان (ماڵ) یان هەرکارێکی دیکەی ناپەسەند، جاکۆمەڵی دوەم لەوەختی تۆڵه سەندنەوەدا تەنها به گێڕانەوەی مافی خۆی قایل نابێت...بەڵکو زیاتر لەمافەکەی خۆی داوا دەکاتو دەستوری سەرکەشی پەیڕەو دەکات، ئەمەش سەر دەکێشیٚ بۆ وەیشومەو تێك چونی گوزەرانی خەڵك!!.

قورئانی پیرۆز بەڕاشکاوی ڕونی کردۆتەوە که: حوکم کردن لەنێو خەڵکی دا لەسەر (خوێن)یان (ماڵ)یان هەر شتێکیتر دەبیٚ بەتەرازوی ئەو(داد)و (قسط)ە بێت که خوای بالآدەست فەرمانی پێکردوە و ئەو عادەتو ڕێچکه نەفامی یەش

کەزۆرینەی خەڵکی کوێرانە شوێنی کەوتون پێویستە ڕەتبکرێتەوەو لە پلاکدا بکوژێتەوە!.

وە ئەگەر لەملاشەوە کەسێکی چاکساز ویستی لەنێو دوو کۆمەڵدا (ئیصلاح) بکات... ئەوە دەبێ لە (ئیصلاح) کردنەکەیدا موبەمو پەیڕەوی دادوعەدالەت بکات، هەروەك خوای پەنهان بین دەفەرمووێت: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(٩)إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) (الحجرات:١٠) واتە: (ئەگەر دوکۆمەڵ لەبڕواداران لەنێو خۆیاندا بەشەڕهاتن، ئەوا ئێوە چاك سازی لەنێوانیاندا بکەن، جا ئەگەر دەستەیەکیان دەستدرێژی زیاتری کردە سەر ئەویتریان وملی بۆ بەرنامەی خوا نەدا، ئەوە ئەو لایەیان کە لادەدات و سەرکەشی دەکات شەڕی لەگەڵ دابکەن ،هەتاکو بگەڕێتەوە لای فەرمانی خوا، جا ئەگەر گەڕایەوە بەچەشنێکی دروست و ڕاست چاکسازی لەنێوانیان دابکەن و لەچاکسازیەکەشدا دادپەروەربن، بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت، وەلە ڕاستیدا تەنها بڕواداران برای راستەقینەی یەکترن، جا ئێوەش چاکسازی بخەنە نێوان براکانتانەوە، وە لەخواش بترسن و پارێز بکەن؛ بەڵکو خودا ڕەحمتان پێبکات). وە ئەوانەی کەهەڵدەستن بە(چاکسازیی) لەسەرەتاوە پێویستە بچنە لای کەسوکاری کوژراوەکەو داوای (عەفو) چاوپۆشی و لێبوردنیان لێبکەن، چونکە واباشترە کەئەوان لێبوردن بەسەر فرمانیتردا هەڵبژێرن، وەك خوای میهرەبان دەفەرمووێت: (وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَنْ تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ) (المائدة:٤٥)

واتە: وە لە بریندارکردنیشدا تۆڵەی وەك خۆی دانراوە، وە هەر کەسێ ئەو (قصاص)و تۆڵەی بکاتە (صەدەقە) ولەکابرا ببورێت ئەوە ئەو لێبوردنە دەبێتە هۆی کەفارەت و کوژانەوەی تاوانەکانی).

وه(ئەنەسی کوڕی مالك)-خوای لێڕازیبێت-دەڵێت:( هەر کارێك بهاتبایە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و تۆڵی تێدابوایە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی چاوپۆشیو ولێبوردنی تێدا دەکرد )ئەبو داود گێڕاویەتیەوە.

وه ئیمام (موسلم) له صەحیحەکەیدا له ئەبوهورەیرە _خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ما نقصت صدقة من مال، وما زاد الله عبداً بعفو إلا عزا، وما تواضع أحد لله، إلا رفعه الله) واته: (بەخشین نابێتە بایسی کەم بوونەوەی ماڵ، وە هەرکەس لێبووردنی هەبێت خوا عیزەتی بۆ زیاد دەکات وە ئەوەش بۆ خوا خۆی بە کەم بگرێت خوا بۆخۆی بەرزی دەکاتەوە )!!!.

## (تێبینیەکی گرنگ )

ئەم هاوچەشنو یەکسانیەی کە باسمانکرد کە دەبێت لە خوێندا رەچاو بکرێت ئەوە تەنها بۆ موسوڵمانی ئازادە بەرامبەر موسوڵمانی ئازاد، بەڵام بابەیەکی (ذمی) جمهوری زانایان دەڵێن: خوێنەکەی هاوچەشنو یەکسانی موسوڵمان نیە. وە بەهەمان شێوە ئەوکەسەی کە (پەنایان پێدراوە)وە لە وڵاتی بێبڕوایانەوە وەك (بازرگان)یان (وەفد) دێتە نێو خاکی ئیسلامەوە خوێنەکەی هاوچەشنی خوێنی موسوڵمان نیە بەڵام هەندێك لە زانایان دەفەرمون: بەڵکو خوێنەکەی وەك خوێنی مووسوڵمان وایە!!. بە هەمان شێوە زانایان سەبارەت بە کووشتنەوەی (ئازاد)بە (کۆیلە) جیاوازیو مشتومڕیان هەیە.

## جۆری دووەم ( قەتلی خطاء وێك چوو بە عمد )

پێغەمبەری خوا(ﷺ)سەبارەت بەم جۆرە قەتڵەش فەرموویەتی (ألا إن في الخطأ شبه العمد ما كان في السوط والعصا مائة من الإبل، منها أربعون خلفة في بطونها أولادها) رواه ابوداودوالنسائي. لێرەدا پێغەمبەریی خوا (ﷺ) ئەم جۆرە قەتڵەشی ناوناوە بە قەتلی (وێکچو بە عمد).

لەبەرئەوەی بابای (قاتل) بە عمدی لە (کوژراوەکە) دەدات و مەبەستی لێدانی ئەوە ،بەلام ئەوەندە هەیە کە ئەو ئامێرەی کە بەکاری دە هێنێت ئامێرێکی کووشندە نیە وەك ئەوەی بەدارێك بدات لە کەسێك یان بە گالۆکێك .جا لێرەدا لێدانەکەو دەستدرێژیەکە بە (عمدی) یە ،بەلاّم ئامێرەکە هی کووشتن نیە و بە مەبەستیشی پێی کوشتن نیە .

واتە :لە ڕویەکەوە قەتلی (عمدی)یەو لە ڕوویەکی تریشەوە (هەڵەیە) ،بۆیە پێی دەوترێت قەتلی (عمد خطاء) یان(شبه عمد)"وەرگێڕ"

جۆری سێیەم: (قەتلی خطاء رووت) ئەمەش وەك ئەوەی تیرێك بۆ نێچیرەکەی بووەشێنێت یان بۆ نیشانەیەك.

بەلاّم لەملاوە بە بیَ مەبەستو ویستو عیلمی خۆی بەر مرۆڤێك بکەوێت و بیکوژێت جا ئەم جۆرە قەتڵە کوشتنەوەی تێدا نیە بەڵکوو تەنها (خوێن)دانو (کەفارەت)ی تێدایە.

جا لە ڕاستیدا سەبارەت بەم جۆرە قەتلاّنە چەندین باس و بابەت هەن کە لێرە شوێنی باسکردنی نیە.

# قصاص_تۆڵەکردنەوە لە بریندارکردندا

بە هەمان شێوەش (قصاص)بە بەڵگەی قورئان و سوونەت و أجماعی زانایان لە بریندارکردندا هەیە، بەڵام بەو مەرجەی کە قصاص کە هاوچەشن و یەکسان بێت، بۆ وێنە ئەگەر بابایەك دەستی ڕاستی یەکێکی لەجومگەدا قرتاند، ئەوە بۆی هەیە دەستی راستی لە جومگەدا بقرتێنێتەوە !!

یان ئەگەر ددانی شکاندو دەرهێنا ئەوە بۆی هەیە ددانی بشکێنێتەوە، وەیان ئەگەر لە سەری یان دەم و چاوی داو بە شێوەیەك ئێسقانەکەی بریندار کرد ئەوا ئەمیش بۆی هەیە سەرو دەم و چاوی بشکێنێتەوەو برینداری بکاتەوە، بەڵام لە حاڵێکدا نەتوانرا (قصاص)ەکە (یەکسانی) تێدا ڕەچاو بکرێت، بۆ وێنە :ئەگەر ئێسقانێکی لە ناوەوە شکاندو روون نەبوو سەری بریندار کرد بەڵام ئێسقانی نە شکاندبوو، ئەوە لەو دەمەدا (قصاص) شەرعی نیەو نابێت بکرێت،بەڵکو واجبە خوێنەکەی بدات _ کە ئەویش ئەندازەیەکی دیاریکراوەو ئێرە جێگای ئەو تەفصیلە نیە-.سەبارەت بە (قصاص) لەوەدا کە بە قامچی یان گاڵۆك و داریان بە دەست و بازو لە یەکێکی دیکە بدات بۆ وێنە: ئەگەر چەپۆکێك یان زللەیەکی تێسرەوێنی و کوڵمی برینداربکات یان بۆکزێکی لێبداو برینداری بکات یان بەگاڵۆك لێیدات یان نمونەی ئەمانە، ئەوە دەستەیەك لە زانایان دەفەرموون: ئەو جۆرە لێدانە (قصاص نیە) بەڵکو تەنها سەرزەنشتی دەکرێت و بەس چوونکە ئەو جۆرە برین و لێدانانە ناتوانرێت یەکسانی تێدا رەچاو بکرێت!!

بەڵام ئەوەی لە هەر چوار خەلیفە راشدینەکان و صەحابەکان و تابعینیش- خوایان لێ رازی بێت- ریوایەت کرابێت ئەوەیە کە لەو جۆرە لێدانانەشدا _چەپۆك، بۆکز، زللە...هتد- تۆڵە هەیەو دەبێت بکرێت، وە شایەنی باسە ئیمام ئەحمەدو زۆرێك لەشەرعزانانیش بۆچونیان وایەو سوننەتی

پێغەمبەری خواش(ﷺ) هەر بەو شێوەیە بووەو بەلای منیشەوە ئەمەیان ڕاستترو پەسەندترە.

(ئەبو فیداس) دەڵێت: (عومەری کوری خطاب_خوای لێ ڕازی بێ- وتارێکی دا و تێیدا فەرمووی: (ئاگادار بن، سوێند بە خوا من والیەکان بۆ ئەوە نانێرم بۆ لاتان کە لێتان بدەن‌و پارەتان لێ وەربگرن بەڵکو دەیاننێرم تا دینەکەتان‌و سووننەتی پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) فێر بکەن بۆیە هەرکەستان زیاد لەوەتان لەلایەن والیەکەتانەوە پێکرا، ئەوە با بەرزیکاتەوە بۆلای خۆم‌و ئاگادارم کاتەوە. دەی بەو خوایەی کە گیانی منی بە دەستە دەبێت تۆڵەی بۆ بکەمەوە لێیان. جا لەو کاتەدا (عەمری کوڕی عاص) هەستایە سەر پێ وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران ئەگەر پیاوێك لە موسوڵمانان کرایە ئەمیری دەستەیەك لە موسوڵمانان ئەویش بۆ ئەدەب فێر کردن لە ژێر دەستەکانی خۆی بدات تۆ هەر تۆڵەی لێدەکەیتەوە؟!!! عومەر _خوای لێ ڕازی بێت_ فەرمووی: بەڵێ سوێند بەو خوایەی کە گیانی محمدی بە دەستە دەبێت تۆڵەی بۆ لێبکەمەوە چونکە من پێغەمبەری خوام بینیوە تۆڵەی لە خۆی کردۆتەوە جا بۆیە وریا بن لە موسوڵمانان مەدەن و زەلیل یان بکەن وە مافەکانیشیان لێمەنع و زەوت مەکەن‌و بیبڕوایان بکەنەوە (ئیمام أحمدو غەیری ئەویش ریوایەتیان کردوە).

تێبینی: لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە والی بەلێدانێکی ناجائز لەژێر دەستەکانی بدات بەڵام ئەگەر لێدانەکە شەرعی بێت بە ئیجماع(قصاص)ی تێدا نیە چوونکە ئەو لیێدانە یان واجبە یان سوونەتە یان موباح ە!!!

# تۆڵە سەندنەوە _قصاص_لە کەرامەتدا

بە هەمان پێودان تۆڵەسەندنەوە لە کەرامەتیشدا شەرعیەو بەڵگەی قورئان و سوونەتیشی لەسەرە، ئەویش بریتیە لەوەی کە ئەگەر لەحاڵێکدا پیاوێك نەفرەت یان دووعای لە یەکێکی تر کرد کابرای دووەم بۆی هەیە هەمان رەفتاری لە ئاقاردا بکاتەوە بە هەمان شێوەش ئەگەر جنێوێکی پێدا ئەوە بۆی هەیە پێی بداتەوە بەمەرجێ جوێنێکی درۆ نەبێت بەڵام لەگەڵ ئەوەش چاوپۆشی و لێبوردن چاکترە وەك خوای گەورە دەفەرموێت (وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ(٤٠)وَلَمَنْ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُوْلَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ) (الشورى:٤٠-٤١) (سزای خراپە دەرهەقکردن خراپەی وەك خۆیەتی بەڵام هەرکەس لەجێی تۆڵە، لێبوردن و چاکسازی لێبوەشێتەوە ئەوە بێگومان پاداشتی لەسەر خوایە بەراستی خوا ستەم کارانی خۆش ناوێت بەڵام هەرکەسێکیش لە پاش ئەوەی کە ستەمی لێکراو تۆڵەی خۆی وەسەنێت و بە جواب بێت ئەوە هیچ تاوانێکی لەسەرنیە -لەو تۆڵە سەندنەوە لە ستەمکارەکە-وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (المستبان ماقالا فعلى البادىء منهما مالم يعتد المظلوم) رواه مسلم. جا ئەو جنێودانەش کە درۆ هەڵنەگرە وەکو ئەمەی کە باسی کردەوەیەکی قەبیح بکات کە راستەوخۆ تێیدا بێت و حاشا هەڵنەگر بێت، بەڵام ئەگەر کابرا جنێوێکی پێدا کە درۆ بوو بۆی هەڵبەست _واتە: شتێك کە تێیدا نەبێت _ئەوە بۆ کابرای دووەم حەڵاڵ نیە لە تۆڵەی خۆیدا ئەمیش درۆیەکی بۆ هەڵبەستێت یان ئەگەر کابرای بەناهەق کافرو فاسق کرد ئەوە ئەم بۆی نیە کابرا فاسق و کافر بکات، هەروەها ئەگەر نەعلەتی لە باوکی یان خزمەکانی یان خەڵکی شارەکەی کرد ئەوە ئەم بۆی نیە وەك ئەو دەست بکات بە جنێودان بە خزمو باوك و هاوڵاتیەکانی ئەو، خۆ ئەوان بێتاوانن و

هیچ ستەمێکیان دەرهەق بە ئەم نەکردووە خوای گەورەش دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّه شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى) (المائدة:٨) لێرەدا دەبینین خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ فەرمان بە موسوڵمانان دەکات کە ڕق و لێبوردنیان بۆ بێبڕوایان هەڵیان نەپێچێ و وایان لێ نەکات کە عەدالەت بەرپا نەکەن بەڵکو پێیان دەفەرموێت: (إعدلوا هو أقرب للتقوى) ئەگەر کابرا ئەو دەست درێژییەی کە کراوە لە کەسایەتی لەبەر ئەو حەرام بوو کە ماف، خۆیەتی چونکە بەو هۆیەوە ئازار و ئەشکەنجەی پێ دەگەیشت ئەو بۆی حەڵاڵەو بە ئەندازەی ئەو دەستدرێژیە کە لێی کراوە تۆڵەی لێبکاتەوە وەك دوعالێکردنی بە گوێرەی ئەو دوعایە کە لێی کردووە بەڵام ئەگەر ئەو دەستدریژیە لەبەری ماف خوا _حق الله_ بوو وەك درۆ کردن ئەوە بە هیچ شێوەیەك ئەم هەمان ڕەفتاری بۆ حەڵاڵ نیە بە هەمان شێوە زۆربەی (شەرعزانان)یش دەفەرمون: ئەگەر کابرایەك بە سوتاندن یان خنکاندن یان شێوازی ئەمانە کابرایەکی تری کووشت ئەوە چی کردووە دەبێت ئاوهای پێ بکرێتەوە بە مەرجێك ئەو ڕەفتارەی کە بابا ی یەکەم کردویەتی خۆی لە خۆیدا حەرام نە بێت وەك ئارەق دەرخواردان یان نێربازی لەگەڵکردنی بە زۆرە ملێ. هەندێکیش لە زانایان دەڵێن نەخێر نابێت ئەو ڕەفتارەی کە کابرای یەکەم کوشتنەکەی پێ ئەنجامداوە هەر ئەوەی دەرهەق بکرێتەوە بەڵکو تۆڵەکەی تەنها بە شمشێرە. بەڵام شایەنی باسە رای یەکەمیان زیاتر لە ( قورئان)و سونەت و عەدالەتەوە نزیکترە.

# فەصلی چوارەم

# حەدی بووهتان هەڵبەستن _القذف_

ئێمە پێشتر وتمان ئەگەر كابرا درۆیەكی بۆ یەكێكی تر هەڵبەست ئەوە ئەم بۆی نیە تۆڵەی خۆی لێبسەنێتەوەو هەمان ڕەفتار ئەنجام بدات، بەڵام ئەویش هەر لێی ناگەڕێت ئەركو سزایەكی تری بۆ دانراوە جا یەكێك لەوانە حەددی بوهتان كردنە كە بە قورئانو سوننەتو كۆڕا (أجماعی) زانایان جێگیر بووە خوای گەورە سەبارەت بەوە دەفەرموویت (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ(٤)إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (النور:٤-٥)واتە: ئەوانەی كە ئافرەتانی موسوڵمانی داوێنپاك تۆمەتبار دەكەن بە زینا پاشان ئەگەر لەسەر ئەو دەعوایەیان چوار شایەتی پیاویان نەهێنا ئەوا هەشتا شەلاقیان لێدەن، وە هەرگیز شایەتیدانیان وەرمەگرن بەڕاستی ئەوانە لە گرۆی لا ڕێبووان و لادەرانن، تەنها ئەوانەیان نەبێت كە لە دوای ئەو كارە نابەجێیەیان پەشیمان دەبنەوەو خۆیان چاك دەكەن .بەراستی خوا لێبووردە و میهرەبانە جا بۆیە ئەگەر بابایەكی ئازاد یەكێكی موسوڵمانو داوێنپاكی تۆمەتبار كرد بە زینا یان نێربازی وە بۆ ئەو دەعوایەشی شایەتی نەبوو _بەو شێوەیەی كە لە ئایەتەكەدا روون كراوەتەوە _ئیتر ئەوە حەدی بوهتانكردنی دەكەوێتە ئەستۆ ئەویش بریتیە لە ٨٠ شەلاق، بەڵام ئەگەر بە غەیری زینا تۆمەتباری كرد ئەوە سزاكەی تەنها بە شێوەی تەعزیرە، جا شایەنی باسە حەددی بوهتان ماڤ بوهتان بۆ هەڵبەستراوەكەیە چونكە بە یەك دەنگی فوقەهاء بە داواكاری ئەو نەبێت ئەو حەددە جێبەجێ ناكرێت، جا ئەگەر لەحەلێكدا كابرای بووهتان بۆ هەڵبەستراو لە بوهتان چیەكە خۆش بوو چاوپۆشی لێدەربری ئەوە لە لایەن جەماوەری زانایان حەدەكەی لەسەر

لادەبرێت ،چونكه ئەمیش وەك تۆڵە سەندنەوە لە قەتڵو ماڵو دارایدا بە زۆری مافی ئادەمیە نەك مافی خوا وتراویشە هەر لەسەری لاناكەوێت چونكه بە زۆری مافی خوا_حق الله _تێیدا لە نێوان حەدی بوهتانو قصاص لە قەتڵو ماڵو دارای دا جیاوازی هەیە و زۆر وێك ناچن.

وە هەروەها حەددی بوهتان كردن كاتێك واجب دەبێت كە بابابی بوهتان پێكراو (موحصەن) بێت واتە: موسوڵمانێكی ئازادی داوێن پاك.

بەڵام كابرای بوهتان بۆ كراو ئەگەر مرۆڤێكی خراپەكارو بێ فەڕ بوو _ واتە :موحصەن نەبوو– ئەوە بوهتان كەرەكەی حەدی لێنادرێت بەڵكو تەنها سەرزەنشت تعزیز ئەكرێت بەهەمان شێوەش ئەگەر بوهتان بۆكراو كافر یان كۆیلە بێت هەر حەد لە بووهتان بۆ هەڵبەستەكە نادرێت.

وە هەروەها مێرد بۆی هەیە ئەگەر خێزانی زینای كردو سكی پر نەبوو ئەوا بۆی هەیە تۆمەتباری بكاتو ئاشكرای بكات جا ئەگەر لە حاڵەتێكدا خێزانەكەی زینای كردو سكی پر بو ئیتر ئەوە ئەو حەلە ئەركی سەرشانیەتی كە تۆمەتباری كات بە زیناكردنو حاشا لەو منداڵە بكات كە لە سكیایەتی بۆ ئەوەی منداڵێك كە فڕی بەسەر ئەمەوە نیە بە خۆرایی نەبێتە منداڵیو پێوەی نەبەسترێت جا ئەو كاتەی كە مێرد خێزانەكەی تاوانبار كرد بە زینا یان خێزانەكەی دانی پیانا و ناتوانێت بەرگری لێ بكات یان وا نابێتو دێتە بەرگری لەخۆكردن ئەو كاتەش حاڵەتی مولاعەنە دێتە پێشەوە هەروەك خوای گەورە لە قورئاندا باسی كردووەو سونەتی پێغەمبەر (ﷺ)ی لەسەرە.

وە ئەگەر بابای بوهتان كەر كۆیلە بوو ئەوە حەددەكەی نیوەی حەدی كابرای كابرای ئازادە بەهەمان شێوە لە حەددی زیناو ئارەق خواردنیشدا وەك خوای گەورە سەبارەت بە ئافرەتی كەنیزەك دەفەرموێت: (فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ) (النساء:٢٥)واتە: (ئەگەر خراپەیەكیان لێوە دەركەوت ئەوە نیوەی سزای

ئافرەت ی موسوڵمان و داوێن پاکیان لە ئەستۆدایە) بەڵام ئەگەر حەددەکە کوشتن یان دەست بڕین بوو ئەوە لەو دەمەدا نیوەبەنیوە ناکرێت بەڵکو هەر وەك حەددی پیاوی ئازادە.

# ( مافی ژن و مێردایەتی )

واجبێکی شەرعی و داکۆکی لەسەرکراوە کەدەبێ لەنێوان(ژن و مێرد) دا بەو شێوە حوکم بکرێت کەخوای میهرەبان فەرمانی پێکردووە، ئەویش لەهەڵبژاردنی هێشتنەوەی ئافرەتەکە بەشێوەیەکی چاك و پاك یان تەلاّقدان و لێ جیابونەوەی بە چەشنێکی شەرعی و ڕێك و ڕاست. وەهەمدیسان ئەرکی سەرشانی هەریەك لە ژن ومێردە کە بەدڵێکی پاك و دەرونێکی فراوانەوە مافەکانی یەکتر بۆ یەکتر دەستەبەر بکەن و فەراهەم بێنن، بەڵێ: لەبەرنامەی خوادا ئافرەت مافی بەسەر ماڵ و دارایی مێردەکەیەوە هەیە کە بریتییە لە(مارەیی و پێداویستی ژیان). وەهەروەها مافیشی بەسەر جەستەیەوە هەیە کە بریتیە لە تێکەڵ بوونی و ژیان و سەرجێگەیی کردنی، بەجۆرێك، ئەگەر لە حاڵێکدا مێردە سوێند بخوات کە بە چوار مانگ بەرەوژوور سەرجێگەیی لەگەڵ نەکات ئەوە خێزانەکەی بە کۆڕا(إجماع)ی موسڵمانان مافی لێجودا بوونەوەی هەیە، وەبەهەمان پێودان ئەگەر پیاو ئالەتی جیماع کردنی نەبێت، یان تەواو نەبێت و لەسەرجێگەیی کردنی خستبێت، ئەوە هەر خێزانەکەی مافی شەرعی خۆیەتی کەلێی جودابێتەوە،وە لەلای زۆربەی زۆرینەی زانایان جیماع کردن لەگەڵ خێزاندا هەر واجبە. هەرچەندە وتراویشە: واجب نییە چونکە سروشتی مرۆڤ خۆی بۆخۆی داکۆکی لەو حاڵەتە دەکات و حەزی لێیەتی ئیتر پێویست بە تکلیف ناکات، بەلاّم ئەوەی کەڕای ڕاست بێت و قورئان و سوننەتیش پاڵپشت و بەڵگەی بن ئەوەیە کە واجبە.ئەوەتا کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبینێ کە(عبداللەی کوڕی عومەر)-خوالێی ڕازی بێ- زۆربەی کاتەکانی سەرگەرمی نوێژو ڕۆژو گرتنە یەکسەر پێی دەفەرموێت: (إن لزوجك عليك حقا...) أخرجه البخاري ومسلم.

پاشان له مەڕ ئەندازەی چونە لای خێزانیشەوە وتراوە: هەر چوار مانگ جارێك واجبە بچیتە لای. وە وتراوە: نەخێر دیارینەکراوە بەکاتەوە بەڵکو بەگوێرەی توانای خۆی و پێویستی خێزانەکەیەتی، هەروەکو چۆن نەفەقەش هەروایە، ئەم ڕای دووەمیشیان ڕاستترە.

وەهەروەها مافی مێردە بەسەر خێزانەکەیەوە کەهەر کاتو ساتێك ویستی لەسەربوو بچێتە لای ئەوە ئامادەبێو هیچ ملە جیڕە نەکەن، ئەگەر زیانی جەستەیی پێ نەدەگەیاند، یان سەرقاڵی نەدەکرد لە ئاقار واجبێکی گەورەتر.وەهەمدیسان بەمۆڵەتی مێردەکەی نەبێت بۆی نییە لە ماڵ دەرچێت.

وەهەروەها شەرعزانان جیاوازنکە: ئایا خزمەتکردنی ماڵەوە وەك جێگە داخستن و گسك دان و چێشت سازکردن و نمونەی ئەمانەش لەسەر خێزان واجبە یان نا؟ وتراوە: بەڵێ لەسەری واجبە. دەشڵێن: واجب نییە. هەندێکیش دەڵێن: واجبە بەڵام بە ئەندازەیەکی کەم وسادە.

# فەصڵی شەشەم

## الأموال- ماڵ و دارایی

بەنیسبەت پارە و سەروەت و سامانەوە، ئەویش بە هەمان چەشن(واجب)ە بەشێوەیەکی داد پەروەرانە لەنێو خەڵکی دا حوکمی لەسەر بکرێت و خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ)چۆنیان فەرمووە دەبێ وابکرێ و تەنها پەیڕەویش لەوە بکرێت. وەك: دابەشکردنی سەروەت وسامانی مردوو بەسەر وەرەسەکانیدا بەو چەشنەی کەلە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ)ڕوون کراوەتەوە.

وەهەم دیسان ئەو کێشانەی کەلەنێو خەڵکی دا دروست دەبێ لەبارەی سەوداو کڕین و فرۆشتنەوە.... وەك(بیع، ئیجار، وەکالەت، شەریکی، بەخشین، وەقف، وەصیەت) و جۆرەکانی تری سەوداو ئاڵوگۆڕکردن . واجبە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بۆ خەڵکی چارەسەر بکرێن، چونکە هەر ئەو دادپەروەرییەیە بوەتە هۆی جێگیربوون و بەڕێوەچوونی جیهان، بە شێوەیەك حاڵ و باڵی دین و دونیای خەڵکی بەوە نەبێت چاك نابێ و دانامەزرێت!!.

ڕەچاوکردنی عەدلیش لە کڕین و فرۆشتندا دەبێتە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: (العدل الظاهر- دادی ڕوون و ئاشکرا) بەجۆرێك هەموو کەسێك بە عەقڵی خۆی هەست پێ دەکات و پەی پێدەبات، وەك ئەمەی کە(واجب)ە بابای(بکڕ) خێرا پارەکە تەسلیمی(فرۆشیار)ەکە بکا و بابای فرۆشیاریش فرۆشراوەکە تەسلیمی بکڕەکە بکات. یان حەرام بوونی سوك کێشان لە تەرازوو بازی و کێشانە و پێوانەو ڕەچاوکردن و بەرچاوگرتنی ڕاست گۆیی و درۆ نەکردن، وەحەرام بوونی ناپاکی و عەیب شاردنەوە و غەش کردن، یان ئەمەی کە پاداشتی قەرزکردن گێڕانەوەیەتی بۆ خاوەنەکەی لەگەڵ سوپاس و ڕێزدا....هتد.

**بەشی دووەم: (العدل الخفی –دادی پەنهان و دەرنەکەوتوو) ئەم جۆرەشیان بەڕوونیو تێرو تەسەلی لەبەرنامەی ئیسلامدا توێژراوەتەوە. چونکە بەگشتی ئەو سەوداو کڕینو فرۆشتنانەی کەلە(قورئان و سوننەت)ی پێغەمبەردا(ﷺ) جڵەوگیری و بەرگرییان لیٚ کراوە هەرهەمووی دەگەڕێتەوە بۆ بەرپاکردن و بەرقەراربوونی(عەدل) وە ڕیشەکێش کردنی (ستەم) بەگەورە و گچکەیەوە. وەك: ئەم جۆرە سەودایانە:**

**١. (أكل المال بالباطل): خواردنی ماڵی خەڵکی بەشێوەیەکی ناڕاستو نابەجیٚ.**

**٢. (الربی بأنواعه): سوود خواردن بە تێکڕی جۆرەکانیەوە.**

**٣. (بیع الغرر): سەودایەك کە غەرەری تێدابێت، بەشێوەیەك خەڵکی هەڵخەڵەتێنی و قۆڵیان ببڕیت.**

**٤. ( بیع حبل الحبلة): فرۆشتنی بێچوی حەیوانی ئاوس.**

**٥. (بیع الطیر في الهواء): فرۆشتنی پەلەوەر لە ئاسماندا.**

**٦. (بیع السمك في الماء) : فرۆشتنی ماسی لەناو ئاودا.**

**٧. (البیع إلی أجل غیر مسمی)فرۆشتنی شتێك بۆ کاتێکی ناو نەبراو و دیارینەکراو.**

**٨. (بیع المصرات) : حەیوانێك چەند ڕۆژێك نەیدۆشی بۆئەوەی شیر لەنێو گوانیدا بمێنێتەوە و گوانی بئاوسێت و حەڵکیش وابزانێت ئەمە عادەتی ڕۆژانەی ئەم حەیوانەیە.**

**٩. (النجش): زەم کردن بەسەر کڕین و فرۆشتنی خەڵکیدا.**

**١٠. (بیع الثمر قبل بدو صلاحها): فرۆشتنی بەرووبوم پێش پێگەیشتنی.**

**ئەمانەو چەندەها جۆری دیکە کەلە(قورئانو سوننەت)ی پێغەمبەردا (ﷺ) جڵەوگیرییان لێکراوە.**

بەلاّم هەندیّ سەودا هەن لەبەرئەوەی زۆر ڕوونو ئاشکرانین زانایان جیاوازیو مشتومڕیان تیّدا هەیە، بەجۆریّك هەندیّکیان پیّیان (صەحیحە)و هەندیّکیشیان بەلایانەوە(فاسد)ە. خوای پەروەردگاریش دەفەرموویّت: (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً) (النساء:٥٩)

واتە: (ئەی ئەوانە بڕواتان هیّناوە : گویّڕایەڵیو فەرمان بەری خوا بکەن، وەگویّ ڕایەڵی وفەرمانبەری پیّغەمبەر(ﷺ)بکەن، وەلیّپرسراوانو خاوەن دەستەلاّتان کەلەخۆتانن.وە ئەگەر هاتوو لە شتیّکدا ناکۆکیتان تیّکەوت، ئەوە بۆ چارەسەرکردنەکەی بیگیّڕنەوە بۆلای خوا و پیّغەمبەر(ﷺ) ئەگەر ئیّوە ڕاست دەکەن بڕواتان بەڕۆژی دوایی هەیە، بەڕاستی هەرئەوە خیّرەو هەرئەوەش سەرئەنجامی چاکترە).

بنچینەی ئەمەش دەگەڕیّتەوە بۆ ئەوەی کە:

هەر سەودا و ئاڵوگۆڕیّککەخەڵکی ئیشیان تیّی کەویّت و پیّویستیان پیّی بیّت.... ئەوە بە هیچ شیّوەیەك نابیّت لەسەریان حەرام بکریّت، مەگەر ئەوەیان کە قورئان و سوننەت بەڵگەبن لەسەر حەرام بوونی، هەروەك لە عیبادەتدا نابیّت شتیّك بڕیاربدریّت مەگەر قورئان و سوننەت بەڵگەبن لەسەر شەرعی بوونی.

چونکە دین هەرئەوەیە کەخوا بڕیاری لەسەر داوە، حەرامیش ئەوەیە کە خوا حەرامی کردبیّت، وە بەپیّچەوانەی ئەوانەی کە خوا زەمم و سەرزەنشتی کردوون، بە جۆریّك لەدینی خوادا هەندیّك شتیان حەرامکردووە لە کاتیّکدا خوا بڕیاری حەرامبوونی نەداوە و بەبیّ مۆڵەتی خواش بەرنامە و پەیڕەویان بۆ خەڵکی داڕشتووە.

# فەصلی حەوتەم

## ( ڕاوێژکردن بۆ لێپرسراو زۆر پێویستە )

لێپرسراو بە هیچ شێوەیەك نابێت پێی وابێت لە موشاوەرەو ڕاوێژکردن بێنیازەو پێویستی پێی نییە، چونکە خوای کاربەجێ فەرمانی بە پێغەمبەر(ﷺ)کردووە کە هەردەم ڕاوێژ بە یارەکانی بکات وەك دەفەرمووێت: (فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ). (ال عمران:١٥٩) واتە: ( ئەی محمد (ﷺ) ئەگەر هاوڕێکانت لارییەکیان ئەنجامدا ئەوە لێیان ببورە و لەخوا بۆیان بپاڕێوە و لە کاروبارەکانتدا ڕاوێژیان پێبکە، وەئەگەر هەرکارێك نیازت بۆکرد ئەنجامی بدەی-لە دین و دونیا- ئەوە تەنها و تەنها پشت بە خواببەستە، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە هەردەم پشتی پێدەبەستن.)

وە لە (ئەبو هورەیرەوە)-خوالێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ( لم يكن أحد أكثر مُشاورة لأصحابه من رسول الله)) رواه الترمذي. واتە: (هیچ کەسێك وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕاوێژی بە هاوڕێ و یارەکانی خۆی نەدەکرد). زانایان دەفەرموون: خوای کاربەجێ لەبەر سێ(حیکمەت) فەرمانی بە پێغەمبەر(ﷺ) کردووە کە هەمیشە ڕاوێژ بە هاوەڵەکانی بکات:

١. بۆئەوەی دڵیان ڕاگرێ و پەیوەستیان کات بەخۆیەوە.

٢. وە تا لەپاش کۆچی دوایی خۆی موسڵمانان چاوی لێکەن و شوێن پێی ئەو هەڵگرن.

٣. وەلەبەرئەوەش کە هەندێ کاروبار و ووردە بابەت هەیە لە ژیاندا قورئانی پیرۆز لە ئاقاریان دانەبەزیوە.بۆچون و هەڵوێستی ئەوانی تێدا وەرگرێت. وەك: کاروباری جەنگ و جیهاد..... ووردە بابەتە جوزئییەکان.

کەواتە: لەلایەك ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو شێوە ئەوەندە پێویستی بەڕاوێژکردن هەبێت، ئەوە غەیری ئەو بێگومان حەوجار حەوجار پێویستی پێیەتی.

وەلەملاشەوە خوای گەورە موسڵمانانی بەوە (مەدح) کردووە کەلەکاروبارەکانیاندا هەمیشە و هەردەم (ڕاوێژ) دەکەن. وەك: دەفەرمووێت: (وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ(٣٦)وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ(٣٧) وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ) (الشورى:٣٦-٣٧). واتە: ( ئەوەی لە بەهەشتدا خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن چاکتر و بەردەوامترە لە ناز و نیعمەتی دونیا.ئەو بڕوادارانەش ئەوانەن کە ئەم سیفەتانەیان تیادابێت:

یەکەم: ئەوانەی کە وازیان لە گوناهە گەورەکان و شەڕوالْ پیسی و زینا هێناوە و بەهیچ شێوەیەك نزیکی ناکەونەوە.

دووەم: وەئەگەر کەسێك خراپەیەکیان لەگەڵ ئەنجام بدات و دەرئەنجام تووڕە بن.. ئەوە یەکسەر لە بابای خراپەکار خۆش دەبن و چاوپۆشی لێدەکەن.

سێ هەم و چوارەم: وە ئەوانەی کە وەڵامی پەروەردگاری خۆیان دەدەنەوە لە کاتێکدا ئەگەر بانگهێشت بکرێن بۆ بەیەك زانین و پەرستنی خواو وازهێنان لەبەندایەتی غەیری ئەو.وە بەو شێوەیە کەخوا فەرمانی پێکردووە نوێژەکانیان ڕادەپەڕێنن.

پێنجەم: وەئیش و کارەکانیان لە نێوان خۆیانداو بڕیاردانیان لەسەری بەپێی ڕاوێژە.

شەشەم: وە ئەو ڕزق و ڕۆزییەی کە ئێمە پێمان داون، لە پێناوی خوادا لێی دەبەخشن و مافەکانی لێدەردەکەن). جا ئەگەر لێپرسراو لە شتێکدا ڕاوێژی

بەموسڵمانان کردوو ئەوانیش بۆیان ڕوونکردەوە کەلەو شتەدا بەڵگەی قورئانو سوننەتو ئیجماعی لەسەرە...ئەوە لەسەری واجبە پەیڕەوی بکاتو بەموو لێی لانەدات، وە لەشتێکدا کە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێت نابێت گوێڕایەڵی کەس بکرێت، ئیتر ئەگەرچی ئەو کەسە لەدین و دونیادا زۆر لەب لەبان و پایە بەرزیش بێت.

لەملاشەوە ئەگەرهاتوو ئەو کارەی کەلێپرسراو تیایدا ڕاوێژ بە موسڵمانان دەکات شوێنی ڕاو بۆچونی زۆر و(إختلاف)بوو، ئەوە لەو دەمەدا پێویستە گوێبگرێت بۆ بۆچونی هەموویان وباش لێیان تێڕامێنێت، جالەپاشدا زۆر بەوردی بۆچونی هەموویان تاوتویٚ بکات و لێی بکۆڵێتەوە و هەرکامێکیان زیاتر لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە نزیکتربوو-نەك ئارەزووی خۆی- ئەوە دەبێت تەنها پەیڕەوی لەوە بکات. وەك پەروەردگار دەفەرمووێت: (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً) (النساء:٥٩)

(ئەگەر هاتوو لەشتێگدا ناكۆكیتان تێكەوت، ئەوە بۆ چارەسەركردنەكەی بگەڕێنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر(ﷺ)ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە بەڕاستی هەر ئەوە خێرەو هەر ئەوەش چاكترین لێكدانەوەیە...)!!.

وەشایەنی باسیشە (أولوا الأمر)- كەخوای گەورە گوێڕایەڵییانی بەدووی گوێڕایەڵی خۆی و پێغەمبەردا(ﷺ)هێناون-دەبن بە دوو كۆمەڵەوە:

كۆمەڵی یەكەم: (الأُمراء) لێپرسراوانی موسڵمانان.

كۆمەڵی دووەم:(العُلماء) زانایانی ڕەسەن و ڕاستەقینە.

بێگومان ئەگەر ئەم دوو تاقمە خۆیان باشكەنو بۆخوا بصوڵحێن، ئەوە هەموو خەڵكیش بەهۆیانەوە باش دەبن، وەهەریەكێك لەم دوو دەستەیە

ئەركی سەرشانیانە لە هەر شتێكدا كە دەیڵێن یان دەیكەن دەبێت مەبەستیان گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ)بێت.
وە دەبێت تەنها و تەنها شوێنی بەرنامەكەی خوابكەوون و خۆیان بە عائیدی هیچ شتێكیتر نەزانن.
وە هەركێشەیەكیش كە ڕوودەدات‌و دێتە بەردەستی لێپرسراو هەتا بگونجێت دەبێت بگەڕێت‌و بزانێت لە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) چۆن باسكراوەو چ چارەسەرێكی بۆ دانراوە؟ جائەگەر بۆی ڕوون بووەوە.. ئەوە واجبە پەیڕەوی لێ بكاو بە هیچ شێوەیەك بۆی نییە بەموو لێی بترازێت.بەڵام بەهۆی نەبوونی كاتی نەگونجاوەوە یان پەلەپەلی خاوەن كێشەكەوە یان چەند بەڵگەیەك لە "قورئان"و"سوننەت"دا هەبوون لای ئەم هەموویان وەكیەك بوون و ئەمیش نەیدەتوانی بەڕاشكاوی بزانێت "قورئان و سوننەت"چی دەڵێت؟! ئەوە بۆی هەیە هەر زانایەك كەخۆی لە "دین"و "عیلمی" ڕازییە "تەقلیدی" بكات. ئەمەش لەمبارەوە بەهێزترین بۆچوونە. بەڵام وتراوە: بەهیچ شێوەیەك لە هیچ كاتێكدا بۆی نییە"تەقلید"ی بكات، وە وتراوە: بەڵكو لە هەموو كاتێكدا بۆی هەیە "تقلید"بكات. بەڵام بۆچونی یەكەمین بەهێزترینە.
وەهەمدسیان ئەو مەرجانەی كە دەبێت لە "قازی" و "والی" یەكاندا هەبن دەبێت بەگوێرەی توانا ڕەچاویان بكاو پش گوێیان نەخات. بەڵكو هەموو دروشم‌و پەبڕەویەكانی ئیسلام لەكاتی تواناو(قودرەت) بەسەر داشكاندا "واجب"و پێویست دەبن. بەڵام ئەگەر ئەوكارە لەتوانادا نەبوو، ئەوە خوای گەورە ڕەچاوی توانای مرۆڤی كردووەو زیاد لەسنوری توانای خۆی (تەكلیفی) لێ نەكردووە. هەربۆیەش دەبینین خوای دادگەر لەحاڵتی ئاسایی مرۆڤدا فەرمانی پێكردووە كەئەگەر هەستا بۆ نوێژكردن ئەوە دەبێت بە(ئاو) دەستنوێژ بگرێ‌و خۆی پاك بكاتەوە بەڵام ئەگەر ئاونەبوو یان بەهۆی

کاریگەری سەرماوە یان برینەوە دەترسا بەبەکارهێنانی ئاوەکە دووچاری زیانێك ببێت... ئەوە بۆی هەیە(تەیەمموم) بکات، یان دەبینین پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە(عیمرانی کوڕی حوصەین) دەفەرموێت: (بەپێوە نوێژەکەت بەرپاکە، ئەگەر نەتتوانی ئەوە بەدانیشتنەوە، ئەگەر بەدانیشتنەوە هەرنەتتوانی، ئەوە لەسەر لا بیکە) بوخاریو ئەبوداودو ترمزی گێراویانەتەوە.

جابەو شێوە پەروەردگار نوێژی لەسەر مرۆڤەکان واجب کردووە ئیتر بەهەر شێوەیەك بۆیان بگونجێت جیاوازی نی یە، ئەوەتا دەفەرموێت: (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ(٢٣٨)فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُمْ مَا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ) البقره٢٣٨-٢٣٩.

واتە: (ئەی مسولْمانان زۆر باپەند بن بە نوێژەکانتانەوەو لەکاتی دیاری کراوی خۆیاندا بەو شێوەی خوا فەرمانی کردووە بەرپایان بکەن بەتایبەت نوێژی (العصر) وەلەنوێژەکانتاندا هەستە سەرپێ و زۆر بەداماویو زەلیلیو خاشعیەیەوە لەبەردەم خوادا بوەستن بەلاّم ئەگەر هاتوو کەوتنە ترسو مەیدانی جیهادو تێڕژان لەگەلْ دوژمندا ئەوە بەهەر شێوەیەك کە خۆتان بۆتان دەگونجێت وابەرپای کەن ئیتر بەپیادەیی بێ یان بەسواریو ڕوو لە قیبلە بن یان ڕووی تێنەکەن وەك یەکە، بەلاّم ئەگەر شەڕ هێوور بویەوەو ترس نەما ئەوە وەك چۆن خوا فێری کردن ئاوها نوێژەکانتان بەرپا بکەن بەرکوعو سجودو وەستانو ڕووکردنە قیبلەوە بەو شێوە خوا ئێوەی لە نەزانین فێرکرد).

خوای کاربەجێ (نوێژبەرپا) کردنی لەسەر تێکڕای چینو توێژەکان واجب کردووە، ئیتر مرۆڤەکان لەحالْەتی ترسدابن یان لەحالْەتی سەفەردابن وەك یەکە و ئەو فەرزە خوایی یە لەسەریان ناکەوێت بەلاّم ئەوەندەیە خوای حەکیم نوێژەکەی لەسەر موسافیرو خاوەن ترسو نەخۆش ئاسانتر کردووە هەروەك

قورئان‌و سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ڕونیان کردۆته‌وه یان ده‌بینین په‌روه‌ردگر له‌نوێژدا هه‌ندێ شتی واجب کردوه وه‌ك( خۆپاك کردنه‌وه ده‌ست نوێژگرتن و عه‌وره‌ت داپۆشین و ڕووکردنه قیبله)وهه‌ندێ شتی دیکه به‌ڵام ئه‌گه‌ر له‌توانایدا نه‌بوو ئه‌نجامیان بدات ئه‌وه واجبه‌که‌ی له‌سه‌ر شان لابردووه.

بۆ نمونه: ئه‌گه‌ر کۆمه‌ڵێ موسڵمان (چه‌ته) ڕێگه‌ی پێگرتن‌و جله‌کانیان فڕاندن ئه‌وه به‌گوێره‌ی حاڵی‌خۆیان ده‌توانن نوێژه‌که‌یان به‌ڕووتی به‌رپابکه‌ن یان ئه‌گه‌ر قیبله‌یان لێ تێکچوو نه‌یانزانی چی بکه‌ن ئه‌وه ده‌بێ ئه‌ندازه‌یه‌ك زه‌حمه‌ت بکێشن تابیدۆزنه‌وه، ئه‌گه‌رنا بۆیان هه‌یه به‌هه‌رشێوه‌یه‌ك که‌بۆیان ده‌لوێ نوێژه‌که‌یان به‌رپابکه‌ن هه‌روه‌ك له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا(ﷺ)به‌و شێوه‌یه‌یان کردووه!!.

## جا خوێنه‌ری به‌ڕێز:

جیهادو به‌ڕێوه‌بردنی ئیشوکاری موسڵمانان‌و تێکڕای ئیشوکاره (دین)ی یه‌کانی دیکه‌ش هه‌ربه‌و شێوه ئه‌ندازه‌ی بۆ لوان‌و توانینی تێدا ڕه‌چاوکراوه، بنچینه‌ی ئه‌مه‌ش هه‌رهه‌مووی ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌و ئایه‌ته پیرۆزه‌ی که ده‌فه‌رموێت: (فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ) (التغابن:١٦)

(چه‌نده له‌تواناتاندا هه‌یه‌و بۆتان ده‌لوێ ئه‌وه‌نده پارێز بکه‌ن‌و له‌خوا بترسن).

یان پێغه‌مبه‌ری ئیسلام(ﷺ)ده‌فه‌رموێت: (إذا أمرتكم بأمر فأتوا منه ماأستطعتم) رواه البخاري ومسلم. واته: ئه‌گه‌ر فه‌رمانم پێکردن به‌ئیشێك ئه‌وه ئه‌وه‌نده‌ی بکه‌ن که تواناتان به‌سه‌ریدا ده‌شکێ).

یان په‌روه‌ردگار خوارده‌مه‌نیه پیسه‌کانی حه‌رام‌و یاساغ کردووه‌و له‌گه‌ڵیشیدا ده‌فه‌رموێت: (فَمَنْ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ) البقرة:(١٧٣)

واته: (بەڵام هەرکەس زۆر ناچاری خواردنی بوو وەهیچی تری دەست نەدەکەوت لەکاتێکدا خۆی بەدڵ حەز لەخواردنی نەکات و لەسنوری پێویستیش لانەدات ئەوە بابیخواو هیچ تاوانێکی لەسەر نیە).

وەپەروەردگار دەفەرموێت: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ) (الحج:٧٨).

وەدەفەرموێت: (مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ) (المائده:٦).

بۆیە دەتوانین بڵێین: خوای کاربەجێ هیچ شتێکی واجب نەکردووە کەلەسنوری توانای مرۆڤدا نەبێت وەهەرشتێکیش مرۆڤ زۆر ناچاری بێت ئەوە لێی حەڕام و یاساغ نەکردووە ئەگەر هاتوو هۆی ناچار بوونەکە لە ڕێگەی سەرپێچی پەروەردگاردا نەبوو!!.

# فەصڵی هەشتەم

# بوونی براگەورەو+بەڕێوەبردنی کاروباری بڕواداران سەرمەشق و گەورەی واجباتی دینە

**پێویستە بزانرێت کە:**

بونی براگەوەرو سەرپەرشتی ئیشوکاری موسڵمانان لەگەورەترینی واجباتی ئەم ئیسلامە پیرۆزەیە بەڵکو بەبێ بوونی نەدین بەڕێوە دەچێ و نەدونیاش!!. چونکە مرۆڤەکان بەگشتی هەندێکیان پێویستیان بەپشتگیری هەندێکی تریان هەیە جا ئەو پێویستی و بەرژەوەندیانە کاتێك بۆیان دەستەبەردەبێ و تۆکمە دەبێ کە کۆبن و جەماعەیان هەبێت وەئەگەر جەماعەش هەبوو ئەوە پێویستە سەرکردەیەك هەبێت چونکە جەماعە بەبێ سەرکردە نابێت، تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدهم) رواه أبو داود. واتە: (ئەگەر سێ موسڵمان بۆ سەفەرێك دەرچوون ئەوە بایەکێکیان بکەنە لێپرسراو) وە ئیمامی (احمد) -خوا لێی خۆش بێت- لە موسەنەدەکەیدا لە (عبداللّٰەی کوڕی عومەرەوە) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لا يحل لثلاثة يكونون بفلاة من الأرض إلا أمروا عليهم أحدهم) واتە: (بۆسێ موسڵمان حەڵاڵ نیە کەلەدەشتێکدا بن مەگەریەکێکیان بکەنە بەرپرسی خۆیان). لێرەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەسەفەرێکدا کەلەناکاو دێتە پێشەوە و کۆبونەوەیەکی بچکۆلەیە واجبی کردووە کەهەردەبێ یەکێك بکرێتە بەرپرس بۆئەوەی موسڵمانان دەرسی لێ وەربگرن و ئاگادارکردنەوەیەکیش بێت کە تێکڕای کۆبونەوەکانیتر حەوتجار حەوتجار پێویستی بەسەرکردە دەکات، ئەمە لەلایەکەوە:

لەلایەکی دیکەشەوە: چونکە خوای زانا فەرمان کردن بەچاکەو جڵەوگیری کردنی خراپەی لەسەر موسڵمانان پێویستو واجبکردوە دەی بەڵگە نەویستە کە ئەو واجبە خوایی یە بەبێ بونی هێزو دەسەڵات و سەرکردایەتی فەراهەم ناهێنرێت و بەڕێوە ناچێت، وەهەمدیسان سنورە شەرعیەکانیش – کە مایەی ژیانن–بەبێ بونی دەسەڵاتو سەرکردایەتی بەرپاکردنیان زۆر ئەستەمە، هەربۆیە وتەیەکی ڕاست هەیە دەڵێت: (أن السلطان ظل الله في الأرض) واتە: (دەسەڵاتداری موسڵمانان لەنێو زەویدا سێبەری خودایە) وەوتراوە: (ستون سنة من إمام جائر أصلح من ليلة واحدة بلا سلطان).

واتە: (شەست ساڵی پێشەوایەکی خراپو لادەر چاکترە لە یەك شەو بەبێ پێشەواو خاوەن دەسەڵات) ئەزمون گەلی ژیانیش زیاتر ئەمەمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە.

هەربۆیە پێشینان–خوایان لێ ڕازی بێ– وەك فوضەیلی کوڕی عیاض)و (احمدی کوڕی حەنبەل) وغەیری ئەوانیش هەردەم دەیانوت: ئێمە ئەگەرتەنها یەك پاڕانەوەمان هەبایەو خوا وەڵامی بداینایەوە ئەوە بۆ پێشەواو سوڵتانی موسڵمانان پێی دەپاڕاینەوە!!وە پێغەمبەری سەردارو سەروەریش(ﷺ) دەفەرموێت: (إن الله يرضى لكم ثلاثا: أن تعبدوه لاتشركوا به شيئا، وأن تعتصموا بحبل الله جميعا ولاتفرقوا، وأن تناصحوا من ولاه الله أمركم) رواه مسلم. واتە: (بەڕاستی خوا بەسێ شتی ئێوە ڕازییە: بەندایەتی بۆبکەن و بیپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن وەهەموتان دەست بگرن بەبەرنامەی خواوەو دووبەرەکایەتی مەکەن و هەرکەسێك خوا ئیشی ئێوەی پێ سپارد ئەوە ئامۆژگاری لەنێوانتاندا هەبێتو نەسیحەتی بکەن) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: (ثلاث لايغل عليهن قلب مسلمٍ: إخلاص العمل لله، ومناصحة ولاة الأمور، ولزوم جماعة المسلمين فإن دعوتهم تحيط من ورائهم) رواه أهل السنن. وە لەڕێگەی صەحیحەوە

هاتووه كه پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمويەتی: (الدين النصيحة، الدين النصيحة، الدين النصيحة، قالوا: لمن يارسول الله؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم) رواه مسلم والترمذي. وقال حديث حسن صحيح.
واته: (دينی ئيسلام ئيخلاس‌و دڵسۆزييه، دينی ئيسلام ئيخلاس‌و دڵسۆزييه دينی ئيسلام ئيخلاس‌و دڵسۆزييه، وتيان: ئەو ئيخلاس‌و دڵسۆزيه بۆ كێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: (بۆخواو پێغەمبەری خواو پێشەوايان و تێكڕای موسڵمانان).
لەڕاستيدا واجبه موسڵمانان وا هەست بكەن‌و تێبگەن كه بوونی سەركردايەتی‌و (ئەمارەت) دينەو دەبێت بەهۆيەوە خۆيان زياترو زياتر لەخوای (مالك الملك) نزيك بكەنەوە چونكه بەڵگه نەويستە ئەگەر مرۆڤی موسڵمان لەو ڕێگەيەوە خۆی لەخوا نزيك بكاتەوە بەوەی كەلەو كارانەدا كه دێنه پێشەوە تێياندا گوێ ڕايەڵی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بكات ئەوە چاكترين و نايابترينی هۆكاری نزيك بونەوەيه لەخواو ڕەزامەنـدی خوا، بەڵام ئەوەی كەدەيبينين زۆرێك لەخەڵكی بەهۆی سەركردايەتی‌و برا گەورەيەتيەوە دين‌و حاڵی لێ تێك دەچێت... ئەوە هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كه ئەو خەڵكه مەبەستيان پێی خوا نيه بەڵكو ئامانجيان تێيدا بەرزكردنەوەو چوونه سەر كورسی‌و پارەو سامانه، دەی پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرموويەتی: (ما ذئبان جائعان أرسلا في زريبة غنم بأفسد لها من حرص المرء على المال والشرف لدينه) قال الترمذي حديث حسن صحيح.
واته: ( دووگورگی برسی گەر بنێردرێنه ناو ڕانەمەڕێكەوە بۆی خراپتر نی يه لەهۆگربون و تێكۆشانی موسڵمان بۆ پارەو ڕێزو براگەورەيەتی بۆ دينەكەی)
سەيردەكەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)باسی ئەوەی بۆ كردووين كه ئالودە بوونی مرۆڤی موسڵمان بۆ وەدەست خستنی سەروەت‌و سامان‌و لێپرسراويەتی دينەكەی تێك‌و پێكدەداو دەيشڵەقێنێت هەروەك چۆن دوو گورگی برسی

ڕانەمەڕێك تێكو پێكدەدەن‌و هیچی بەساغی‌و سەلامەتی لەژێر دەستیان دەرباز نابێت.. خوای زانا باسی ئەو كەسەمان بۆ دەكات كە لەڕۆژی دواییدا نامەی كردەوەكانی- پەنابەخوا- دەدرێتە دەستی چەپی‌و جا لەو كاتەدا بەحەسرەتەوە دەڵێ: (مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِي*هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِي) (الحاقة:٢٨-٢٩) واتە: (سەروەت و سامانەكەم ئەمڕۆ لەئاست سزای خوا هیچ سودێكی پێ نەگەیاندم وەدەسەڵاتەكەشم لەدەست دەرچوو ئەویش بێ سوود بوو)

وەبەڵگەنەویستە ئەو كەسەی كە تەنهاو تەنها مەبەستی وەدەستخستنی پلەو پایەو لێپرسراویەتیە دەی ئەوە هەرچی لێپرسراویەتیەك وەدەست خات ئەوپەڕی هەروەك (فرعەون) دەبێت وەئەوەیشی مەبەستی كۆكردنەوەی سامان‌و داراییە ئەوە هەرچییەك كۆبكاتەوە ئەوپەڕەكەی هەروەك(قاروون) كۆدەكاتەوە، دەی یاران خوای گەورە وەك ئاگادارین لەقورئانی پیرۆزدا حاڵی فیرعەون‌و قاروونی زۆر بەچاكی بۆئێمە ڕوون كردۆتەوە كە چیان بەسەرهات‌و سەرەنجامیان بۆ كوێ ڕۆی؟ خوای گەورە دەفەرموێت: (أَوَ لَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِنْ قَبْلِهِمْ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الأَرْضِ فَأَخَذَهُمْ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُمْ مِنْ اللَّهِ مِنْ وَاقٍ) (غافر:٢١)

واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) ئایا ئەو بێ بڕوایانە بەنێو زەویدا نەگەڕاون‌و سەیر بكەن‌و تێڕامێنن تابزانن دوا ڕۆژی ئەو بێ بڕوایانەی پێش ئەوان چی بو چۆن بوو؟ لەكاتێكدا ئەوان زۆر لەمان بەهێزتربون‌و خاوەنی سەڵتەنەت بوون وەخاوەنی شوێنەوارو ئاوەدانكردنەوەی زۆرتر بوون لەم زەویەدا بەڵام ئەوە هیچ سودێكی پێ نەگەیاندن‌و خوای گەورە بەهۆی تاوانەكانیانەوە گرتنی‌و لەناوی بردن لەكاتێكدا هیچ شتێك لەسزای خوایێ نەبپاراستن‌و هیچ دەربازكەرێكیان نەبوو...!!)،

وەپەروەردگار لە سورەتی (القصص)دا زۆر بەڕاشکاوی دەیدات بەگوێی مرۆڤایەتیداو دەفەموێت: (تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لاَ يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلاَ فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) (القصص:٨٣)

واتە: (لەڕاستیدا بەهەشتی بەرین‌و خانوی نەبڕاوەی دواڕۆژ تەنها بۆ ئەوانەمان داناوە کەلەزەویدا مەبەستیان خۆ بەگەورەگرتن‌و لەدان لەخراپەکاری نییەو نایانەوێ وەدوا ڕۆژ هەربۆ پارێزکارانە)

جا لەم سۆنگەیەوە لێ پرسراوان و کاربەدەستان دەبن بەچوار بەشەوە:

بەشی یەکەم/ئەوانەن کەدەیانەوێت خۆیان گەورە کەن‌و بەسەر خەڵکیدا زاڵبن‌و فەسادو سەرپێچی خوای گەورە لەنێو زەویدا بەرپابکەن جا بەڕاستی ئەو جۆرە سەرکردەو پاشا گەندەڵ‌و خراپانە وەك (فرعەون)و وە دەستەو دایەرەکەی وان، وەئەوان خراپترینی خەلقی خوان، ئەوەتا خوا سەبارەت (بەفرعەون) کەئەوە سیفاتی بوو دەفەرموێت: (فِرْعَوْنَ عَلاَ فِي الأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُفْسِدِينَ) (القصص:٤)

واتە : ( لەڕاستیدا فرعەون لەنێو زەویدا طوغیانی کردو لەسنور دەرچوو وەخەڵکی گێڕابەچەند بەش‌و تاقمێکەوە بۆئەوەی بۆ ئارەزووەکانی خۆی بەکاریان بهێنێت بەجۆرێك لەنێوانیاندا تاقمێکی بەشێوەیەکی نابەجێ دەچەوساندەوەو کوڕەکانی سەردەبڕین‌و کچەکانی دەهێشتنەوە بەڕاستی فیرعەون لەتاقم و دەستەی تێکدەران و لادەرانە!!)

ئیمام موسلم لە صەحیحەکەی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە(ابن مەسعود)—خوای لێ ڕازی بێت— دەفەموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (لا يدخل الجنة من في قلبه مثقال ذرة من كبر، ولا يدخل النار من في قلبه مثقال ذرة إيمان، فقال رجل: يا رسول الله إني أحب أن يكون ثوبي حسنا، ونعلي حسنا، أمن الكبر ذاك؟ قال: لا، إن الله جميل يحب الجمال الكبر بطر الحق وغمط الناس)

واته: (هەرکەسیّ لەدڵیدا تۆسقاڵیّ لەکیبر هەبیّت ئەوە ناڕواتە بەهەشتەوە وەهەرکەسیێك لەدڵیدا تۆسقاڵیّ بڕوا هەبیّت ناچیّتە ئاگرەوە، لەو کاتەدا پیاویێك وتی: (ئەی پیّغەمبەری خوا (ﷺ) من پیّم خۆشە پیّلاوو کراسەکانم جوان بن ئایا ئەوە کیبرە؟ فەرمووی: نەخیّر خوای گەورە جوانەو جوانیشی خۆشدەویّت کیبر بەرپەرچدانەوەی حەق و بەکەم گرتنی خەڵکییە) لەڕاستیدا ئەم دوو سیفەتە سیفەتی ئەوانەیە کەلەزەویدا لەسنور دەردەچن و خۆبەزل دەگرن و خەڵکی لەدین لادەدەن.

بەشی دووەم/ ئەوانەن کە خراپەکاری دەنیّنەوە بەڵام خۆبەگەورەگرتن و(طوغیانی) لەگەڵ نیە وەك دزەکان و ئەوانەی لەنیّو خەڵکیدا دەروونیان نزمە.

بەشی سیّەم/ ئەوانەن کە حەزیان لەخۆ بەگەورە گرتن و لەسنور دەرچوونە بەسەر خەڵکیدا بەڵام بەبیّ فەساد و خەڵك لەدین لادەدان ئەمەش وەك ئەوانەی کەدینیان هەیەو دەیانەویّ خۆیان بەسەر خەڵکیدا بەرز بکەنەوە.

بەشی چوارەم/ئەم کۆمەڵەیان ئەهلی بەهەشتن، بریتین لەوانەی کەنەخۆیان لەسەر زەویدا بەسەر خەڵکیەوە بەگەورە دەگرن... نەمەبەستیشیان فەسادنانەوەو خراپەکارییە لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار لەغەیری خۆشیان پلەومەقامیان بڵندترە وەك خوای گەورە دەفەرمویّت: (وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنْتُمْ الأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ) (ال عمران: ١٣٩)

واتە: ( کزو لاواز مەبن و خەفەت مەخۆن چونکە هەرئێوە سەرکەوتوترن ئەگەر بڕواداری ڕاستەقینەبن). وەدەفەرمویّت: (فَلاَ تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنْتُمْ الأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَنْ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ) (محمد:٣٥).

واتە: (کز مەبن و خۆتان بەلاواز مەزانن و داوا لە بیّبڕوایان مەکەن بۆ ئاشتی و صوڵح کردن چونکە هەرئێوە سەرکەوتوترن وەخواتان لەگەڵەو یارمەتیتان دەداو هیچ لەپاداشتی کردەوەکانیشتان کەلو نقوستانتان ناکات.

جالەڕاستیدا زۆرێك لەخەڵكی هەبوونو دەیان ویست لوتیان بەرزكەنەوە بەسەر خەڵكیداو صەڵتەنەت بنوێنن بەڵام تەنها نزمیو خواریان بۆ مایەوەو هیچیتر!! وەزۆرێكیش هەبوون لەبەندە صالحەكانی خوا خۆیان نە بەزلزانیو نە خراپەكاریان مەبەست بوو بەڵام خوای گەورە بەرزی كردنەوەو كردنی بەسالار و سەردار!! چونكە خۆ بەرزكردنەوە بەسەر خەڵكیا ستەمەو خەڵكی هەموو هاوچەشن و یەك ڕەگەزن جائەگەر مرۆڤێك بیەوێت خۆی بەرزگرێت بەسەر خەڵكێكەوە كەلەڕاستیدا وەك یەكوان ئەوە زوڵمیان لێ دەكاو سەرئەنجام خەڵكی ڕقیان لێ دەبێتەوەو دژایەتیشی دەكەن، چونكە خەڵكی بەتێكڕا عادلن یان غەیر عادلن جا ئەوەیان كەعادلە پێی ناخۆشە ببێتە ژێردەستەی خەڵكی و ئەوەشیان كە ناعادلە پێی خۆشە خۆی بەرزترو بڵندتر بێت بەسەر خەڵكیدا نەك بەپێچەوانەوە!.

جائەگەر هاتوو مەبەست لەسەروەتو سامانو دەسەڵاتو سوڵتان نزیك بوونەوە بوو لەخواو خەرج كردنی لە پێناو ڕێگەی خوادا ئەوە بێ گوومان چاكسازی ئیصلاحبوونی دینو دنیای بەدوادادێ بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوەو دین لەدەسەڵات جیاكرایەوە ئەوە ژیان و حاڵی خەڵكی تێكەو پێكەوەچێت!!.

وەبێ گومان خەڵكانی صالح و خەڵكانی سەرپێچی كار تەنهاو تەنها بەهۆی نیاز و كردەوەی صالح لەیەكتر جودادەبنەوە چونكە ئەودوو مەرجە لەژیانی مرۆڤدا سەنگی مەحەكە هەروەك لەصەحیحی بوخاری و موسلیمیشدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)كەفەرمویەتی: (إن الله لا ینظروا الی صورکم، ولا الی أموالکم، وإنما ینظر الی قلوبکم وأعمالکم)! واتە: (خواسەیری ڕووكەشو پارەو سەروەتتان ناكات بەڵكو تەنها سەیری دڵەكانتان و كردەوەكانتان دەكات).

جابۆیە كاتێك ویستیماڵو سەروەتو سامان وەدەستخستنو شەرەف پەیداكردن شاباڵی ڕەشی كێشا بەسەر هەندێ لە لێپرسراوانو كاربەدەستان

وەلەبرا گەورەیەتی وبەرپرسایەتیەکەیاندا لەشارێی ئیسلام لایانداو وەدووی ئارەزووکەوتن‌و لەحەقیقەتی (ئیمان) وەدەرکەوتن ئیتر بۆیە خەڵکی پەردە بەنێو چاویاندا دراو زۆرینەی هەرەزۆری خەڵکی وا حاڵیبوون کە سەرکردایەتی‌و بەڕێوەبردنی وڵات پێچەوانەی ئیمان‌و دینەو بەهیچ شێوەیەك پێکەوە نایان گرێ و دانویان پێکەوە ناکولێت.

جالەڕاستیدا ئەم دوو بۆچوونە لارو باتڵە-بۆچونی ئەوانەی خۆیان بەدیندار دەزانن و وەپاڵ دین خراون بەڵام جیهاد و دەسەڵات و سەروەت و سامانیان لەدینەکە جیاکردۆتەوەو وادەزانن پێویستی پێی نی یە وە بۆچونی ئەوانەش کە ڕوویان کردۆتە دەسەڵات و پارەو شەڕو جەنگ و بەهیچ شێویەك بۆ خزمەتی دین و بەرپاکردنی دین بەکاری ناهێنن- بۆچوونی گومڕایان و قارلێنراوانە کەمەبەست لەگومڕایان (نەصارایەو) لەقارلێگراوانیش (یەهودە)!!. بەڵام لەم لاشەوە تاکە ڕێگەی ڕاست -ڕێگەی ئەوانەی کە خوا نیعمەتی بەسەردا ڕشتون لە پێغەمبەران و ڕاستان و شەهیدان و صالحان- تەنها و تەنها بریتیە لە ڕێگەی پێغەمبەری خواو(ﷺ)جێنشینە ئازیزەکانی‌و هاوەڵە دڵسۆزو بەڕێزەکانی‌و هەرکەسێکیش کە کاروان‌و ڕێگەی ئەوانی گرتبێتە بەرو بەدوای ئەوان کەوتبێ.

وە مسوڵمان لە لێپرسراویەتیەکەیدا لەسەری واجبە کە بەگوێرەی توانای خۆی تیچکۆشان بکات‌و خۆی ماندووبکات بۆیە هەرکەسێ ئەگەر ئیشوکاری *موسڵمانانی پێ سپێردراو ئەویش لەبەڕێوەبدرنیدا مەبەستی تەنها* گوێڕایەڵی خواو بەرپاکردنی دینەکەیی‌و وەگەڕخستنی بەرژەوەندی مسوڵمانان‌و ئەنجامدانی واجبات‌و وازهێنان لەقەدەغە کراوەکان بێت ئەوە ئەگەر لەهەندێ کاتدا توانای بەسەر هەندێ لەکاروبارەکاندا نەشکێ ئەوە لێی ناگیرێ‌و پێی تاوانبار ناکرێت وەبەڵگە نەویستیشە کەبەلێپرسراوکردنی چاك‌و پاکان بۆ ئوممەتی ئیسلام باشترە لە بەلێپرسراوکردنی فاجیران‌و

لادەران. وەئەركی سەرشانی هەموو موسڵمانێكە كەئەو پەڕی تێكۆشانبكات بۆئەوەی هەمیشە و هەردەم (ئاسن) لەخزمەتی (قورئان)دا بێتو بۆ ئەوە وەگەڕ بخرێت كەخوا دەیەوێتو دینەكەی خوای پێ بەڕێوەدەچێت، وە لەو ڕێگەیەشدا پشت بەپەروەردگاری جیهانیان ببەستن وەپێویستە ئاگاداربین كەدونیا دەبێت لەخزمەتی دیندا بێت نەك بەپێچەوانەوە!! هەروەك (معاذی كوڕەجبل (خوالێی ڕازی بێت-فەرموویەتی: (ئەی بەنی ئادەم تۆ لەم دونیایەدا پێویستت بەبەشی خۆت هەیە، بەڵام پێویستت بەبەشی ئاخیرەت زیاترە جائەگەر هاتوو لەسەرەتاوە دەستت بەوەدەست خستنی قیامەتكردوو ئالوودەی ئەو بووی ئەوە بەشە دونیاییەكەشت وەدەست دەخەیت، بەڵام ئەگەر لە وەدەست خستنی بەشی دونیاییەوە دەستپێكردو ئالوودەی ئەویان بووی ئەوە بەشی قیامەتت لەدەست دەردەچێو لەدونیاشدا هەمیشە لەمەترسیدای) بەڵگەی ئەمەش ئەو فەرموودەیەیە كە ئیمامی ترمذی بۆمان دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی: (من أصبح والأخرة أكبر همه جمع الله له شمله، وجعل غناه في قلبه وأتته الدنيا وهي راغمة، ومن أصبح والدنيا أكبر همه فرق الله عليه شمله.. وجعل فقره بين عينيه ولم يأته من الدنيا إلا ما كتب له) رواه أحمد. واتە: (هەركەس وای لێ هات كە قیامەتو خوا لەخۆ ڕازیكردن بوویە گەورەترین خولیای، ئەوە خوا هەموو ئیشوكارەكانی بۆ كۆدەكاتەوەو شپرزەی ناكات، وەدەوڵەمەندیەكەی بۆدەخاتە ناو دڵیەوەو هەردەم بەدوونیا بەزەبوونیەوە دێتە بەردەستی، بەڵام بەپێچەوانەوە: هەركەسێ دونیاداری بوو بەگەورەترین ئاواتی ئەوە ئیتر خوا ئیشوكارەكانی بۆ شپرزە دەكاتو هەژاریەكەی بۆ دەخاتە نێو چاوانیەوەو لە دونیادا تەنها ئەوەنەبێت كەبۆی نوسراوە هیچی تری بۆنایەت!!؟

بنچینەی ئەم خاڵەگرنگەش لەم ئایەتە پیرۆزەدایە:(مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِي(٥٧)إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ) (الذاريات:٥٦-٥٨)

لەكۆتاييدا دەڵێم: ئەو پەڕی ڕێزو سلاوی خۆم ئاڕاستەی ئەو برا دڵسۆزو بەڕێزانەم دەكەم كەلەم پڕۆژە خێرەدا قۆڵگیریان كردم هەریەك بەجۆرێك وەداواكارم كە خوای گەورە چاكترین پاداشتیان بداتەوە بەتايبەت بەڕێزو خۆشەویستم جەنابی مامۆستا علی باپیر كەبەڕاستی وێڕای سەرقاڵیو مەشغەڵەتی بەكاری ئیسلامیەوە ئەركی پێداچوونەوەو (تەحقیق)و پاشان پێشەكی بۆ نوسینی ئەم كتێبەی گرتە ئەستۆ داواكارم خوای گەورە فەڕو بەرەكەت بهاوێتە تەمەنیەوەو سەربەرزی دونیاو دواڕۆژی بكات.

امین.







## شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییەی حەڕانی دەفەرموێت:

بونی براگەوەرو سەرپەرشتی ئیشوکاری موسڵمانان لەگەورەترینی واجباتی ئەم ئیسلامە پیرۆزەیە بەڵکو بە بێ بوونی ئەو براگەورەیەتییە نە دین بەڕێوە دەچێ و نە دونیاش!!. چونکە مرۆڤەکان بەگشتی هەندێکیان پێویستیان بە پشتگیری هەندێکی تریان هەیە جا ئەو پێویستی و بەرژەوەندیانە کاتێك بۆیان دەستەبەر دەبێ و تۆکمە دەبێ کە کۆبن و جەماعەیان هەبێت وە ئەگەر جەماعەش هەبوو ئەوە پێویستە سەرکردەیەك هەبێت چونکە جەماعە بەبێ سەرکردە نابێت، تەنانەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێت: (إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدهم ( رواه أبو داود) واتە: ئەگەر سێ موسڵمان بۆ سەفەرێك دەرچوون ئەوە بایەکێکیان بکەنە لێپرساو، وە ئیمامی (احمد) -خوا لێی خۆش بێت- لە موسەنەدەکەیدا لە (عبدالله ی کوڕی عومەرەوە) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت: (لا يحل لثلاثة يكونون بفلاة من الأرض إلا أمروا عليهم أحدهم) واتە: بۆ سێ موسڵمان حەڵاڵ نیە کە لە دەشتێکدا بن مەگەر یەکێکیان بکەنە بەرپرسی خۆیان.

لێرەدا پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم) لە سەفەرێکدا کە لە ناکاو دێتە پێشەوە و کۆبونەوەیەکی بچکۆلەیە واجبی کردووە کە هەردەبێ یەکێك بکرێتە بەرپرس بۆئەوەی موسڵمانان دەرسی لێ وەربگرن و ئاگادارکردنەوەیەکیش بێت کە تێکڕای کۆبونەوەکانی تر حەوت جار حەوت جار پێویستی بەسەرکردە دەکات.





چاپەمەنی سیما

ژمارە سپاردنی ( ٣٢٧ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٣ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە